# هەواڵ، راپۆرت و وتووێژ

وەرگێڕانی

**مەنسور سدقی**

هەولێر - ٢٠٠٨

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **هەواڵ، راپۆرت و وتووێژ**
- وەرگێڕانی: مەنسور سدقی
- نەخشەسازی ناوەوە: طــە حسین
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (١٦٢٩)
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٢٨٤)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆک

# پێشەکیی وەرگێڕ

به لەپێشچاوگرتنی کاردانەوەی بەربڵاوی شێوازە تازەکانی راگەیاندن کە ڕۆژبەڕۆژ خۆی لە تۆڕەکانی ئەنترنێت و کەناڵە تەلەفزیۆنییە ئاسمانییەکان و... بەسەر ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییدا دەچەسپێنێت و هاوکات لەگەڵ بەردەوام بوونی شێوازەکانی راگەیاندنی پێشوو وەک رۆژنامە، گۆڤار، ئەرکی خۆپەروەراندن و پێشخستنی زانستە پەیوەندیدارەکان بەو گەشەسەندنە بەرفراوان و بەربڵاوە بۆ هەر رۆژنامەوانێک لەم سەردەمەدا حاشا لێنەکراوە.

هەواڵ، گوزارش، وتوویژ وەک سێ لایەنی هەرە سەرەکی لە کاری رۆژنامەوانیدا و وەک بنچینەی تێکۆشانی رۆژانەی ئامرازە گشتییەکانی پێوەندی لە جیهانی میدیایی سەردەمانەدا، گرنگی تایبەت وەدەست دێنێت و بۆ ناوەرۆکدار کردنیان پێویستیان بە پێناسە و هێنانە ئارای لایەنی تازەتر دەبێت.

ئەمڕۆکە دەقی هەواڵێک، بابەتی گوزارشێک و رەوتی وتوویژێک لەچاو وێنەکانیان، بۆ وێنە لە دەساڵی رابردوودا، وەها گۆڕانی بەسەردا هاتووە کە رۆژنامەوان بەبێ ئاگاداری لە بنچینەکانی زانستی ئەو گۆڕانە و هۆکارەکانی، ناتوانێت سەردەمیانە درێژە بەکاری خۆی بدات.

هەروەها پەرەگرتنی بەربڵاوی ماڵپەڕی ئەنتەرنێت وایکردووە کە هەرکەسێک بتوانێت زۆر بە ساکاری و بە کەمترین دەرماڵە، ببێتە خاوەنی "رۆژنامە" و "گۆڤار"ی تاکەکەسی لە هەموو بوارەکاندا بەڵام هەڵسوڕاندن و رێکوپێککردنی سەردەمانە و پسپۆڕانەی ئەو ماڵپەڕانە لەباری ناوەرۆکەوە و



لەپێشچاوگرتنی چوارچێوە پسپۆڕییەکان بۆ داڕشتنی هەواڵەکان و نووسینی گوزارش و ئەنجامدانی وتوویژ کاری هەمووکەس نییە.

به لەپێشچاوگرتنی ئەو تێبینییانە و بە مەبەستی کۆکردنەوەی سەرەتاییترین پێداویستییەکانی کاری رۆژانەی رۆژنامەوانی لە بواری هەواڵ، گوزارش وتوویژدا، ئەو پەرتووکە دەکەوێتە بەردەستی رۆژنامەوانانی لاوی کوردستان و ئۆگرانی کاری هەواڵنێری سەردەمانە و ئازاد.

بابەتەکان، وەرگێڕانێکی ئازادە لە زمانی فارسییەوە. لەم وەرگێڕانەدا بە پێی توانا تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردی لەپێشچاو گیراوە و زۆربەی نموونە ئاماژەپێکراوەکان لەلایەن وەرگێڕەوە ئامادەکراون. ماڵپەڕی http://www.journalist.ir سەرچاوەی بابەتەکانە کە لە لایەن هێندیک رۆژنامەنووسی لاوی ئێرانی نووسراون و کۆکراوە و کورتکراوەی کتێب و وانەکانی ناوەندەکانی پەروەردە و زانستگاکانی رۆژنامەوانین لە ئێراندا.

مەنسور سدقی/ ئەڵمانیا
٢٠٠٧\٥\٢٠

## بنەما نێونەتەوەییەکانی ئەخلاقی پیشەیی لە ڕۆژنامەوانیدا

International Principles of Professional ethnics in Journalism

لە ئاکامی چەند دانیشتنێکی راوێژکارانە (لە ساڵانی ١٩٧٨ تا ١٩٨٣دا) بەبەشداریکردنی هێندێک لە ڕێکخراوە ڕۆژنامەوانییە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکان، بنەما نێونەتەوەییەکانی ئەخلاقی پیشەیی لە ڕۆژنامەوانیدا، ئامادە و پەسەند کرا.

ئەو ڕێکخراوانە لە ئامادەکردنی ئەو بەڵگەنامەیەدا، بەشدار بوون:

- ڕێکخراوی نێونەتەوەیی ڕۆژنامەوانان (IOJ)
- فیدراسیونی نێونەتەوەیی ڕۆژنامەوانان (IFJ)
- یەکێتی کاتولیکی نێونەتەوەیی چاپەمەنییەکان (UCIP)
- فیدڕاسیۆنی ڕۆژنامەوانانی ئەمەریکای لاتین (FELAP)
- فیدڕاسیۆنی کرێکارانی چاپەمەنییەکانی ئەمەریکای لاتین(FELATRAP)
- فیدڕاسیۆنی ڕۆژنامەوانانی عەرەب (FAJ)
- یەکێتی ڕۆژنامەوانانی ئەفریقا (UAJ)
- کۆنفدراسیۆنی ڕۆژنامەوانانی ئاسیا (CAJ)

لە دانیشتنی کۆتاییدا کە لە ٢٠ی نۆڤیمبەری ساڵی ١٩٨٣ لە شاری پاریس پێکهات، فیدراسیونی نێونەتەوەیی ڕۆژنامەوانان بەشداری نەکرد.

بنەما نێونەتەوەییەکانی ئەخلاقی پیشەیی لە ڕۆژنامەوانیدا، کە وەک ژێرخانێکە بۆ ئامادەکردنی یاساورێسا ئەخلاقییەکان لە ئاست نەتەوەیی و ناوچەییدا، بریتییە لە:



**بڕگەی یەکەم: مافی خەڵک بۆ وەدەستهێنانی زانیاری و لێکۆڵینەوەکان**

کۆمەڵ و تاکەکان مافیان هەیە لە ڕێگای زانیاری ورد و هەمەلایەنەوە، وێنایەکی ئۆبژکتیڤ لە ڕاستییەکان وەدەستبێنن و بیروڕای خۆیان بەشێوەیەکی ئازاد لەڕێگای میدیا کەلتووری و پەیوەندیی سازکەرە جۆربەجۆرەکان، بڵاوبکەنەوە.

**بڕگەی دووەم: ڕۆژنامەوان لە خزمەت ڕاستی ئۆبژکتیڤدایە**

ئەرکی هەرە سەرەکی ڕۆژنامەوان ئەوەیە کە بە خزمەتکردنی شیاو و لێهاتووانە لە ئاست ڕاستییە ئۆبژکتیڤەکاندا، لەپێناو مافی خەڵک بۆ وەدەستهێنانی زانیارییە ڕاست و دورستەکان هەڵسووڕێت و پانتایی ڕاستەقینەی ڕووداوەکان، بەدڵپاکییەوە، بەهەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکە سەرەکییەکانی، بێ شێواندن و بەپاڵپشتی توانای داهێنەرانەی خۆی، ڕاگوێزێت و ئەوەندە بابەت و تەوەر بۆ خەڵک ئامادە بکات کە ئەوان بەکەڵکوەرگرتن لێیان، بتوانن وێنایەکی هەمەلایەنە و ڕوون لە جیهان وەدەستبێنن، تا سەرچاوە و ناوەڕۆک و بنەمای ڕووداوەکان، هەروەها چۆنیەتی کێشە و پرۆسەکانی ئەو جیهانە، بەشێوەیەکی هەرە ئۆبژکتیڤ و گونجاو، دەرک بکات.

**بڕگەی سێیەم: بەرپرسایەتی ڕۆژنامەوان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە**

لە ڕۆژنامەوانیدا، زانیاری کاڵا نییە، بەڵکو "هەواڵێکی کۆمەڵایەتی"یە، واتە ڕۆژنامەوان بەشدارە لە بەرپرسایەتی گواستنەوەی زانیاری. کەوابوو، نەتەنیا لەبەرامبەر هەڵسووڕێنەرانی میدیاکاندا، بەڵکو لەپلەی یەکەمدا، پێویستە لەبەرامبەر خەڵکدا کە بە گشتی بریتیین لە گەلێک بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی، بەرپرس و وەڵامدەرەوە بێت. بەرپرسایەتی کۆمەڵایەتی، ڕۆژنامەوان ملکەچ دەکات تا لە هەر هەلومەرجێکدا، بەگوێرەی ویژدانی ئەخلاقی خۆی، هەڵسوکەوت بکات.

**بڕگەی چوارەم: شەرافەتی پیشەیی ڕۆژنامەوان**

بەگوێرەی ئەو نەخشە کۆمەڵایەتییەی کە ڕۆژنامەوان هەیەتی، پێویستە پێوانە بەرزەکانی شەرافەتی پیشەیی ڕۆژنامەوان پارێزراو بێت کە بریتییە لە مافی ڕۆژنامەوان بۆ خۆپاراستن لە کردەوەی بەپێچەوانەی بیروباوەڕەکانی،

مافی ئاشکرا نەکردنی سەرچاوەی زانیارییەکانی و هەروەها مافی بەشداریکردن لە بڕیاردان لەو میدیایەی کاری تێدا دەکات. شەرافەتی پیشەیی بە هیچ شێوەیەک ڕێگا بە ڕۆژنامەوان نادات بەرتیل وەربگرێت، یان بەپێچەوانەی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی، بەرزکەرەوەی بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆی بێت. هەروەها، ڕێزگرتن لە سەروەتوسامانە مەعنەوییەکان، بەتایبەت دوورەپەرێزی لە دزی بەرهەمە ئەدەبییەکان، بە بەشێک لە ئەخلاقی پیشەیی دەژمێردرێت.

**برگەی پێنجەم: دەستپێڕاگەیشتنی گشتی و هاوکاری**

بەگوێرەی بنەمای پیشەی ڕۆژنامەوانی، پێویستە ڕۆژنامەوان، ڕادەی دەستپێڕاگەیشتنی گشتی بە زانیارییەکان و ئاستی بەشداری خەڵک لە میدیاکاندا کە بریتییە لە مافی بەرپەرچدانەوە یان ڕاستکردنەوە و مافی وەڵامدانەوە، بەرزتر بکاتەوە.

**برگەی شەشەم: ڕێزگرتن لە سنووری کەسایەتی و پلەوپایەی مرۆڤایەتی**

ڕێزگرتن لە مافی تاک، پاراستنی سنووری تاکەکەسی و نهێنییەکانی و پلەوپایەی مرۆڤایەتی کە هەماهەنگی هەیە لەگەڵ یاسا نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکانی پێوەندار بە پاراستنی ماف و کەسایەتی تاک، بوختان و قسەی هەڵبەستراو و شێواندنی پێناسەی تاکەکان، بەشێکی جیانەکراوەی پێوانەکانی پیشەی ڕۆژنامەوانی پێکدێنێت.

**برگەی حەفتەم: ڕێزگرتن لە بەرژەوەندییە گشتییەکان**

پێوانە پیشەییەکانی ڕۆژنامەوانی پێدادەگرێت لەسەر ڕێزگرتنی تایبەتی لە کۆمەڵگای نەتەوەیی، بنکە و نیهادە دیمۆکراتیکەکان و ئەخلاقە باوە گشتییەکان.

**برگەی هەشتەم: ڕێزگرتن لە بەها جیهانییەکان و هەمەجۆریی کولتوورەکان**

ڕۆژنامەوانێکی ڕاستەقینە، لەگەڵ ڕێزگرتن لە کەسایەتی تایبەتی تاکەکان، بەها و پلەوپایەی کولتوورەکان و مافی هەڵبژاردن و گەشەکردنی ئازادانەی کولتووری، ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی خەڵک، هاوکات پشتگیری لە بەها گشتییەکانی مرۆڤایەتی و لەسەرەوەی هەموویان، لایەنگری لە ئاشتی و



دیمۆکراسی، مافی مرۆڤ، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئازادی نەتەوەیی دەکات. کەوابوو، ڕۆژنامەوان بەشێوەیەکی چالاک بەشداری دەکات لە گۆڕانی کۆمەڵگا بە کۆمەڵگایەکی دیمۆکراتیک و لە ڕێگای دانوستان و گفتوگۆوە یارمەتیدەرە بۆ پێکهاتنی ناوەندێکی پڕ لە متمانە لە پێوەندییە نێونەتەوەییەکاندا، تا ئاشتی و دادپەروەری، کەمکردنەوەی گرژی و ئاڵۆزی، وەلانانی چەک و گەشەسەندنی نەتەوەیی لە سەرتاسەری جیهاندا وەدی بێت. ئاگاداربوونی ڕۆژنامەوان لە بڕیارەکانی کۆبوونەوە و پێکهاتنە نێونەتەوەییەکان، بەشێکە لە ئەخلاقی پیشەیی.

**برگەی نۆهەم: بنەبڕکردنی شەڕ و کارەساتەکانی تر بەرامبەر بە مرۆڤایەتی**

بەڵێنی ئەخلاقی لە ئاست بەها گشتییەکانی مرۆڤایەتی، ڕۆژنامەوان بە خۆپاراستن تین دەدات لە هەر چەشنە لایەنگری یان ورووژاندنی شەڕی دەستدرێژکارانە و کێبەرکێی خۆچەکدارکردن بەتایبەت چەکی ناووەکی، خۆپاراستن لە پاساو هێنانەوە بۆ هەموو شێوازەکانی توندوتیژی، جیاوازی وجودایی بەتایبەت ڕەگەزپەرستی و ئاپارتاید، سەرکوتکەری ڕژێمە پاوانخواز و ئیستعماری و ئیستعمارییە نوێیەکان، هەروەها دژایەتیکردن لەگەڵ کارەساتە مەزنەکانیتر کە بەسەر مرۆڤایەتی دادێن وەک: نەداری، برسیەتی و ئازار و نەخۆشییەکان. ئەو هەڵسوکەوتە لە لایەن ڕۆژنامەوانەوە دەبێتە هۆی یارمەتیدان بۆ بنەبڕکردنی نەزانی و لەناوبردنی تێنەگەیشتنی مرۆڤەکان لێکتر و دانیشتوانی وڵاتەکەی بەرامبەر بە پێداویستی و ئارەزووەکانی کەسانیتر هەستیار دەکات، و ڕێزگرتن لە ماف و دابونەریتی نەتەوەکانیتر، خەڵک و تاکەکان بەبێ‌ڕەچاوگرتنی ڕەگەز، نەتەوە، باوەڕە ئایینی و فەلسەفییەکان، دابین دەکات.

**برگەی دەیەم: گەشەدان بە نەریتی نوێی هەواڵنێری و پەیوەندییەکان لە جیهاندا**

ڕۆژنامەوان لەو سەردەمە نوێیەدا، لە چوارچێوەی بزوتنەوەیەک بە ئاراستەی دامەزراندنی پێوەندییە نوێیە نێونەتەوەییەکان بەگشتیی، و لە چوارچێوەی نەریتێکی نوێی هەواڵنێریدا بەتایبەتیی، دەسووڕێتەوە. ئامانجی ئەو نەریتە نوێیە کە بە بەشێکی جیانەکراوە لە نەریتی نوێی ئابووری نێونەتەوەیی دەژمێردرێت، سڕینەوەی ئیستعمار و دیمۆکراتیککردنی

هەواڵنێری و پێوەندییەکان لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدایە. بەڵێنی تایبەتی رۆژنامەوان لەو گۆڕەپانەدا بریتییە لە گەشەپێدان بە رەوتی دیمۆکراتیککردنی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان لە ئاستی هەواڵنێریدا، کە بەرەچاوکردنی پاراستن و گەشەپێدان بە پەیوەندییە دۆستانە و ئاشتیخوازانەی خەڵک و دەوڵەتەکان، دابین دەکرێت.

پاریس، ٢٠ نۆڤێمبەری ١٩٨٣

# هەواڵ و کاردانەوەی پێکهێنەرەکانی لەسەر هەواڵ

پێناسەی جۆراوجۆر بۆ هەواڵ کراوان وەک:

- هەواڵ گوزارشێکە لە راستییەکان، بەڵام هەموو راستییەک هەواڵ نییە.
- هەواڵ ئەگەرێکە و لەوانەیە راست یان درۆ بێت.
- هەواڵ بابەتێکە کە دەیهەوێت نهێنی بمێنێتەوە، بابەتەکانیتر تەنیا ئاگادارین!
- زانیاری پێوەندار بە هەر رووداوێک، بە "هەواڵ" ناوبێژ دەکرێت.
- هەواڵ گێرانەوەی سادە و بێخەشی رووداوەکانە.
- و .....

هەندێک کەس بنەمای وشەی "هەواڵ" NEWS بە مانای "تازەکان" لێکدەدەنەوە و هێندیکیتر پێیان وایە کورتکراوەی وشەکانی: North باکوور، East رۆژهەڵات، West رۆژئاوا و South باشووره و مانای رووداوەکانی چوارگۆشەی جیهان دەدات. لە نێوان پێناسە جۆربەجۆرەکانی هەواڵ کە هەرکامیان لە سەر یەک یان چەند بەهای سەرەکی هەواڵ پێدادەگرن، ئەو پیواژەی خواروو لە گشتیان تازەتر و تەواوترە بۆ هەواڵ:

هەواڵ گوزارشێکی راستە لە رووداوێکی ئوبژێکتیڤ کە بریتییە لە یەک یان چەند "بایەخی هەواڵی" و شێوەی دارشتن و راگەیاندنی، پێوەندی بە لایەنە دەرەکی و ناوەکییەکانی رێکخراوەیی هەیە.



بە پێی ئەو پێناسەیە:

- رووداوەکانی جیهانی دەرەوە راست و ئوبژێکتیڤن، خەیاڵاوی نین.
- رووداوی راگەیەندراو دەبێت هێندیک "بایەخی هەواڵی" لەخۆ بگرێت.
- هێندێک لایەن کاردانەوەیان هەیە لە سەر هەڵبژاردن و راگەیاندنی هەواڵ.
- هیچ کاتێک هەواڵی رووداوێک، عەینیەتێکی رەها نییە و ئەو هەواڵەی رادەگەیەندرێت تەنیا وێنەیەکە لە راستی.

### پێکهێنەری هەواڵ

ناوەرۆکی رووداوێکی هەواڵی، ئوبژێکتیڤ، سەقامگیر و نەگۆڕە، بەڵام ئەو بابەتەی بە ناوی هەواڵ بڵاو دەبێتەوە، لە ژێر کاردانەوەی هێندێک هۆکار، بە شێوەیەک گۆڕانی بەسەردا دێت کە راستی وەک راستەقینەیەکی رێژەیی رادەگەیەنێت. واتە دەتوانین بڵێین، هەواڵ عەینیەتی رەهای تێدا نییە.

پێکهێنەری هەواڵ لە ژێر کاردانەوەی دوو هۆکاری سەرەکیدایە:

- هۆکارە ناوەکییەکانی رێکخراوەیی،
- هۆکارە دەرەکییەکانی رێکخراوەیی.

### ١- هۆکارە ناوەکییەکانی رێکخراوەیی:

أ- هەواڵنێر: بیروبۆچوون، لایەنگری و هەڵوێستی هەواڵنێر هۆکارێکە لە پێکهێنانی هەواڵدا. واتە، هەواڵنێر دەبێت راستگۆ بێت و بەلانیکەم پێش بە کاردانەوەی زەینی خۆی بگرێت لە سەر هەواڵدا.

ب- بەرپرسانی دەزگاکانی هەواڵنیری لە رێگای داسەپاندنی سیاسەتی راگەیاندن و پێکهێنانی بەشی راگەیاندن لەو دەزگایانەدا و پشتبەستن بە بەها کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان و...، رۆڵێکی بەرچاویان هەیە لە پێکهێنانی هەواڵدا.

پ- هۆکارە ئامرازییەکان، وەک رازاندنەوە و قەوارەی لاپەرەکان لە رۆژنامەکاندا، کات و کاتژمێری بڵاوکردنەوە، لە رادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا.

### ٢- هۆکارە دەرەکییە رێکخراوەییەکان:

أ- دەوڵەتەکان لە رێگای داسەپاندنی چوارچێوە تەنگکەرەکانی یاسایی.

ب- خاوەن سەرمایە و ئاگادارییە بازرگانییەکان.

پ- گرووپە دەسەڵاتدارەکان و گوشاردانەرەکان.

ت- سەرچاوەکانی هەواڵنێر، وەک ناوەندە گشتییەکانی دەزگاکان و ئاژانسەکانی هەواڵنێری.

ج- کەسانێک کە هەواڵەکان روبەڕویان دەبێتەوە.

سەرەڕای هەمو ئەوانە، رۆژنامەنووس دەبێت کۆشش بکات کاردانەوەی ئەو هۆکارانە کەم بکاتەوە و بەلانیکەم رووداوەکان بەهەمان شێوە کە روویان داوە، گوزارش بکات.

## هەواڵ بە پێناسەی مەکتەبی "گلاسگۆ"

گرووپی میدیای زانکۆی گلاسگۆ لە ئینگلتەرا Glasgow (G U M G) University Media Group کە لە دەستەیەک مامۆستایانی ئەو زانکۆیە پێکهاتووە، بە لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر "هەواڵ"، سەرنجێکی زۆریان بۆ لای خۆیان راکێشاوە. زۆر روونە کە ئەو دەسکەوتانەش لەگەڵ شەپۆلی دژایەتی ئەو خاوەن میدیایانە کە ئەو دەستەیە لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر کردووە، رووبەڕوو بۆتەوە. جا بزانین مەکتەبی گلاسگۆ پێناسەی بۆ "هەواڵ" چییە و چۆن بەم ئاکامە گەیشتووە؟

ئەو گرووپە لێکۆڵەرە کە بە پشتیوانی "ئەنجومەنی لێکۆڵینەوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی ئینگلتەرا" پێکهاتووە، تا ساڵی ١٩٨٢ سێ کتێبی گرانبەهای سەبارەت بە لێکۆڵینەوەکەی خۆی بڵاو کردەوە. یەکەم کتێب بە ناوی "هەواڵە خراپەکان" (Bad news, UK Routlege & Kegan paul. 1979) کەوتە بەردەست خوێنەران. هەشت نووسەری ئەو کتێبە رایانگەیاند کە ئەو هەڵسەنگاندنەی پێی وایە: "میدیا دیدارییەکان (TV) ئۆبژکتیڤترن لە میدیا نووسراوەکان رووداوەکان بڵاو دەکەنەوە" بە هەڵە و ناراستی دەزانن. ئەوان دەڵێن لێکۆڵینەوەکانیان وا دەردەخات کە ئەو باوەڕە باوەی دەڵێت: "پێشاندان، روودانی رووداوە بە هەمان شێوە کە روودەدات"، هەڵسەنگاندنێکی بێ بنەمایە.



یەکێک لە گرنگترین ئاماژەکانی "هەواڵە خراپەکان" کە "گرووپی گلاسگۆ" بۆ پێگەیشتنی تەواوی هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی ئینگلتەرا لە ماوەی ٦ مانگدا (لە مانگی ١ تا مانگی ٦ ساڵی ١٩٧٥) تۆماریان کرد و بەسەریدا چوونەوە، ئەوە بوو کە، هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی ئینگلتەرا بە تەواوی دژی سەندیکا کرێکارییەکان و جموجۆڵە رێکخراوییەکانە. سەرەڕای ئەوەش، هەواڵەکان لەجیاتی لێکۆڵینەوەی هۆی رووداوەکان، بەقووڵی سەرنج دەدەنە ئاکامی رووداوەکان.

"هەواڵە چەوتەکان" ئەو بیروباوەڕە باوە پسپۆڕانەیەی کە باوەڕی بە "بێلایەنی راگەیاندن"ی، خستە ژێر شک و گومانەوە.

پاشان "گرووپی گلاسگۆ" بەرهەمەکانی تری خۆی بەم شێوەیە بڵاوکردەوە:

"دیسان هەواڵە چەوتەکان" (More bad news) کە لە ساڵی ١٩٨٠دا، لە لایەن هەمان بنکەوە لەچاپدرا. دوو ساڵ دواتر "بەراستی هەواڵی خراپ" (Really bad news) لە لایەن بنکەی Writers & Readersی ئینگلتەراوە کەوتە بازاڕەوە.

"گرووپی گلاسگۆ" بەردەوام بوو لە سەر لێکۆڵینەوەکانی خۆی و پاش سێ ساڵ (١٩٨٥)، بەرهەمێکی‌تری بڵاو کردەوە بە ناوی "هەواڵەکانی شەڕ و ئاشتی" (War and peace News) کە سەرنجێکی زۆری بۆ لای خۆی راکێشا. لەم کتێبە کە لە لایەن بنکەی Open University Press بڵاو کرایەوە، بابەتەکانی وەک: هەواڵەکانی شەڕی فاڵکلەند، مانگرتنی کرێکارانی کانەکانی ئینگلتەراوە و شێوەی دارشتن و بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی ئیرلەندای باکووری، خستە ژێر لێکۆڵینەوە.

ئەندامانی "گرووپی گلاسگۆ" بەردەوام بوون لەسەر لێکۆڵینەوە و پشکنینی شێوەی دارشتنی هەواڵەکان و کتێبێکی نوێیان بە ناوی "وەدەستهێنانی پەیام، هەواڵەکان، راستی و دەسەڵات" (Getting the Message, News, Truth and Power) ئامادە کرد کە لە ساڵی ١٩٩٣ لە لایەن بنکەی Routledgeی بەریتانییەوە. وەک بەرهەمێکی تازەی رۆژنامەگەری ناسرا.

ئێستا کە لە گەڵ کتێبەکانی گرووپی میدیای زانکۆی گلاسگۆ ئاشنا بوون، پێش ناساندن و لێکۆڵینەوەی بیروبۆچوونی ئەم مەکتەبە، پێویستە ئاماژە بە پێناسەیەک بکەین کە لە کتێبی "هەواڵە چەوتەکان"دا هاتووە تاباشتر بنەماو گەوهەری بۆچوونی ئەم گرووپە بزانن.

بەڕای "گرووپی گلاسگۆ": "هەواڵ دیاردەیەکی سروشتی نییە، بەڵکو بەرهەمێکی ساختەی ئایدولۆژیایە."

بیروڕای "گرووپی گلاسگۆ" سەبارەت بە شێوەی هەڵسوکەوتی میدیاکان لەگەڵ گوێگران و بینەران، تا رادەیەک وەک بۆچوونی مارشاڵ "مەک لۆهان"ی لێکۆڵەری کەنەداییە کە دەڵێت، میدیاکان لە رێگای ئاگادرییەکانیانەوە گوێگران و بینەرانی خۆیان دەشێلن. پەیامی میدیاکان بێ ورووژاندنی هەستی گوێگران و بینەران، دەخزێتە ناو زەینی ئەوان. "مەک لۆهان" ئەو پرۆسەیە بە شێوەیەکی ئاشکراتر باس دەکات: پەیامی میدیاکان وەک گۆشتێکی تەڕوتازەیە کە دزەکان بۆ هەڵخەڵەتاندنی سەگە پاسەوانەکان دەیهاوێژنە بەردەمیان. "مەک لۆهان" گوێگران و بینەرانی میدیاکان وەک پانتایی تکنۆلۆژیای راگەیاندن و تەنانەت بەشێکی سەرەکی و ناخی ئەو تەکنۆلۆژیا هەڵدەسەنگێنێت.

واتە دەتوانین بڵێین کە بۆچوونی "گرووپی گلاسگۆ" سەبارەت بە "پیشەسازی میدیا"، هەڵوێستێکی رەخنەگەرانەیە و گەشبینانە نییە. ئەو گرووپە بە پێچەوانەی باوەڕی رۆژنامەنووسان و بەرهەمهێنەرانی پرۆگرامی تەلەفزیۆنەکان کە گوایە: "بە خۆپاراستن لە کاردانەوەی هەڵوێستی تاکەکەسی و رێکخراوەیی، دەکارن بێلایەنی بەرهەمی میدیایی مسۆگەر بکەن"، دەڵێن: "چەمکی بێلایەنی تەنیا خەیاڵە و هەواڵەکان ئاوێنەی راستییەکان نین."

ئەندامانی "گرووپی گلاسگۆ" بە لێکۆڵینەوە لەسەر هەواڵە راگەیاندراوەکانی تەلەفزیۆنی ئینگلتەرا، گەیشتوونە ئەو ئاکامە کە شێوەی هەڵبژاردن و رێکوپێک کردن و راگەیاندنی رووداوەکان لە تەلەفزیۆن بەچەشنێکە کە سەرئەنجام لە خزمەت خاوەن دەسەڵاتەکاندا دەبێت. بۆ نموونە لە راگەیاندنی رووداوی گێرەوکێشەکانی کرێکارانی پیشەسازی ئینگلتەرادا، تەلەفزیۆنی ئەو



وڵاتە، بەردەوام کرێکارانی وەک هۆی سەرەکی رووداوەکاندا دادەناو، بەچەشنێک کە هەر کاتێک هەواڵیان بڵاوکراوەتەوە، هەمیشە وێنەی کرێکاران بەم شێوازەی خواروو پێشاندراوە:

- لە کاتی خۆپێشاندان،
- لە کاتی پێشگیری کردن لە کرێکاران بۆ چوونە ژووری ناو کارخانەکان،
- لە کاتی پێکهێنانی کۆبوونەوە.

ئەمانەش وا پێشاندەدات کە گۆیا کرێکاران وشیارانە خۆدەپارێزن لە باسکردنی هۆکارەکانی مانگرتن و پێش بە کارکردن دەگرن، بۆیە پێویستییان بە کۆبوونەوە هەیە.

بەڵام لە لایەکیترەوە، هەر کاتێک تەلەفزیۆنی ئینگلتەرا سەبارەت بە بەرپرسی ئەو کرێکارانە هەواڵی بڵاوکردۆتەوە، شێوازی راگەیاندنی بەچەشنێک بووە کە گۆیا بەرپرسەکان راستییەکان دەڵێن.

بە باسکردنی ئەو دوو بابەتە، واتە شێوازی بڵاوکردنەوەی هەواڵی کرێکاران و بەرپرسەکان، "گرووپی گلاسگۆ" دەڵێ: "ئەوە راستە کە راگەیاندنەکە ئاماژە بە هەر دوو لایەن دەکات و بەڕواڵەتیش بێلایەنی خۆی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان راگرتووە، بەڵام لەڕاستیدا، ئەوە کرێکارانن کە وەک سەرچاوەی نائارامی لە زەینی بینەراندا پێشاندەدرێن.

دیارە ئاماژەکانی "گرووپی گلاسگۆ" بەرەنگاریەکی زۆری هێنا ئاراوە، چونکە ئەو تێبینیانە کردەوەیەکی زانستیانەی بۆ داسەپاندنی بۆچوونە لەپێشداڕێژراوەکان ئاشکرا دەکرد. سەرەکیترین وەڵامی میدیاکان ئەوە بوو کە لە داڕشتنی هەواڵەکاندا هیچ فتنەکارییەک لەگۆڕێدا نییە و خێرایی رێکوپێک کردن و شێوازی کارکردن، سەرەکیترین رۆڵیان لە گۆڕانی رێژەیی رووداوەکاندا هەیە تاکو وەک هەواڵ دێتە بڵاوکردنەوە.

لە هەمان کاتدا، بڵاو بوونەوەی بیروباوەڕی "گرووپی گلاسگۆ" لایەنگرانێکی بۆ خۆی وەدەستهێنا. ساڵێک پاش بڵاوبوونەوەی "هەواڵە چەوتەکان"، واتە لە ساڵی ١٩٧٧دا، دوو لێکۆڵەر بە ناوی پاوول والتۆن

(Paul Walton)و هاوارد دایڤیس (Haward Davis) پەرتووکی "هەواڵە چەوتەکان"یان بۆ سەندیکا بازرگانییەکان نووسی و بە هەمان ئاکام گەیشتن کە: میدیاکان بەردەوام کرێکاران لە شوێنی نائارام و قەرەباڵغ و کاتی پێشگرتن لە هاتووچۆ بۆناو کارخانەکان یان لەسەر شەقامەکاندا پێشاندەدات. بەڵام کە کامێراکان دەچن بۆ لای خاوەن کارەکان، ئەوان لە ژوورەکانی خۆیانەوە قسە بۆ کامیراکان دەکەن نەک لەسەر شەقام تا لە ناوەندێکی ئارام و لە روانگەیەکی بەرزەوە هەلومەرجەکە هەڵسەنگێنن. هاوکات مەودا نادەن بە کرێکاران بۆ ئامادە بوون لە ستۆدیۆکان نەوەک بایەخیان پێ بدرێ و بەفەرمی پێشکەشبکرێن.

فرێد ئینگلتەرایش (Fred Inglis) لە پەرتووکی "پێشەکییەک لەسەر تیۆری میدیاکان" (Media Theory, An Introuduction) هەر بەم شێوەیە بیردەکاتەوە. ئەو بە پشتگیری لە "گرووپی گلاسگۆ"، دەڵێ: " ئەو بابەتانەی لە تەلەفزیۆنی BBC و تۆڕی تەلەفزیۆنە بازرگانییەکانی ئینگلتەرا بڵاو دەکرێنەوە بەبێ لەپێشچاوگرتنی بیروڕای سیاسی بێژەر و وتووێژکەر دەخرێنە روو و بەتەواوی بیروڕای فەرمانبەرە دەسەڵاتدارەکانی ئەو دەزگایانەیە و تەنانەت رادەی گرنگیدان بە هەواڵەکانیش هاوتایە لەگەڵ سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی ئینگلتەرا.

فرێد ئینگلتەرا بە ئاماژەدان بە ئامۆژگارییەکانی "گرووپی گلاسگۆ" سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی مانگرتنی کرێکارانی کانەکانی ئینگلتەرا، دەپرسێت: بۆچی کامێرای تەلەفزیۆن لەناو پۆلیسەوە وێنە هەڵدەگرێ؟ بۆئەوە نییە تا بە شێوازێکی هەستپێنەکراو بینەران رووبەرووی هێرشی کرێکاران بکەنەوە تا ئەو بەردانەی ئەوان دەیهاوێژن ببینن، بەڵام باتونی پۆلیسەکان بۆ سەر جەستەی کرێکاران تەماشا نەکەن؟ بە بۆچوونی فرێد ئینگلتەرا، ئەو کردەوانە پێشلکردنی ئاشکرای بێلایەنی راگەیاندنە کە لە دەستووری کاری ئاژانسە هەواڵنیریەکاندا ئاماژەی پێکراوە.

بەڕای "دەیڤید بارات"، "گرووپی میدیای گلاسگۆ" سەلماندیان کە میدیاکان بەکەڵک وەرگرتن لە شێوازی "بەرجەستەکاری" (Agenda setting)، ئاراستەی



پرۆگرامەکانی بیروڕا دەربڕین بەشێوەیەک کە خۆیان ئارەزوو دەکەن هەڵدەسوڕێنن و مانگرتنەکان (بەتایبەت لە بەریتانیا) وەک هەڕەشە لە دژی بەرژەوەندی نەتەوەیی پێشاندەدەن و لە ئاکامدا راگەیاندنی هەواڵەکان بەکردەوە رەنگدانەوەیەکە لە بەرژەوەندی تاقمە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگا. "بارات" ئاماژە بە وتەیەکی "جۆرج گێربنێر" دەکات ("گرووپی گلاسگۆ"ش ئاماژەی پێداوە) و دەڵێت: ئامرازەکانی راگەیاندنی گشتی، باڵی کولتووری شێوازی پیشەسازییە. هەر بۆیە هەواڵی رووداوەکانی پیشەسازی پڕە لە لایەنگری و بێلایەنی پێوە دیار نییە، چونکە ئەو هەواڵانە یەکەم، بە ئاراستەی بۆچوون و بەرژەوەندی خاوەن کارەکان و دووەم، بە پشتبەستن بە شێوازی راگەیاندنی "کێشمەکێش" ئامادە دەکرێن.

بەکورتی، بە پێی لێکۆڵینەوەکانی "گرووپی گلاسگۆ" و لایەنگرانیان و هەروەها تا رادەیەک پشتبەستن بە ئاکامی بەدواداچوونەکانی "ناوەندی لێکۆڵینەوە کولتووری هاوچەرخەکان" لە زانکۆی بیرمەنگام، پێناسەی هەواڵ لەم روانگەوە خاوەن گوزارەیەکی تایبەتی دەبێت کە لە بەشی "پێناسەکانی هەواڵ"دا تا رادەیەک ئاماژەمان پێکرد. بەڵام سەرەکیترین گۆزارەی "گرووپی گلاسگۆ" سەبارەت بە هەواڵ بریتیە لە:

- هەواڵ بەشێوازی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکرێت،
- ئەو رووداوانەی بڵاودەبنەوە، نیشانەی گرنگی سروشتی ئەوان نییە، بەڵکو بۆ هەڵبژاردن و بڵاوکردنەوەی هەواڵ، هێندێک پێوانەی دژوار رۆڵی سەرەکی دەگێڕن،
- هەواڵ پاش هەڵبژاردن (Selection) گۆڕانکاری (Transformation) بەسەردا دێت. هۆکارەکانی گۆڕانکاری بریتین لە:

• شێوازی ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە، جا چ بە نووسین یان بە دەنگ و رەنگ بێت،

• تایبەتمەندی قەوارەیی و تەکنیکی میدیاکان و شێوەی بەکارهێنانیان.

یەکێک لە نموونە بەرچاوەکانی گۆڕانی ڕووداوەکان کە "گرووپی گلاسگۆ" ئاماژەی پێدەکات ئەو هەواڵەیە: "زیادبوونی مووچە، هۆکاری دیاردەی هەڵاوسانە"

سەبارەت بە هەواڵە پیشەسازییەکان ئەو گونجاندن و داسەپاندنە ڕوودەدات و جیاوازیش نییە کە هەواڵە پیشەسازییەکە لەبارەی چی بێت، هەرچی بێت، میدیاکان لە زەینی گوێگر(یان بینەر) ئەوە دادەسەپێنن کە گۆیا "زیادبوونی مووچە، هۆکاری دیاردەی هەڵاوسانە". کەواتە لە ڕوانگەی "گرووپی گلاسگۆ"، هەواڵ "شێواز" و "دەربڕین"ە کە نە تەنیا ڕاستییەکانی کۆمەڵایەتی و ڕاستەقینەکان بێلایەنانە هەڵناسەنگێنێ، بەڵکو دەست لە "بنەمای کۆمەڵایەتی ڕاستیەکان"یش وەردەدات.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە بۆچوونی "جون هارتلی" بکەین سەبارەت بە هەواڵ. ئەویش کەم تا کورت هەمان ڕوانگەی "مەکتەبی گلاسگۆ"ی هەیە و دەڵێت: "هەواڵ بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی و ئایدیولۆژیایە لە چوارچێوەی تیۆری "نیشانە ناسی گشتی"دا. سەرنجڕاکێشە کە "گرووپی گلاسگۆ"ش لە کتێبی "دیسان هەواڵە چەوتەکان"دا سێ بەشیان بۆ بابەتی زمانناسی تەرخانکردووە.

- زۆربەی هەواڵەکان لایەنگری بەرچاویان پێوەدیارە، چونکە ئەو ناوەندانەی هەواڵەکان ئامادە و بڵاو دەکەنەوە، خاوەن جێگای کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسین. کەوابوو، هەمیشە هەواڵەکان لە ڕوانگەیەکی تایبەتییەوە ئامادە دەبن، بۆ نموونە: ئەو هەواڵانەی کە لە لاپەڕەی یەکەمی "دەیلی ئێکسپرس" یان "واشینگتۆن پۆست"دا بڵاو دەبێتەوە بەرابەری بێچەندوچوونیان نییە لەگەڵ ئەو ڕاستییانە و ئەو ڕووداوانەی کە لە جیهانی ئۆبژێکتیڤ یان لە ئەزموونی ڕاستەوخۆ و ڕۆژانەی ئێمەدا ڕوودەدەن و ناتوانین وەک ڕاپۆرتی وەفادارانەی ڕاستی ڕووداوەکان هەڵسەنگێنین. واتە دیسان باس لە هەڵبژاردنی ڕووداوەکان و گۆڕانی ڕووداوەکانی جیهانی ئۆبژێکتیڤ دێتە پێش کە بە دەربازبوونی شێوازی کاری و پسپۆڕی (ڕۆژنامەوانی) بەسەریاندا، دەبنە هەواڵی جیهانی میدیایی. هەڵبەت دەکرێ



ساکارانە وەڵام بدرێتەوە، وەک هێندێک دەڵێن: جیاوازی لە نێوان هەواڵ و ڕووداو، لە ئازادی چاپەمەنی سەرچاوە دەگرێ، هەر بەو هۆیەیە کە ڕووداوێک بە شێوازی جیاجیا لە میدیاکاندا بڵاو دەبێتەوە و ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر ڕووداوەکاندا دێن پێوەندی بە ڕوانگەی لەپێشداریێژراودا نییە. بەم شێوەیە ئەم کەسانە دژی ئەو بۆچوونە کە دەڵێت: هەواڵەکان بەرهەمی کۆتایی پرۆسەیەکی ئاڵۆزن کە شێوازی هەڵبژاردنیان پەیوەندی بە چەمکە ژێرخانە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە.

لە کۆتاییدا دەکارین ڕاوبۆچوونی "گرووپی گلاسگۆ" بەم شێوەیە دابڕێژین:

"هەواڵ دیاردەیەکی سروشتی هەڵقوڵاو نییە لە ڕووداوەکان، بەڵکۆ "بەرهەم"ێکە. ئەو بەرهەمە لە لایەن پیشەیەک بەرهەم دێت و لە ناو بنیاتی (ستراکچەر) ئابووری و بیروکراتیکی هەمان پیشە و لە پێوەندی لەگەڵ پیشەکانیتردا - و لەهەمووان گرینگتر، لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەت و ڕێکخراوە سیاسییەکاندا ئامادە دەبێت. واتە بە گشتی: هەواڵ پیشاندەر و سازکەری بەها سەپێندراوەکانە لە پانتاییەکی تایبەتی مێژووییدا.

# "لید" و جۆرەکانی

Lead = دەسپێکی هەواڵ

وشە بەراییەکانی هەر هەواڵێک گورزی کوشندەی هەواڵنێرن.

بۆ نووسینی هەواڵ دەبێت بەشی هەرەگرنگ، هەرە پڕتین و هەرە سەرنجڕاکێشی هەواڵ لە سەرەتای هەواڵدا بگونجێت بۆ زاڵبوون بە سەر بێمەیلی خوێنەر تاکو ئەو راکێشێت بۆ خوێندنەوەی.

یەکەم دێڕەکانی هەواڵ کە کورتەیەک لە ناوەرۆکی سەرەکی هەواڵی لەخۆ گرتبێت، بە "لید" ناو دەبردرێت.

لەڕاستیدا، لید ئامرازی وروژاندنی مەیلی خوێنەرە تا بە راکێشانی سەرنجی بۆ هەواڵەکە، ئەو وا لێبکات درێژەی هەواڵەکە بخوێنێتەوە.

پێناسەکانی لید:

بەگشتی، لید وەڵامی یەک یان چەند پرسێک لە پێکهاتە هەواڵییەکان- بەپێی گرنگییان لە رووداوەکەدا، دەداتەوە و هەڵگری ئەو تایبەتمەندیانەیە:

لید بریتییە لە ٢٠ تا ٣٠ وشە، لەوانەیە ٤٠ وشەش لەخۆبگرێت، بەڵام باشترە لە ٣٠ وشە پتر نەبێت. (لید لە راپۆرتە هەواڵەکاندا ٤٠ وشە لەخۆدەگرێت.)

لید دەبێت لەگەڵ قەبارەی هەواڵ هاوئاهەنگی هەبێت.

لە دووپات کردنەوەی وشە لە لید خۆبپارێزن.

لید نابێت ناروون و ئاڵۆز بێت.



لید نابێت ئاماژەی لاوەکی تێدا بێت.

لید ئەوپەڕی یەک یان دوو دێڕ بێت.

لید بە کات و شوێن دەست پێناکات، مەگەر گرنگی تایبەتی هەبێت.

لە بەکار هێنانی وشەی زمانی بیانی و نائاشنا لە لید دا خۆبپارێزن.

لە لید دا نابێت ناو و نازناو(لەقەب)ی کەسەکان بەیەکەوە بێت. (لە لید دا نابێت بنووسرێت: جۆرج بۆش، سەرۆک کۆماری ئەمریکا...، بەڵکو تەنیا کەڵک لەیەکێکیان وەربگرن.)

لە نێوان ناو و نازناودا، کامیان بەناوبانگتر بێت، لەم کەڵک وەربگرن.

لە هەواڵەکاندا لە دوو جۆر لید کەڵک وەرمەگرن:

**ئا) لیدی بێناوەرۆک،**

وەک: وەزیری دەرەوەی عێراق ئەمڕۆ لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا باسی بازرگانی جیهانی کرد.

لەم لیدەدا سەرەڕای هەڵبژاردنی پێکهاتە و بەها هەواڵییەکان، هیچ هەواڵێکی گرنگ بە خوێنەر نادات.

**ب) لیدی پڕناوەڕۆک:**

لەم جۆرە لیدەدا، بێجێ تەواوی پێکهاتە هەواڵییەکان ئاماژەی پێدەکرێت.

وەک: کاروان محەمەد، ئەو خوێندکارە تەمەن ١٦ساڵەی کە رۆژی پێشوو لە شەقامی ئازادی کەوتە ژێر پاسی ئیدارەی هاتوچۆ، گیانی لەدەست دا.

لەم لیدەدا ئاماژە بە تەواوی پێکهاتەکانی هەواڵەکە کراوەو ئیتر هیچ نەماوە بۆ درێژەی هەواڵەکە.

بەرجەستەکردنی پێکهاتەکان لە لیدا

لید پێویستە بە پشتبەستن بە یەکێک لەم شەش پێکهاتە هەواڵیانە، ئامادە و رێکبخرێت. واتە، یەک پێکهاتە بەرجەستەتر دەبێت لە پێکهاتەکانیتر.

١- لیدی "کێ": سەرۆکی ئێران رایگەیاند کە وڵاتەکەی هەرگیز بە رێبەرایەتی ئەمریکا لە هیچ کردەوەیەکی دژی تیرۆریستی بەشداری ناکات.

سەرۆکی ئێران: "کێ"

بەرجەستەکردنی پێکهاتەی "کێ" لە لید دا

٢- لیدی "کەی": سبەینێ سەدام لەسێدارە دەدرێت.

سبەینێ: "کەی"

تێبینی: لە بەرجەستەکردنی پێکهاتەی "کەی"، لید بە "ئەمڕۆ"، دوێنێ"، "سبەینێ" دەست پێناکات، مەگەر زۆر گرنگ و چارەساز بێت. وەک کاتی لەسێدارەدانی سەدام!، کاتی ڕاگەیاندنی ئاکامی هەڵبژاردنەکان و...

٣- لیدی "کوێ": بەغدا بوو بە ناوەندی وتووێژە سیاسییەکان بۆ چارەسەری قەیرانی ناوچەکە.

بەغدا: "کوێ"

٤- لیدی "چی": نەوتی زاخۆ تا سێ مانگیتر دەگاتە پاڵاوگەی کۆیە.

نەوت: "چی"

تێبینی: ئەم لیدە دەتوانێت بۆ "چ کردەوەیەک"یش بەکار بێت.

وەک: قیرتاوکردنی ڕێگای هەولێر - سلێمانی شەش مانگ دەخایەنێت.

٥- لیدی "بۆ چی": لافاو لە دهۆک خنکانی دەیان سەر مەڕومالاتی بەدواوەبوو.

لافاو: بۆ چی؟

٦- لیدی "چۆن": بە وتاری سەرۆکی پەرلەمان، ئەمڕۆ پیشەنگای نێونەتەوەیی هەولێر کرایەوە.

بە وتاری سەرۆکی پەرلەمان: چۆن

تێبینی: لە نووسینی لیددا دەبێت گرنگترین پێکهاتەی هەواڵ هەڵبژێردرێت و لە سەرەتادا بگونجێت. ئەو لیدەش بەناوی ئەو پێکهاتە ناوبژ دەکرێت. وەک لیدی کێ، چی، بۆچی، چۆن، کەی، کوێ.

جۆرەکانی لید

**١- لیدی گێڕانەوە:**

لەم لیدەدا وتە دەگێڕدرێتەوە و بەم سێ شێوەیەی خوارەوە دەنووسرێت:

ئا) گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ: ئەم لیدە لەم کاتانەی خوارەوەدا بەکار دێت:

وتەی کەسێک زۆر گرنگ بێت. لەم کاتەدا دەبێت وتەکان بەبێدەسکاری دەقی وشەکان بنووسرێت.



کاتێک بە گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ کەسایەتی و بیروبۆچوونی لایەنەکە پێشاندەدەین.

کاتێک هەواڵنێر مەبەستی گێڕانەوەی دەقی وتەی سەرچاوەی هەواڵەکەیە.

وەک: سەرکۆماری عێراق گوتی:«هیوادارم جەعفەری هەڵەکانی خۆی ڕاست کاتەوە.»

* لەم لیدەدا لە چوارچێوەی ڕاستکرنەوەی هەڵەی ڕێزمانی، دەتوانین بەمەرجی نەگۆڕانی مانای وتەکان، شوێنی هێندێک لە وشەکان بگۆڕین. دەنا دەبێت لە لیدی ناڕاستەوخۆ کەڵک وەربگرین.

ب) گێڕانەوەی ناڕاستەوخۆ: لەم لیدەدا، گێڕانەوەی وتە دەستکاری دەکرێت و جووت کەوانەی بچووک (« ») هەڵدەگیرێت بەڵام ناوەڕۆک نابێت گۆڕانکاری بەسەردا بێت.

وەک: سەرکۆمار گوتی بە وەگەڕخستنی سەرمایەتازەکان لە بەشی کارەبادا تا پێنج ساڵی داهاتوو، سێ وێستگەی کارەبا سازدەکرێن.

لەم لیدەدا لەجێگای "گوتی" دەتوانین لە "هەڕەشەی کرد"، "ڕەخنەی گرت"، "داوای کرد"، "ڕوونی کردەوە"، :ئاشکرای کرد"، "ئاماژەی کرد" و... بە پێی مانای هەریەک لە وشەکان، کەڵک وەربگرین.

پ) گێڕانەوە بە شێوەی بەرجەستەکاری: لەم لیدەدا بەشێکی بچووک لە وتەی گوتراو هەڵدەبژێرین، واتە دوو یان سێ وشە لەناو جووت کەوانەی بچووکدا بەرجەستە دەکەین.

وەک: وەزیری ئابووری ڕایگەیاند کە ئابووری وڵات بەرەو «گەشەسەندن و پێشڤەچوون» هەنگاو دەنێت.

**٢- لیدی هەڵسەنگاندن:**

لەم لیدەدا دوو هەواڵ بە گوێرەی یەکتر هەڵدەسەنگێنین.

وەک: لە کاتێکدا هەولێر بە پلەی گەرمای ٢٨ لەسەری سفر، یەکەم ڕۆژی پاییزی تێپەڕکرد، دووکان بە پلەی هەشت لەژێر سیفر زستانێکی زووی دەسپێکرد.

یان: ئاژەڵدارانی بەریتانیا بۆ پێشگرتن لە دابەزینی بەهای گۆشت، شەش سەد هەزار سەر ئاژەڵیان کوشت، لەکاتێکدا خەڵکی هێندێک لە وڵاتانی باشوور لە برسان دەمرن.

٣- **لیدی گرێدراو:**

لەم لیدەدا زانیارییەکان لە یەک ئاست دان و ناتوانین گرنگی تایبەتی بە هیچکامیان بدەین.

لافاوی دهۆک بووە مایەی ٤٠٠ کوژراو و زیانی ١٠ ملیۆن دۆلار و ٥٠٠ کەسیش بێ ماڵ و حاڵ بوون.

٤- **لیدی پرسیاری:**

لەم لیدەدا پرسیارێک ئاراستە دەکرێت بە مەبەستی سەرنج راکێشانی لایەنی پێوەندیدار بە هەواڵەکە.

وەک: بە تێپەڕبوونی یەک حەوتوو بە سەر ساڵی تازەی خوێندندا، خوێندکارانی کەلار دەپرسن، سەرەنجام کەی کتێبەکانیان پێدەگات؟

بەپێی راپۆرتی هەواڵنێرمان لە کەلار، خوێندکاران تا ئێستا کتێبی ئەمساڵیان بەدەست نەگەیشتووە. بەرپرسی پەروەردەی کەلار دەڵێت: گرفتی نەگەیشتنی کتێب، هەموو ساڵێک لە کەلار دووپات دەبێتەوە.

٥- **لیدی تۆماری:**

لەم لیدەدا ئاماژە هاوبەهاکان بەشێوەی تۆماری ئامادە دەکرێت.

وەک: ئەنجوومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی دوشەممەی خۆیدا دوو بڕیاری چارەنووسسازی پەسەند کرد:

عێراق لە شەڕی لوبناندا بێلایەنی رادەگەیەنێ.

سنوورەکانی باشوور و رۆژئاوای وڵات داخران.

٦- **لیدی ئاڵۆز و سادە:**

لەم لیدەدا، لەگەڵ هێندێک هەواڵ رووبەروو دەبینەوە کە بابەتێکی گشتی پێکدێنێت (ئاماژەکردن بە لایەنی گشتی، لیدی سادە ساز دەکات) و ئێمە بەشێکی کەم بەڵام گرنگی ئەم گشتە بەرجەستە دەکەین و ئاماژە بە گشتەکە دەکەین. واتە سەرەتا گشتەکە دێت و پاشان بەشەگرنگەکەی بەرجەستە دەبێتەوە. ئەم لیدە زۆرتر بۆ ئەو هەواڵانەی کە سەبارەت بە بەیاننامە، یا بڕیاڕی کۆنفرانس و کۆبوونەوەکانن بەکار دێت.



وەک: پەرلەمانی کوردستان یاسای "جیابوونەوە"ی پەسەند کرد، بە پێی ئەم یاسایە ژن لە نیوەی سامانی هاوسەرەکەیدا هاوبەش دەبێت.

پەسەند کردنی یاسای "جیابوونەوە": گشت

ژن لە نیوەی سامانی هاوسەرەکەیدا هاوبەش دەبێت: بەشی لاوەکی بەڵام گرنگی گشتەکە.

یان: یاسای "خاوەن خانوو و کرێچی" لە بەشی دووهەمی کۆبوونەی پەرلەماندا پەسەند کرا، بە پێی ئەم یاسایە خاوەن خانوو دەتوانێت پاش ئاگادارکردنەوە، کرێچی لە خانووەکەی وەدەرنێت.

یاسای "خاوەن خانوو و کرێچی": گشت

خاوەن خانوو دەتوانێت پاش ئاگادارکردنەوە، کرێچی لە خانووەکەی وەدەرنێت: بەشی لاوەکی بەڵام گرنگی گشتەکە.

٧- **لیدی وەسفی:**

ئەم لیدە زۆرتر بۆ هەواڵە هونەرییەکان بەکاردێت.

وەک: بە ئامادە بوونی ٢ ملیۆن خوێندکار لە قوتابخانەکان، ساڵی خوێندنی نوێ دەستی پێکرد. (لیدی سادە)

لەکاتێکدا بارانی پاییزی رووخساری شاری تازە کردۆتەوە، ئەمڕۆ ٢ ملیۆن خوێندکار قوناغێکی نوێی ژیانیان دەست پێکرد. (لیدی وەسفی)

٨- **لیدی "پەندی پێشینان"**:

وەک: گوندییان ڕێگایان نەدەدا، سۆراغی ماڵی کوێخای دەگرت. موقتەدا سەدر گوتی پێشمەرگە دەبێت چەک بکرێت.

یان: هەر کەس بانی زۆرتر بێ، بەفریشی زۆرترە. لەم رۆژانەدا کە بەرزایی بەفر لە هێندێک لە ناوچەکاندا گەیشتۆتە نیو مەتر، نرخی پاککردنەوەی بەفر دووهێند گران بووە.

٩- **لیدی نائاسایی:**

ئەم لیدە بۆ هەواڵە وەرزشییەکان، کارەساتەکان و رووداوە بۆنەییەکان بەکاردێت.

وەک: یانەی هەولێر پلەی یەکەمی وەدەست هێنا.

**١٠- لیدی پێشینەدار:**

لەم لیدەدا بەشێوەیەک دەبێت ئاماژە بە پێشینەی هەواڵەکە بکرێت کە خوێنەر هەست بە روودانی لایەنەکە لە رابردوودا نەکات.

هەواڵ: وەزیری ناوخۆی فەرەنسا دوێنێ دەستی لەکار کێشاوە.

جێی ئاماژە کردنە کە وەزیری ناوخۆی فەرەنسا بە هۆی رووداوی تەقینەوەکەی مانگی پێشوو کە لە چێشتخانەیەکدا روویدا، دەستی لەکار کێشاوە.

لەم هەواڵەدا دەبێت "جێی ئاماژە کردنە" لاببرێت و درێژەی دێڕەکە لەگەڵ دێڕی یەکەم تێکەڵاو بکرێت.

شێوەی گونجاو: لەدوای رووداوی تەقینەوەکەی مانگی پێش لە پاریس، وەزیری فەرەنسا ناچار دوێنێ دەستی لەکار کێشاوە.

یان: پیاوێک کە پێش ٢٥ ساڵ لە شەقامی ئازادی هاوسەرەکەی کوشتبوو، دوێنێ لە لایەن پۆلیسەوە دەستگیر کرا.

تێبینی: "پیاوێک کە پێش ٢٥ ساڵ هاوسەرەکەی کوشتبوو"، پێشینەی هەواڵەکەیە کە هێندێک جار لە خودی هەواڵەکە گرنگترە.

وەزیری بازرگانی لە چەمچەماڵ هەواڵی کڕینی وێستگەیەکی نوێی کارەبای راگەیاند، بەم شێوەیە ژمارەی وێستگەکانی کارەبای کوردستان لە ٣ زۆرتر دەبن.

وەزیری بازرگانی لە چەمچەماڵ گوتی: بۆ بەرهەمهێنانی کارەبای زۆرتر، ئەمساڵ چەند وێستگەیەکی نوێ دەکڕین. (ئەم هەواڵە تەواو نییە، چونکە پێشینەی هەواڵەکە (ژمارەی وێستگەیەکی ئێستا) ئاماژەی پێنەکراوە.)

**چەند تێبینییەکی پێویست:**

باشترە بە پیتی لێکنەدراو دەستی پێنەکەین.

لە لیددا نابێت کەڵک لە "جێی ئاماژە کردنە"، "جێی وەبیر هێنانەوەیە"، "جێی وتنە" وەربگیرێت، تەنانەت لە هەواڵەکانیشدا نابێت کەڵکی لێوەربگیرێت، چونکە نیشانەی رابردوو، و دووپات بوونەوەی بابەتەکە دەگەیەنێت.



پێشینەی هەواڵ دەبێت لە هەواڵدا ئاماژەی پێبکرێت، بۆ ئەمەش باشترە لەسەرەتادا هەواڵەکە و پاشان پێشینەی هەواڵەکە بە تەواوی ئاماژەی پێبکرێت.

یەکێک لە ئەرکەکانی میدیاکان ئاماژە کردنە بە پێشینەی هەواڵەکان بەتەواوی یان لە ناو هەواڵەکان و یان لە کۆتاییدا. هەواڵی بێپێشینە هەواڵێکی کەم بەهایە.

# چەمکە سەرەکییەکان لە هەواڵ نووسیندا و بەها هەواڵییەکان

## چەمکە سەرەکییەکان لە هەواڵ نووسیندا

هەواڵ دەبێت راست، روون و هەمەلایەن بێت و ئەو تایبەتمەندیانە لە تەواوی قۆناغەکانی ئامادەکردن، رێکوپێک کردن و بڵاوکردنەوە لەپێش‌چاو بگیرێن.

**١- روونبوونی هەواڵ: (Clean)**

هەواڵ دەبێت سادە، شەفاف و روون بێت. سەرەکی‌ترین هۆی ناروونی و ئاڵۆزی هەواڵ، تێگەیشتنی بەهەڵەی هەواڵنێرە لە ناوەرۆکی هەواڵەکە. ئەم ئاڵۆزییە بە لێکۆڵینەوە و پرسیار لە سەرچاوەی هەواڵەکە راست دەکرێتەوە.

تێبینییەکی‌تر بۆ ئەو هەواڵانە کە وشەگەلی زانستی، ماف، پزیشکی، تەکنیکی و.. تێدایە. هەواڵ دەبێت بەشێوەیەک بڵاوبێتەوە کە تێگەیشتنی بۆ هەمووکەس ئاسان بێت، هەروەها ئەو سادە نووسینە نرخی زانستی هەواڵەکە خەوشدار نەکات.

لە هەواڵ نووسیندا لەپێشچاوگرتنی رێزمانێکی دیاریکراو پێویستە.

**٢- راستبوونی هەواڵ: (Accurate)**

دروستی هەواڵ، بایەخی هەواڵ پێشاندەدات. هەواڵی بێ‌زانیاری پێویست و دوور لەراستی، متمانەی نێوان خوێنەر (گوێگر، بینەر) و میدیاکان دەڕوخێنێت.



بوونی "راستکردنەوە" (Retraction) لە میدیایەکدا، پێشاندەری کەمتەرخەمییە لە لەپێشچاوگرتنی "چەمکە سەرەکییەکانی هەواڵ نووسین" کە هێندێک جاریش گیروگرفتی یاسایی لێدەکەوێتەوە.

لە لایەکی‌ترەوە ئەو بابەتانەی راست نین، لێیان دڵنیا نین، یان بێ بەدواچوونەوەی پێشتر بڵاوکراونەتەوە، دەبنە هۆی کەم بوونەوەی رێژەی خوێنەر (گوێگر، بینەر) و رووکردنیان بۆلای میدیاکانی‌تر.

«هیچ کاتێک دروستی هەواڵ نابێ قوربانی خێرایی بڵاوکردنەوە بێت»

٣- هەمەلایەن بوونی هەواڵ: (Compelete)

زانیاری ناو هەواڵ دەبێت بەشێوەی هەمەلایەنە و تەوا بێت. پێشکێشکردنی زانیاری ئەرشیڤی و ئاماژەکردن بە پێشینەی هەواڵ و وەڵام دانەوە بە ٦ پێکهاتەی هەواڵ (کێ، لەکوێ، کەی، بۆچی، چی، چۆن) لە دارشتنی هەواڵدا پێویستە.

**بایەخە هەواڵییەکان:** (News Values)

هەر رووداوێک هەواڵ نییە، چونکە زۆر رووداو هەن کە بایەخی بڵاوکردنەوەیان نییە.

بایەخە هەواڵییەکان بریتییە لەو پێوانە و تایبەتمەندیانە کە لە ناوەرۆکی رووداوێکدا هەیە و ئێمە دەتوانین بەپشتبەستن بەئەوان، رووداوەکە هەڵسەنگێنین.

گرنگی بایەخە هەواڵییەکان لەوەدایە کە هەواڵنێر بۆ دۆزینەوەی بابەت و رێکوپێک کردنی هەواڵ یارمەتی دەدات، لە لایەکی‌ترەوە وەک پێوانەی هەڵسەنگاندن، بایەخدانان و هەڵبژاردنی رووداوەکان بۆ بڵاوکردنەوە، لە لایەن میدیاکانەوە کەڵکی لێوەردەگیرێت.

**١- پانتایی: (Impact)**

رووداو کاتێک بایەخی هەیە کە لە سەر ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵ کاردانەوەی هەبێت و هەڵگری بەرژەوەندی یان زیانی مادی و مەعنەوی دەستەیەک لە تاکەکانی کۆمەڵ بێت.

وەک:

- تەواوی هاووڵاتیان دەبنە خاوەن ژمارەی نەتەوەیی. (رووبەرووی: تەواوی هاووڵاتیان)
- پزیشکان لە باج و رەسمەکان ئازاد دەبن. (رووبەرووی: پزیشکان)
- هەموو پیشەوەرانی کوردستان لە خزمەتگوزاری دڵنیاکاریدا بەهرەمەند دەبن. (رووبەرووی: پیشەوەران)
- گۆمی ئاوی خواردنەوی هەولێر تەنیا بەشی دوو مانگی‌تر دەکات. (رووبەرووی: دانیشتووانی هەولێر)

**٢- بەناوبانگی: (Fame)**

کەسی سروشتی و یاسایی و تەنانەت هێندێک شتومەک بە هۆی ناوداریان دەتوانن بایەخی هەواڵییان هەبێت و لە وانەیە ئەرێنی (پۆزەتیڤ) یان نەرێنی (نێگەتیڤ) بێت.

هەروەها دەتوانێت کەس یان شتێک ناوبانگیشی نەبێت بەڵام بەهۆی هەواڵی ئێمە، ناوبانگ دەرکات. (وەک: هەڵبژاردنی حامید کارزای بۆ سەرۆکایەتی دەوڵەتی کاتی ئەفغانستان، لەپێشدا کەس نەیدەناسی)

وەک:

- سەرۆکی هەرێمی کوردستان ئەمڕۆ گەڕایەوە هەولێر. (سەرۆکی هەرێمی کوردستان ناودارە)
- قەڵای هەولێر بەرەو وێرانی دەڕوا. (قەڵای هەولێر بەناوبانگە)

**٣- پێکدادان: (Conflict)**

رووداوی کارەسات، ناتەبایی، شەڕوشۆڕ و.. لەخۆدەگرێت.

پێکدادان دەتوانێت: نێگەتیڤ (شەڕ،کوشت و کوشتار، دزی، تاوانکاری)، پۆزەتیڤ (ئاخافتنی دوو کەس، کێبەرکێی وەرزشی)، جەستەیی (لێدانوکوتان، کارەساتی هاتوچۆ) و یان ناجەستەیی (مانگرتن و...) بێت.

وەک:

- مانگرتنی خوێندکاران تەواوی ئێرانی گرتەوە.
- کەوتنی فڕۆکەی توپۆلۆف، ٢٠٠ کوژراوی لێکەوتەوە.



رکبەرکێی پارت و رێکخراوە سیاسییەکان لە سەروبەندی هەڵبژاردنەکاندا توندوتیژتر دەبێت.

**٥- نزیکی: (Proximity)**

بایەخی رووداوێک لە پێوەندی لەگەڵ نزیکایەتی جەستەیی (فیزیکی) و مەعنەوی لە گوێگرانی ئەو رووداوە، هەڵدەسەنگرێت و جیاواز دەبێتەوە.

ئا) نزیکایەتی جەستەیی جوگرافی: (Geographical Proximity)

گوێگرانی رووداوێک لە پەیوەندی لەگەڵ نزیکایەتییان بۆ ئەو رووداوە، سەرنجیان زۆرتر رادەکێشرێت. بەسەرهاتی هاوسایەک یان روودانی کارەساتێک لە گەڕەکێک، شارێک یان وڵاتێکدا، هەرکامیان لە پێوەندی لەگەڵ نزیکایەتی جوگرافییە کە بۆ گوێگر گرنگتر دەبێت.

وەک:

- پارێزگاری هەولێر دەستی لەکار کێشایەوە. (بۆ خەڵکی پارێزگای هەولێر گرنگە)
- بەرپرسی شارەوانی دهۆک گۆڕدرا. (بۆ خەڵکی شاری دهۆک گرنگە)

ب) نزیکایەتی دەروونی: (Psychologicaly Proximity)

بۆ هەڵسەنگاندنی بایەخە هەواڵییەکان، پێوەندییە نەتەوەیی، پیشەیی و ئایینییەکان گرنگن. کاتی واهەیە ئەو بایەخانە لە بایەخی نزیکایەتی جەستەیی، گرنگییان زۆرتر دەبێت.

وەک:

- پسپۆڕێکی کوردی دانیشتووی ئاڵمانیا، بەرزترین پلەی زانستی ئەو وڵاتەی پێبەخشرا.
- مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین مانیان گرت.

**٥- زۆرینە (زۆرینە لە رێژە، قەوارە، ژمارە): (Magnitude)**

ئەگەر هەواڵ پێوەندی بە ژمارە و رێژە هەبوو، دەبێت ئەو زۆرینەیە هەڵگری.

وەک:

- هەڵاوسانی ئابووری لە برازیلیا گەیشتە پلەی ٣٠٠%.
- یانەی تۆپی‌پێی A، ١٥ گۆڵی لە یانەی B کرد.

**٦- سەرسورڕهێنەر و چاوەڕواننەکراو: (Oddity)**

رووداوە نائاسایی و سەیروسەمەرەکان کە چاوەڕوانی بیستنیان ناکرێت و بەدەگمەن روودەدەن. وەک دۆزینەوە تەکنیکییەکان و...

پانتایی ئەو بایەخە هەواڵییە یەکجار زۆرە و لە پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵگادا هەڵدەسەنگێنرێت.

- ژنێک لە سلێمانی ١٢منداڵی بوو.
- دەیان هەزار بۆق هێرشیان بردە سەر گوندێک لە چین.

**٧- تازەیی هەواڵ: (Timeliness)**

زۆربەی هەواڵەکان ئەو بایەخەیان لەخۆ گرتووە، لەراستیدا تازەگی بەشی نەپچڕاوی هەواڵە. چونکە ئەگەر هەواڵێک لەکاتی خۆیدا بڵاو نەبێتەوە، دەبێتە مێژوو.

تەواوی هەواڵەکان دەبێت تایبەتمەندی تازەییان هەبێت، هەڵبەت دوور نییە هێندێک رووداو لە رابردوودا قەومابن بەڵام ئێستا ئاشکرا دەکرێن و بڵاودەبنەوە.

## پێکهاتەکانی هەواڵ (News Elements)

بناغەی سەرەکی ئامادەکردنی هەواڵ لە سەر پێکهاتەکانی دادەمەزرێت و دیارە بە بێ ناسینی ئەوان و ئاگادار نەبوون لە بایەخەکانی هەواڵی (پێشتر باسمانکرد)، هەواڵنێر ناتوانێت بۆچوونی پێویستی بۆ تێڕوانین لە رووداوەکان وەدەست بهێنێت و ناتوانێت رووداوەکان بەتەواوی و بێ ئالۆزی بۆ گوێگری خۆی بگوازێتەوە.

ئەم پێکهاتانە بریتین لە: کێ؟ کەی؟ لەکوێ؟ چی؟ بۆچی؟ چۆن؟

**١- کێ: (Who)**

رۆژنامەنووس دەبێت ئەو کەس و شتانەی کە لە پێکهاتنی رووداوەکاندا دەستیان هەیە، دیار بکات. زانیاری وردی ناوەکان و پلەوپایەکان بۆ بەکارهێنانی ئەم پێکهاتەیە زۆر گرنگە.

ئەو پێکهاتە کە بەپێی ناوبانگێتی هەڵدەبژێردرێت، شوێنی "کردار"(فاعل)، (بەرکار) یان (مسندالیه) لە دێڕدا دەگرێت.

ئەو پێکهاتە دەتوانێت گیاندار (کەس) یان بێگیان (شتێک) بێت.

وەک:

- ئوتۆمبێلی گواستنەوەی پارە دزرا. (ئوتۆمبێلی، شتێک)
- سەرکۆمار لە زانکۆی سلێمانی وتارێکی پێشکەش کرد. (سەرکۆمار، کەسێک)



- هەولێر پشتیوانی لە داخوازییەکانی خەڵکی چەمچەماڵ کرد. (هەولێر، کەسێک)

پێکهاتەی هەواڵی ئەم نموونانە "کێ"یە.

**٢- کەی: (When)**

"کات" لە رووداودا هەمیشە بەشێکە لە بایەخەکانی هەواڵی (تازەیی) و ئەگەر کاتی قەومانی رووداوێک گرنگی تایبەتی هەبوو، هەواڵنێر دەبێت لە سەرەتای هەواڵەکەدا تازەیی ئەو رووداوە بەرجەستە بکات.

- ئەمڕۆ ئاکامی هەڵبژاردنەکان ئاشکرا دەبێت.
- ساڵی داهاتوو سیستەمی پەروەردە لە قوتابخانەکانی سەرەتایی دەگۆڕێت.
- سەدەی ئێمە، بە سەدەی تەکنیک و زانیاری ناوزەد کرا.
- کاتژمێر ٤ و ٢٩ دەقیقە و ٤٥ چرکەی رۆژی هەینی، ساڵی نوێی هەتاوی دەستپێدەکات.

**٣- لە کوێ: (Where)**

ئەو پێکهاتە بەگشتی پێشاندەری بایەخی هەواڵی "نزیکایەتی"یە و شوێنی قەومانی رووداو دیاری دەکات.

لە رووداوی شاردا، دەبێت بەوردی شوێنی رووداوەکە دەستنیشان بکرێت.

ئەو پێکهاتە دەکرێ لە سەرەتا یان لە ناوەندی هەواڵدا بێت.

وەک:

- بۆمبێک ئەمڕۆ بەیانی لە شەقامی رافید و لە نزیک زانکۆی بەغدا تەقییەوە.
- فستیڤاڵی نێونەتەوەیی لاوان سبەینێ لە یاریگای سلێمانی دەسپێدەکات.

**٤- چی: (What) ناوەڕۆک و کرداری رووداو**

"چی" ناوەڕۆکی رووداوە، وەک کارەساتێک، هەڵبژاردن، دۆزینەوەی تەکنیکی و هەر لایەنێک پەیوەندی بە ناوەڕۆک و کرداری رووداوەکەوە هەبێت.

لە هەواڵێکدا لەوانەیە چەند پێکهاتەیەکی "چی" تێدابێت، پێویستە لە نێوانیاندا ئەوە هەڵبژێرین کە بایەخی هەواڵی زۆرتری هەبێت.

لە وتووێژەکاندا بەکردەوە پێکهاتەی "کێ" و "چی" گرنگی تایبەتییان هەیە و پێکهاتەی "چی" سەرەکیترە.

وەک:

پیشەنگای نێونەتەوەیی هەولێر کۆتایی بەکاری خۆی هێنا. لە پیشەنگای ئەمساڵدا ٣٠٠ کۆمپانیای بیانی بەشداربوون کە رێژەیان ٣٠% لە ساڵیپار زۆرتربوو.

لێرەدا:

کۆتایی کاری پیشەنگا: چی

بەشداری ٣٠٠ کۆمپانیای بیانی: چی

زیاد بوونی ٣٠% رێژەی بەشداربووان: چی

**٥- بۆچی: (Why)**

ئەو پێکهاتە، هۆ یان بوونەی قەومانی رووداو پێشان دەدات.

وەک:

- سەرۆکی هەرێمی کوردستان دوێنێ لە دهۆک بە بۆنەی دەستپێکی ساڵی نوێی مەسیحی وتارێکی پێشکەش کرد.

لێرەدا:

سەرۆکی هەرێمی کوردستان: کێ

دوێنێ: کەی

بە بۆنەی دەستپێکی ساڵی نوێی مەسیحی: بۆچی

لە دهۆک: لە کوێ

وتارێکی پێشکێش کرد: چی

**٦- چۆن: (How)**

پێکهاتەی "چۆن" چۆنیەتی قەومانی رووداو پێشاندەدات.

وەک:

بە وتاری وەزیری رۆشنبیری، کۆنفرانسی هەواڵنێرانی بێلایەن لە دهۆک کرایەوە.

بە وتاری وەزیری رۆشنبیری: چۆن

## پێکهێنەرەکانی هەواڵ

بیرنارد شاو نوکتەبازی بەناوبانگی ئیرلەندی وتوویەتی: «وا دیارە رۆژنامەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان رووداوێکی پاسکیل و وێرانی شارستانییەتی مرۆڤ. رۆڵی رۆژنامە، دۆزینەوەی وردبینانە و خێرای زانیارییە تازەکانە سەبارەت بە لایەنە گشتییە سەرنجڕاکێشەکان و گواستنەوەی رەوانیانە بۆ خوێنەر. هەر ئەوەندە!»

لەوانەیە رۆژنامە کردەوەی‌تری هەبێت. وەک پێشکێشکردنی راوبۆچوونی خۆی سەبارەت بە فیلمێکی نوێ، چۆنییەتی چاندنی تەماتە لە باڵەخانە بەرزەکاندا، چۆنیەتی یاریکردنی فڵانە یانەی تۆپی‌پێ لە رۆژی هەینیدا و یان بۆچی فڵانە وەزیر دەست لەکار ناکێشێتەوە. بەڵام هەموو ئەمانە بێ گونجاندنی هەواڵە تازەکان، رۆژنامە دەکات بە کۆمەڵێک نووسراوەی زەینی یان ئەلبومێکی رەنگاوڕەنگ لە لایەنە لەپێشزانراوەکان. رەنگە هێندێک ئەو وتەیەیان لا سەیر بێت و باوەڕیان پێی نەبێت: راوبۆچوون هەواڵ نییە، زانیارییە.

لەم بارەوە وتەیەکی‌تر هەیە کە "سی پی سکات"، سەرنووسەری کاتی رۆژنامەی مەنچەستر گاردیەن لە سەروتارێکیدا دەڵێت: «ئەرکی سەرەکی رۆژنامە کۆکردنەوەی هەواڵە. لە ناوەڕۆکی ئەو ئەرکەدا لایەنێک هەیە کە نابێت رێگا بدەین کردەوەی ئەو ئەرکە لەمەترسی بخات، ئەویش ئەوەیە کە رۆژنامە هەستاوە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی چ زانیارییەک و ئەو بەشەی



کە خۆی لێدەپارێزێ و چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی گرنگ نییە، لایەنی گرنگ پاککردنەوەی تۆزوخۆڵی نیشتووە لە سەر لاپەڕەی راستییەکان و هەر شتێک کە زیانی پێدەگەیەنێت. بەکارهێنانی ئەم رێبازە ئەگەر نەگونجاو نەبێت، دژوارە.»

لە درێژەدا دەڵێت: «پێویستە ئەم وتەیە یەک ملیۆن جار دووپات بێتەوە: دەربڕینی بیروڕا ئاسان و سادەیە، بەڵام دۆزینەوەی ناوەڕۆک و ئامار زۆر گرنگە.»

لایەنی گرنگ لەم وتەیەدا، لە جیاوازی نێوان هەواڵ و بۆچوون دایە. ئەگەر تەلارێکی پڕ لە رۆژنامەوان رووبەڕووی ئەم پرسیارە بکەینەوە : کامتان دەتوانن لە سەر مژاری رۆژ، وتارێک بنووسن؟ بەلانی‌کەم هەموویان ئامادەیی پێشاندەدەن، بەڵام ئەگەر داوایان لێبکەین هەمان هەواڵ و بابەتی رۆژ، بە زانیاری، ئامار و لایەنی تازە دەوڵەمەند بکەن، هیچکامیان دەست بەرز ناکەنەوە. راستە کە هەموو کەسێک لەبارەی هەر بابەتێک، راوبۆچوونی هەیە، بەڵام بەپێچەوانە، کەسانێکی کەم هەن کە زانیاری باوەڕپێکراو و پشتڕاستکەرەوەیان لابێت. راوبۆچوون دیاردەیەکی فراوانە و زانیاری، پڕۆسەیەکی دەستکەوت نییە و پێویستی بە کۆشش و هەڵسوڕان هەیە. پاش ئەو تێبینیانە، هەواڵ چییە؟ پێناسەکانی هەواڵ گەلێک زۆرن و تەنانەت رێژەیان دەگاتە ژمارەی هەواڵەکانی بڵاوکراوە. پێناسەی ئاسایی و باو بۆ هەواڵ لە بەریتانیا ئەوەیە کە ئەگەر سەگێک قەپاڵ لە قاچی مرۆڤێک بگرێت، هەواڵ نییە. بەپێچەوانە گاز گرتنی قاچی سەگێک لە لایەن مرۆڤێکەوە بە هەواڵ دەژمێردرێت. لەم تێبینییەدا دوو تایبەتمەندی هەواڵ ئاماژەی پێکراوە: نائاسایی و سەرنجڕاکێشی.

هەواڵ، پێکهێنەری‌تریشی هەیە: وەک تازەگی، بابەتێک کە پێشتر کەس نەیبیسبێت، بەڵام زۆر زانیاری هەیە کە ئەو دوو تایبەتمەندییە لەخۆ دەگرێ، وەلێ هەواڵ نییە. بۆ نموونە: "فەرمانبەرێک ئوتومبیلێکی نوێ دەکرێت." ئەوە پەیامێکی تازە و نائاساییە و کەسێک نەیبیستووە، بەڵام هەواڵ نییە، چونکە

تەنیا سەرنجی چەند کەسێک رادەکێشێ (خانەوادە، دۆستان، خزمەکان و رەنگە بۆ بەرهەمهێنەرانی ئۆتۆمبێل!!.)

کەوابوو تایبەتمەندی هەواڵ تەنیا تازەگی و سەرنجراکێشی نییە. بەڵکو دەبێت سەرنجی دەستەیەکی زۆر لە گوێگران بۆلای خۆی راکێشێت. ئەو تایبەتمەندییە (راکێشانی سەرنجی گشتی) بەکەڵکترە لە بەرژەوەندی گشتی. ئەو لایەنە کاردانەوەی لەسەر کۆمەڵانی خەڵک هەیە، تەنانەت کاردانەوەی مەزنیش دادەنێت. سەرەرای پەیرەو کردنی ژمارەیەکی زۆری هەواڵەکان لەم تایبەتمەندییە، بەڵام، تەواوی هەواڵەکان ناگرێتەوە.

هەواڵی جیابوونەوەی ژن و مێردێکی نووسەر، هیچ پێوەندییەکی بە بەرژەوەندی گشتی نییە، بەڵام بۆ رای گشتی سەرنجراکێشە.

کەوابوو، دەتوانین هەواڵ ئاوا پێناسە بکەین:

هەواڵ، زانیارییێکی نوێ و نائاساییە سەبارەت بە بابەتێک کە سەرنجی گشتی بۆلای خۆی رادەکێشێت و پێشتر کەسێک نەیبیستووە.

هەڵبەت ئەو پێناسەیە هەمەلایەن نییە، بەڵام بۆ ناسینی باشتری هەواڵ، کلیلێکی باشە و بنەمایەک بۆ لێکۆڵینەوەی "پێکهێنەرەکانی هەواڵ" سازدەکات. ئەو پێناسەیە روونی دەکاتەوە کە هەواڵ بەگشتی خاوەن پێکهێنەرە و دەبێت لەپێشچاو بگیرێت. بەڵام هەواڵ خەیاڵ نییە و دیاردەیەکی سەربەخۆش نییە.

هەواڵ تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ هێندێک دیاردەیتر ساز دەبێت. ئەو دیاردە گەلە پەیوەندییان هەم بە گوێگر و هەم بە هەواڵی دیاریکراوەوە هەیە.

ئەو دیاردانە یارمەتیمان دەدەن تا تێبگەین، لەراستیدا دەمانەوێت چی لە هەواڵ بەدەست بێنین، هێزی هەواڵ لە چیدایە و پێکهێنەرەکانی کامانەن؟ هەر چەندە ئەو پێکهێنەرانە بەهێزتر بن، ئەوەندە پتر ئەگەری غافڵگیر کردنی خوێنەری لێدەکەوێتەوە. راستە کە غافڵگیر کردنی گوێگر لەبەرامبەر بە ناوەرۆکی هەر هەواڵێک کردەوەیەکی ئاساییە و تەنانەت چاوەکانی خوێنەر وەها زەق بکاتەوە تاکو هەواڵەکە بەتەواوی نەخوێنێتەوە، دەستی لێهەڵنەگرێت، بەڵام بمانەوێت یان نەمانەوێت، لە ژیانی رۆژانەدا، خوێنەر



لەبەرامبەر هەواڵێکدا دوچاری حاڵەتی ئاوا نابێت، حاڵەتێک کە پێوەندی راستەوخۆی بە سەرکەوتنی هەواڵنێر و رۆژنامەوە هەیە.

پێکهێنەرەکانی ئەو دوو هەواڵە: "کڕینی ئۆتۆمبێل لە لایەن فەرمانبەرێک" و "بوونی سەرکۆمار لە نێوان ٤٥٠ کوژراوی کارەساتی کەوتنی فڕۆکەیەک بەسەر ناوچەیەکی قەرەباڵغی شارێکدا!" پانتایی فراوانی هەیە. جیاوازی مەزن لەنێوان ناوەڕۆکی ئەو دوو رووداوە، ئەو بۆشاییەیە کە هەڵسەنگاندنەکانی "سەرنجراکێشی هەواڵ" دەرەخسێنێت و هەر لێرەدایە کە پێکهێنەرەکانی هەواڵ دێتەگۆڕێ.

پێکهێنەرەکانی هەواڵ لە مەیدانی وەدەستهێنانی زانیاری و هەڵسەنگاندن و داوەری لە سەر پێشوپاشی و پلەی بابەتی (ئوبژکتیڤ) بوونی ئەوان، مانا پەیدا دەکات. کۆکردنەوەی ئەو تایبەتمەندییانە و داوەری لەسەر گرنگێتی ئەوان، کاری سەرنووسەر، نووسەر و رۆژنامەوانە. ئەو کەسانە لە هەر هەڵسەنگاندنێکدا توانای زانینی خۆیان بەکار دێنن و تێدەکۆشن تا لە چوارچێوەی توانا و بۆچوونی پسپۆڕانەی خۆیان ئەو تایبەتمەندیانە بدۆزنەوە، بەڵام هیچکات ناتوانن بیسەلمێنن کە ئەم کارە ١٠٠% بەدروستی ئەنجامدەدەن.

ئەو کەسانە تەنیا بوارەکان و بنەماکانی هەواڵێک هەڵدەسەنگێنن. لایەنێک بڕوای وایە کە بێخانوومانی، سەرنجراکێش و گرنگە، لایەنێکیتر لەوانەیە ئەو بابەتە بە کەم دابنێ وەکو بابەتێکی خەمهێنەر هەڵیسەنگێنێت. ئەو بۆچوونانە هەم سروشتین و هەم پێویست، بەمەرجێک رۆژنامەوان هۆشیار بێت و رای تاکەکسی خۆی لەگەڵ بابەتیبوون (ئوبژێکتیڤیتێت) بەهەڵە نەگرێت.

هەواڵنێر دەبێ بزانێت هەر پەیام و زانیارییەکی کە وەدەستی دەهێنێت، هەواڵ نییە. جاری وایە بابەتێک ئامادەیە کە پێشکەشی سەرنووسەر بکرێت (یان تەنات بڵاو دەبێتەوە)، لەوانەیە پێویستی بە چەندەها رۆژ و هەفتە لێکۆڵینەوە و بەدواچوون هەبێت. رەنگە هەواڵنێر بۆئەم کارە لەگەڵ گەلێک گیروگرفت رووبەڕوو بێتەوە و لە زۆر تەنگوچەڵەمە تێپەڕ بکات و سەرەڕای ئەمانە نەتوانێت هەواڵەکە سەرنجراکێشتر بکات. بەڵام بەدەگمەن خوێنەرێک

دەدۆزینەوە کە گرنگی بەم گیروگرفتانەی رۆژنامەوان بدات کە بۆ ئامادەکردنی هەواڵ تووشی دەبێت.

ئێستاش ئاماژە بە هێندێک لایەنی گرنگ لە "پێکهێنەرکانی هەواڵ" دەکەین:

**بابەت:**

بابەت، پێکهێنەرێکی گەلێک گرنگە، چونکە پەیڤ و هەواڵ لە ناویدا جێگا دەگرێت: بە پێی بۆچوونە ئاساییەکان بابەتەکانی وەک: کردەوە تاوانکارییەکان، ژینگە، تەندروستی، ئابووری، پێداویستییەکان، سەربازیگەری، پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، سیاسەت و... گرنگی هاوسەنگیان هەیە، بەڵام بەکردەوە هێندێکیان گرنگییان زۆرترە لەچاو ئەوانیتر.

بۆ نموونە، کردەوە تاوانکارییەکان گرنگترن، چونکە ئاشکرایە سەرنجی بەرفراوانی رای گشتی بۆلای خۆی رادەکێشێت.

هەر بابەتێک، پەلوپۆی بچوکتری لێدەبێتەوە. وەک تاوانکاری کە بریتییە لە: دزی، مرۆڤ کوشتن، هەڵخەڵەتاندن، رفاندنی مرۆڤ، مادە سڕکەرەکان، گەندەڵی، دەستدرێژکردن و جنێوکاری، کە بە پێی دەگمەنی روودانیان لەسەر ئاستی وڵات یان ناوچەیەکدا گرنگی تایبەتی پەیدا دەکات.

**گۆڕانی بنەڕەتی:**

لە رووداوە هەواڵێکدا، رووداوێکی تایبەتی یان گۆڕانێکی بنەڕەتی لە بابەت یان لە پەلوپۆیدا، خاڵی سەرنجڕاکێشی هەواڵەکە پێکدێنێت. لەو بەشەدا دەگمەنی، پێکهێنەری سەرەکی و گرنگی هەواڵەکەیە، ئەو پێکهێنەرە بەشێوەیەکی ئاسایی و بێدەستکاری گوێگر، خۆبەخۆ بوونی هەیە.

هەڵسەنگاندنی راستەوخۆ بۆ دۆزینەوەی پلەی نائاسایی بوونی بابەتەکە، ناوەند و جێگای هەواڵەکە دابیندەکات. ئەگەر هەواڵ، رووداوێکی بەدەگمەن و لەهەمان کاتدا نوێ بێت، هەواڵەکە سەرنج راکێش دەکات.

**سەرچاوە:**

هێز و بایەخی هەواڵێک سەبارەت بە گۆڕانێکی بنەڕەتی یان رووداوێکی تایبەتی، زۆرتر پەیوەندی بەو سەرچاوەیەوە هەیە کە گۆڕانە بنەڕەتییەکە بە پێی زانیاری ئەو ئاشکرا دەکات. هەواڵی دەست لەکار کێشانەوەی وەزیرێک،



ئەگەر سەرچاوەکەی یەکێ بێت لە نزیکانی کابینە، یان وەزیرێک یان یەکێ بێت لە نزیکانی ئەو وەزیرە زۆر راستتر و گرنگتر دەبێت تاکو سیاسەتوانی باڵ یان پارتی بەرهەڵستکار، ئەو هەواڵە بە هەواڵنێر بگەیەنێت. لێرەدایە کە سەرچاوە وەک پێکهێنەری هەواڵ، گرنگی پەیدا دەکات. ئەگەریش هەواڵنێر خۆی، دەستلەکارکێشانەوەی وەزیر ئاشکرا بکات، پێکهێنەری هەواڵ بەهێزتر دەبێت، بەتایبەت ئەگەر هەواڵنێر هۆی راستەوخۆی دەستلەکارکێشانەوەکە ئاشکرا بکات و بۆ خوێنەران روونی بکاتەوە.

**رادەی ئاگاداربوون:**

پڕ بەهاترین تایبەتمەندی هەواڵ رادەی ئاگاداربوونە لە ناوەرۆکی هەواڵەکە، پێش بڵاوبوونەوە بەگشتی. هەواڵ کاتێک زۆرترین بایەخی هەیە کە لە یەکەم بڵاوبوونەوەی گشتیدا سەرەڕای سەرچاوەکەی، نەبیستراو و نەنووسراو بووبێت تەنانەت بۆ دۆستان، نزیکان و خزم و کەسی هەواڵنێرش. ئەگەر ئەو هەواڵ و گۆڕانە بنەڕەتییە، بۆ هەموو کەس بیستراو و خوێندراوە و بێت و لە رادیو و تەلەڤزیۆن و رۆژنامەکاندا بڵاوکرابێتەوە، ئیتر سەرنجی کەس بۆ لای خۆی راناکێشێت.

**تازەیی:**

بەپێچەوانەی دۆست و کەلوپەلی مێژوویی، هەواڵی ماوە، کۆنە و بەهای نییە. پێکهێنەری تازەگی یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی هەواڵ و گۆڕانی هەواڵە، بەڵام ئەو پێکهێنەرە خۆی بایەخی نییە. ئەگەر هەواڵنێرێک یەک هەفتە دوای روودانی رووداوێک دەستی بگاتە گۆڕانێکی گرنگ، ئایا پێکهاتەی گرنگی "تازەگی" لەم رووداوەدا ماوە یان نا؟ ئایا تازەگی بنبڕ و رەهایە؟ لێرەدا لایەنی گرنگتر ئەوەیە کە تا ئەو کاتە چەند کەس لەم رووداوە یان گۆڕانە ئاگادار بوونە.

کەوابوو تازەگی لە رووبەڕوو بوونەوەی "کات" و "رادەی ئاگاداری" مانا پەیدا دەکات. هەواڵی کوژرانی کچۆڵەیەک کە دە رۆژ پێش روویداوە، دەتوانێت وەک هەواڵێکی رۆژ هەڵسەنگێندرێت بە مەرجێک رێژەیەکی کەم لە خەڵک ئاگاداری بووبن.

ئەگەر هەواڵی ئەو رووداوە بڵاونەبووبێتەوە، تەنانەت کاتی نێوان قەومان و بڵاو بوونەوە، ئەگەر دە رۆژ و یان زۆرتریش بێت، هیچ بەهای پێکهێنەرەی هەواڵەکە (تازەگی) کەم ناکاتەوە.

ئەگەر دواخستنی لە بڵاو بوونەوەی هەواڵێک کە روویداوە، ببێتە هۆی زۆرتر بوونی سەرنجڕاکێشی هەواڵەکە، پەلەکردن لە بڵاوکردنەوەدا، لە بەها و گرنگی هەواڵکە کەم دەکاتەوە. ئەگەر پەلەنەکردن لە بڵاوکردنەوەی رووداوێک(بەمەرجی ئاگادار نەبوونەوەی گشتی) بە مەبەستی هەمەلایەنەکردنی هەواڵەکە بێت، پەلە لە بڵاو کردنەوەی بێهوودەییە. واتە، "تازەیی" لە ئاست "هەمەلایەنی" دەکەوێتە پلەی دووهەم، تەنانەت وەک پێکهێنەرێکی نێگەتیڤ دەژمێردرێت و لە لایەکیتر، دواخستن لە بڵاوکردنەوە مەترسی ئاگاداربوونی گشتی لێدەکەوێتەوە.

**خوێنەران(گوێگران):**

خوێنەر پێکهێنەرێکە کە بە شێوەی ئاسایی وێناچێ پەیوەندی لەگەڵ بونیاد و گۆڕانی بنەڕەتی هەواڵ هەبێت. خوێنەر رەنگە تایبەت یان گشتی بێت. بەڵام بۆ رۆژنامەوان زۆر گرینگە کە بەوردی لە ناوەڕۆکی ئەو پێکهێنەرە بکۆڵێتەوە. هەواڵنێری ساکار و بێئەزموون ناتوانێت رادە و سنووری ئارەزوو و مەیلەکانی خوێنەر هەڵسەنگێنێت و هەر بەم هۆیەش نازانێت ناوەڕۆکی گۆڕانێک و هەواڵیک تا چ رادەیەک جێگای رەزامەندی و پەسندی خوێنەر دەبێت. دروست وەک ئەوەی کە کەسێک لە تەلارێکی تاریکدا بۆ کۆمەڵێک کەسی نەناسراو بدوێت.

ئاگاداری لە سروشتی خوێنەر، بەگشتی بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو هەڵسەنگاندنە کاردانەوەی هەیە، بەڵام پێویست ناکات ئەو ئاگادارییە لە هەموو بەشەکانی هەواڵ گەیاندندا بەکاربێت.

کاتێک هەواڵنێر گوزارشی خۆی وەک کاڵایەک هەڵسەنگاند کە توانای بازاڕ دۆزینەوەی هەبێت، ئەو کات لە کاری رۆژنامەگەری تێگەیشتووە. واتە، پووچەڵکردنەوەی ئەفسانەکان و روونکردنەوەی ئالۆزییەکان، بەشێکە لە ئەرکی رۆژنامەوانە. لەم کارەدا بەمەرجێک سەرکەوتوو دەبێت کە لە



هەڵوێستی نێگەتیڤی خوێنەر بەرامبەر خۆی نەترسێت و پەرۆشی دڵئێشانی ئەوان نەبێت. رۆژنامەوان ناتوانێت هەمیشە نیگەرانی وەدەستهێنانی دڵی خوێنەر بێت.

ئەمڕۆکە لە جیهاندا رێژەیەکی یەکجار زۆر چاپەمەنی بازاڕی بڵاودەبنەوە کە لە سەر بنەمای تێگەیشتنی تاکەکەسی خۆیان لە مەیل و ئارەزووی خوێنەر کاردەکەن بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانە لە چێژی خوێنەران.

**بوار:**

بە پێی هەلومەرج و گێرەوکێشە باوەکان لە هەر ناوچەیەک(وڵات، شار، گوند)، جیاوازی هەیە لە نێوان دەگمەنی و رەونەقی بواری رووداوێک لەچاو ناوچەیەکیتر. پێوانەی ئەو جیاوازییە لە رادەی سەرنجی خەڵک بە رووداو یان گۆڕانی بنەڕەتی سەرچاوە دەگرێت و ئەو بوارە لە ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکیتر لەگۆڕاندایە. واتە بایەخە هەواڵییەکان بەپێی شوێنی رووداوەکان جیاوازییان هەیە (بایەخی نزیکایەتی).

هەواڵی شەڕەتەقە لە رۆژنامەیەکی دانیمارکیدا زۆر گرنگتر هەڵدەسەنگێندرێت تاکو لە رۆژنامەیەکی نیویۆرکی ئەمریکی. لە ناوچەی یەکەم شەڕەتەقە رووداوێکی دەگمەنە، بەڵام هەمان رووداو لە نیویۆرک رۆژانە دەیان جار دووپات دەبێتەوە. هێندێک جار ئەو جیاوازییە پەیوەندی بە خودی رووداوەکەوە نییە، بەڵکو بە گۆڕانی بنەڕەتی لە رووداوەکە و یان شێوازی قەومانی هەیە. بۆ نموونە: هەواڵی قەپاڵگرتنی قاچی مرۆڤ لە لایەن سەگەوە، شایانی بڵاوکردنەوە نییە، بەڵام ئەگەر ئەم کارە بەردەوام دووپات بێتەوە و برینداری لێبکەوێتەوە، دەبێتە هەواڵێکی گرنگ. گرنگی هەر هەواڵێک بەتایبەت پێوەندی راستەوخۆی هەیە بە دەگمەنیی روودانی. هێندیک جار هەیە هەموو کەس ئاگایان لە بواری رووداوەکان هەیە. بەڵام هێندێک جار دەبێت بە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون وەدەستکەون، ئەو کات دەبێت وەک بەشی جیانەکراوە و نەپچڕاوی گۆڕانی بنەڕەتی هەواڵ هەڵسەنگێت و لە ناو هەواڵەکەدا بگونجێت.

بواری هەواڵ لەو روانگەشەوە گرنگە کە رۆژنامەوان دەپارێزێ لە بەرامبەر تاوانەکانی: مرۆڤی نەرێنی، هەستیار و کێشراو بۆ لای هەواڵی

"رەش". بۆ نموونە ئەگەر لە شوێنێک دەژین کە خەڵک لە خزمەتگوزاری و چاوەدێری بەردەوامی پزشکی بەهرەمەندن و کەسێک بە هۆی بێبەشبوون لەو خزمەتگوزاریانە گیانی لەدەستبدات، ئەوە رووداوێکی گرنگە. هەواڵنێرێک کە ئەو هەواڵە بڵاودەکاتەوە، تاوانی مرۆڤی نەرێنی دەخرێتە پاڵ.

نەرێنی (نێگەتیڤ) یان ئەرێنی (پۆزەتیڤ) بوون، سەرگەرمیی هەواڵنێر نییە. تەنانەت ئەو کەسانەی بە هۆی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵە، هەواڵنێر بە مرۆڤی نەرێنی تاوانبار دەکەن، ئایا خۆیان هەواڵەکە بەمەیلەوە ناخوێننەوە؟

کاتێک هەواڵنێر ئەو پێکهاتە سەرەکییانە لەپێش چاوبگرێت، داوەری لەسەر بەهێزبوونی پێکهێنەرەکانی هەواڵ، تەنیا لە رێگای هەڵسەنگاندنی هەواڵێک بەنیسبەتی هەواڵێکیترەوە دەرەخسێت.

سەرەنج بدەنە ئەم مانشێتانە:

- پێشنووسی ئاشتی بۆسنیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان.
- پێشگیری لە هاوردنی ئۆتۆمبێلی کۆن.
- جیابوونەوەی ئەکتەرێکی بەناوبانگ لە هاوسەرەکەی.
- سیاسەتوانی بەرهەڵەستکاری دەوڵەت، داوای بەرپاکردنی کۆنفرانسێکی چاپەمەنی کرد سەبارەت بە کردەوەکانی وەزیری بازرگانی.
- سیاسەتوانی بەرهەڵەستکار، داوای کۆنفرانسێکی چاپەمەنی کرد بۆ راگەیاندنی پاڵاوتنی خۆی بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتوو.
- سێ کچی لاو لە هەفتەی رابردوودا لە شارێکی بچووک کوژران.

کام لەم هەواڵانە لە روانگەی خوێنەرێکەوە گرنگترە؟ کامیان بۆ مانشێتی سەرەکی لاپەڕەی یەکەم هەڵبژێرین؟

دیارە ئەم کارە بەبێ لەبەرچاوگرتنی خوێنەر و جۆری رۆژنامەکە، دەست نادات. وای دادەنێ کە رۆژنامەی یەکەم رۆژنامەیەکی گشتی و پڕفرۆش لە شارێکی گەورەیە و رۆژنامەی دووهەم، رۆژنامەیەکی سەرکەوتووی ئابوورییە وەک "ڤینانشێل تێیمز"ی لەندەن، "واڵ ستریت ژۆرناڵ"ی نیویۆرک یان "کامرساند دێیلی" مۆسکۆیە. دیارە کە هەواڵی کوژرانی سێ کچی لاو لە



رۆژنامە پڕفرۆشەکە و هەواڵی پێشگرتن لە هاوردنی ئۆتۆمبێلی کۆن، لە رۆژنامە ئابوورییەکان دەتوانێت ببێتە مانشێتی یەکەم.

هەواڵنێری رۆژنامەیەکی سەرانسەری بەریتانیا لە ساڵانی خزمەتکردنی لەم رۆژنامەیەدا، بەم شێوەیە هەر شەوێک هەڵبژاردنی مانشێتی سەرەکی ئەنجام دەدا.

بۆئاسانکاری لەم ئەرکە دژوارە، سەردێری هەموو هەواڵەکانی دەستەبەندی دەکرد و لەگەڵ یەکتر هەڵیدەسەنگاند، دیارە سەردێری هەواڵەکان یارمەتییەکی باش دەدات، بەڵام روونە کە لە دەستەبەندییەکی ئاوا دەبێت چاوەڕوانی ناتەباییش بکەین.

لێرەدا ئاماژە بەم دەستە بەندییە دەکەین، لە کەمگرنگەوە بۆ گرنگ:

ئەو رووداوانەی کە لە سەر بنەمای "گێڕانەوە" و هەرچی کە کەسانیتر دەیڵێن(کێ، چی)، ئامادە دەبن:

هێندێک لە هەواڵەکان سەبارەت بە بەرەنگاری راوبۆچوونەکان یان بۆچوونە تازەکانی. بەم دەستە هەواڵانە دەڵێن: هیچ شتێک نەقەوماوە. گۆڕانێک لە هەواڵدا بە کردەوە رووینەداوە، تەنیا کەسانێک شتێکیان گوتووە.

ئەم هەواڵانە بەم ئاماژانە سازدەبن: "هەڕەشەیکرد"، پێشنیاریکرد (رای خۆی گوت)، "داوایکرد"......

لە ژمارەی مانگی مای ١٩٩٤ی "مۆسکۆ تایمز" رۆژنامەی بەناوبانگی ئینگلیزی زمانی روسیەدا، ٩ لە ١٣ مانشێتی لاپەڕەی یەکەم تەرخان کرابوو بۆ هەواڵەکانی "گێڕانەوە". گۆیا لە وڵاتێکی پان و بەرین وەک روسیا، لە رۆژێکدا تەنیا ٤ رووداوی کرداری قەوماوە؟

سەبارەت بەم دەستە هەواڵانە، هەمیشە هەواڵنێر لە دوو داوی باو دەکەوێت.

یەکەم، هەواڵنێر وا بیر دەکاتەوە کە هەرچی سیاسەتوان دەیڵێت، هەواڵە. ئەو بیرکردنەوەیە راست نییە.

رۆژنامەوان دەبێت ئەو پەندە لەژێر شووشەی مێزەکەی بنووسێ کە لەم جیهانەدا تەنیا سیاسەتوانەکان هەواڵ سازناکەن. زۆرجار دەتوانین وتەی سیاسەتوانەکان پێش راگەیاندنی، مەزەندە بکەین. ئەم وتانە کاتێک شایستەی

کردنن بە هەواڵ کە بەپێچەوانەی چاوەڕوانی ئێمە بن. بۆ نموونە کاتێک سیاسەتوانێکی لیبراڵی بەرهەڵستکاری دەوڵەت، رەخنە لە سیاسەتی چاکسازی دەوڵەت دەگرێت، ئەوە بە پێچەوانەی بۆچوونەکان نییە. بەڵام ئەگەر هەر ئەو سیاسەتوانە پێکهێنانی بەرە لەگەڵ پارتی کۆمۆنیست رابگەیێنێت، ئەوە هەواڵە.

داوی دووهەم، سەرنجدان بە "رووداو بێژ"ێک بە ناوی وتوویژی چاپەمەنی یان وتوویژی گشتییە. وتوویژی چاپەمەنی لە ناوەرۆکی خۆیدا بە پێچەوانەی بۆچوونی زۆریەک لە رۆژنامەوانان، هەواڵ نییە. لەم وتوویژانەدا بەڕاستی هیچ هەواڵیکی تازە روونادات و تەنانەت دونیاش ناگۆڕێت، چونکە پەیڤەکە لە درێژەی سیاسەتەکانی ئەو کەسە دایە(وتوویژی چاپەمەنی لەسەرداوای رۆژنامەوان نییە بەڵکو لەسەرداوای لایەنەکەی‌ترە) و خاڵی گرنگی بۆ ئەو لایەنە، گەیاندنی پەیامی تایبەت و دڵخوازە تا بە گوێی خەڵک بگات.

هێندێک کەس دەڵێن هێندیک شت دەقەومێ:

جاری وا هەیە سەبارەت بە ویست یان هەڕەشەی کەسایەتییەکان، هێندێک هەواڵ سازدەبن. سیاسەتوانەکان لەم هەڕەشەوگوڕەشانە زۆر بەکار دێنن و هێندێک رۆژنامەوانی تازەکار پەرەی پێدەدەن. ئەم رۆژنامەوانانە پێیان وایە کە بەشداری لە وتوویژی چاپەمەنی زۆر گرنگترە لە کۆشش و هەڵسوڕان بەدوای هەواڵە راستەقینەکاندا. هەڵبەت ئەگەر راستکرداربن و بێ‌لایەنی بپارێزن و گرنگی لەڕادەبەدەر نەدەن بە هەڕەشە یان داواکان، بێسوود نییە.

هێندێک هەواڵ لەسەر بنەمای وتەی خەڵک روودەدەن یان بەزوویی دەقەومێن:

ئەمانە ئەو هەواڵانەن کە لە ئاکامی لێکۆڵینەوەکان یان ئەو رووداوانەی کە خەڵک لە دەوروبەری خۆیان دەیان بینن و بە رۆژنامەکانی رادەگەیێنن. لە نێوان ئەم ئاگاداریانەدا زۆرجار هەواڵی راست و گرنگ دەست دەکەوێت.

هەواڵ سەبارەت بەم رووداوانەی کە قەوماون:



ئەم دەستە هەواڵانە دەگەڕێنەوە بۆ گۆڕانە بنەڕەتییەکان، رووداو، کارەساتە ئاسایی و نائاسایی سروشتییەکان، کارەساتی ژیانی رۆژانەی خەڵک و رووداوە راستە سەرنجراکێشەکان. لەناو ئەم دەستەیەدا گرنگترین و سەرنجراکێشترین هەواڵەکانی رۆژنامە خۆی دەدۆزیتەوە.

لە ئاکامدا:

ئەم هەواڵانەی کە هەستی خەڵک دەبزوێنن، گرنگترن. سەرنجدان بە هەست و هەڵسەنگاندنی خەڵک لە هەواڵ، سەرەکی‌ترین پێوانەیە بۆ دۆزینەوەی گرنگترین پێکهێنەرەکانی هەواڵ.

سەبارەت بە هەواڵێک، چەندە خەڵک زۆرتر پەیوەندیتان پێوە بکەن و راوبۆچوونی خۆیان بخەنەروو، ئەوەندە پێکهێنەرەکانی هەواڵی ئەو هەواڵە بەهێز بووە. ئەگەر هەواڵێک رەنگدانەوەی لە کۆمەڵگا بێت، یان ببێتە هۆی بڕیارێک، پەسەند کردنی یاسایەک، بەیاننامەیەک و یان گۆڕانێکی بنەڕەتی بەدواوە بێت، سەرکەوتنێکی تەواوی وەدەستهێناوە.

هەرچەندە کاردانەوەی بڵاوکردنەوەی هەواڵێک، پایەدارتر و ماندگارتر بێت، ئەو هەواڵە سەرکەوتووتر دەبێت:

جاری وا هەیە هێندێک لە هەواڵەکان، زۆرتر لە ٢-٣ رۆژ کاردانەوەی دەبێت لە ناو خەڵکدا و لایەنێکی ماندگار لە کۆمەڵگادا پێکدەهێنێت. هەرچی پانتایی ئەو ماندگارییە بەربڵاوتر بێت، هەواڵەکە سەرکەوتووتر دەبێت.

**هەواڵ و راپۆرت:**

کاتێک باس لە "هەواڵ" و "گوزارش" دەکرێت، رۆژنامەوان هەمیشە دەکەوێتە دڵەخورپەوە کە ئایا سنوورێک هەیە ئەو دووانە لێک جیا بکاتەوە یان لە کوێدا هاوبەشییان هەیە؟ بۆچوونێک هەیە کە دەڵێت، هەواڵ، نووسراوەیەکی وشک و دوور لە جوانکارییە نووسیارییەکانە. بەڵام گوزارش دەبێت بەتاموچێژ، ئاودار و پڕڕەنگ بێت و لەمەدا دەستوپێی رۆژنامەوان نەبەستراوە بۆ بەکار هێنانی جوانکارییەکانی نووسین. یان وا دەزانێت، هەواڵنێر کەسێکی زۆر جدییە کە بەدژواری هێندێک زانیاری کۆدەکاتەوە، بەڵام گوزارشکەر لێرە و لەوێ دەگەڕێ، دێڕ و نوکتەی جوان و

سەرنجڕاکێش دەدوزێتەوە و دەست و باڵی کراوەیە بۆ بەکار هێنانی وشەکان، بەڵام بەڕاستی دەبێت بزانین کە:

١- هیچ هێڵێک نییە بۆ جیا کردنەوەی هەواڵ و گوزارش لەیەکتر. بەڵام زۆر ئاشکرایە کە بە کردەوە جیاوازیان هەیە. لە نێوان هەواڵی کوژرانی ٢٦٨ کەس لە ئاگرکەوتنەوەیەکی مەزن و گوزارشی "چۆن باخچەی حەوشەی ماڵ رازاوەتر بکەین" جیاوازییەکی یەکجار زۆر هەیە.

یەکەم، هەواڵی رووداوێکە و دووهەم، گوزارشێکی نزمە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ خۆماندا راست بین، هەواڵ و گوزارش وەک ئاگر و زەمهەریر نین و هەرگیز جیاوازی ئاوا مەزنیان نییە، بەڵکو ماوەی نێوان ئەم دوولایەنە زۆر لە یەکەوە نزیکە.

٢- هەواڵ و گوزارش لە کوێ یەکتر دەگرنەوە؟ لە کوێ هەواڵ دەبێتە گوزارش؟ دووروودرێژی هەواڵ و گوزارش چۆن دابین دەکرێت؟ ئەم دوو لایەنە تا چ رادەیەک دەبێت بەهرە لە پەیام و گاڵتە و زانیاری وەربگرن؟ ئەم دوو لایەنە لە بوارەکانی وەک شێوازی ژیان، پێوەندییەکانی مرۆڤ تا چ رادەیەک دەتوانن بکۆڵنەوە و چ سنوورێک هەیە؟

لە وەڵامی پرسیاری، گوزارش چییە؟ ئەگەرچی پێناسەی زۆر و تەنانەت گاڵتاوی وەک: "گوزارش ناتوانێت رووداوی جدی لەخۆ بگرێت" هەیە، بەڵام ئەو پێواژانە ئێمە لە ناوەڕۆک نزیک ناکاتەوە. هەروەها پێشاندەری هێڵێکیش نییە بۆ جیاکردنەوەیان، جاری واشە هێندێک شوێنبزرکەرن و لە پەیوەندی لەگەڵ بابەتەکان و شێوازی هەڵسەنگاندنی بابەتەکان دێنەگۆڕێ.

٣- هەواڵ و گوزارش، هەردووکیان بۆ بڵاوبوونەوە دەبن و کردەوەی ناوەندی رۆژنامەگەرییە و هەرکامیان پەنجە دەخەنە سەر یەکتر.

٤- دەبێ ئاگادار بین کە شێوازی هەڵسەنگاندن و رێکوپێک کردنی هەواڵ بەو شێوە باوە، لەگەڵ شێوازی هەڵسەنگاندن و رێکوپێک کردنی گوزارش هاوتایی و هاوبەشییەکی زۆری هەیە کە پتر پێوەندی بە بابەت و شێوازەوە هەیە. زۆربەی هەواڵی رۆژنامەکان، بەتایبەتی رەنگدانەوە و ناوەرۆکی



بەسەرهات و داستانییان هەیە. هەروەها زۆربەی گوزارشەکان پێش ئەوەی خاوەن رەسەنایەتی و وشەی ئەدیبانە بن، لێکۆڵینەوە، پشکنین و پێوانەکانی رێکوپێک کردنی هەواڵی پێوەدیارە.

بەکورتی، بە هێڵێکی روون و ئاشکرا ناتوانین هەواڵ و گوزارش لێک جیابکەینەوە. باشترە وەک دوو لایەنی کاری راگەیاندن هەژمار بکرێن.

**دەبێت هەواڵەکان لە کوێ وەدەست بێنن؟**

سەرچاوەی باشترین هەواڵ، شاری کەر و کوێرانە! هەواڵی باش لە شوێنێک هەڵدەقوڵێ کە کەمترین چاوەڕوانی لێدەکرێت بۆ بوونی هەواڵ و وەها نائاسییە کە کەس ناتوانێت دەستکاری بکات. وەک ئەو رووداوەی کە چەند ساڵ پێش هەمووانی غافڵگیرکرد: فڕۆکەیەک لە ناو خاکی روسیا کەوتەخوار. هۆی رووداوەکە ئەوە بوو کە فڕۆکەوانەکە خەریکی ئامۆژگاری منداڵەکانی خۆی بوو و فەرمانی فڕۆکەکەی پێسپاردرابوو. دیارە ئەم رووداوە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو هەواڵانەی لاپەڕەی رۆژنامەکان پڕ دەکەنەوە.

هەواڵە ئاساییەکان بریتین لە کۆمەڵێک لە گۆڕان، دیاردە، کارەسات، رووداو یان گاڵتەکارییەکان کە لە وڵاتێک یان گشت جیهاندا، گرنگ هەڵدەسەنگێندرێت و زۆر کات پاش روودانیان، میدیاکان بە خێرایی بڵاوی دەکەنەوە. ئاساییترینی ئەو رووداوانە بریتین لە گەلێک هەواڵی چاوەڕوانکراو، وەک: وتووێژە چاپەمەنییەکان، کۆبوونەوە فەرمییەکان، هەڵبژاردنەکان، دادوەرییەکان، دەسپێک و کۆتاییەکان و ....هێندێک لەم هەواڵانە لە رۆژژمێری سەرنووسەر یان نووسەردا یاداشت کراوە و لە کاتی خۆیدا هەواڵنێر بۆ ئامادەکردنی ئەو هەواڵانە، رادەسپێردرێت.

هەواڵنێر ناتوانێت کاردانەوەیەکی بەرچاوی هەبێت لە سەر روودانی هێندێک هەواڵ وەک دادوەری یان کارەساتەکان، بەڵام زۆربەی هەواڵە یاداشت نەکراوەکان بەبێ دۆزینەوە، لێکۆڵینەوە و کۆششی هەواڵنێر وەدەست نایەن. هەواڵنێر جەمسەرێک دەدۆزێتەوە و پاش پشکنین و بەدواچوون،

بەپێی بوارە هەستیارەکان، هەواڵی راستی لێ‌سازدەکات. ئەو هەواڵە یاداشت نەکراوانە لە کوێوە دێن؟

ئەو هەواڵانە لە وتە و نامە فەرمییەکاندا، لە وتووێژە چاپەمەنییەکاندا (کە رۆژی پاش لە لای تەواوی میدیاکان دەستدەکەوێت)، رووداوی هاوشێوەی ئەم رووداوە بەدەگمەن وەدەستدەکەوێت. جەمسەر و سەرەتای ئەم هەواڵانە زۆرتر لە لابەلای ئەو نامیلکانەدا دەردەکەون کە بە رۆژنامە گەیشتوون، لە ناو بۆشایی دێڕی هەواڵەکاندا کە هاوکارانی رۆژنامە بەکەمتەرخەمی بەسەریدا رۆیشتوون یاخود لەم پەیوەندییە تەلەفونیانەدا کە دەڵێت: "بابەتێک هەیە، لەوانەیە بەکەڵکی رۆژنامەی ئێوە بێت" دەردەکەوێت.

هەواڵی باش، تایبەتی و چاوەڕوان نەکراو، لە سەرچاوە نائاساییەکان وەدەستدێت. هەواڵنێر نابێت بۆچوونی خۆی سنووردار بکات و دەبێت لەو راستییە بگات کە هەریەک لە بوارەکانی ژیان پڕاوپڕە لە هەواڵ، چونکە لایەنە نادیارەکانن کە ژیان دەرەخسێنن. هەواڵ سەرچاوە لەو ویستە بەتینە دەگرێت کە لە هەموو شوێنێک دەیهەوێت رووداوەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆی. بەڵام جیاوازی نێوان تازەکان - بەگشتی- و هەواڵەکان لەوەدایە کە هەواڵ فەرمی نییە و بۆ گشت خەڵک سەرنجڕاکێشە و داستانی دیاردە دڵڕفێنەکانی ژیانە وەک: پەیوەندییەکان، خانەوادە، کار و تێکۆشان، سەرکەوتن و شکست و ....

هەواڵ کاتێک سەرنجڕاکێشە - یان بەشێکی سەرنجڕاکێش بکەین، کە بۆ گوێگران تازە، نائاسایی و دڵڕفێن بێت. زۆرجار لە ناو پاس و تاکسی، سەرەی بانک، لە هاتوچۆی شەقامەکان، لە کونجی نامەیەکدا، لە ناو ئامارێکدا و لە هەزاران شوێنیتری شاراوەدا، ئەو هەواڵانە دەکەونە بەرچاو وگوێ و هەواڵنێر بەخێرایی دەتوانێت بەدەستی بێنێت.

**پێوەندی لەگەڵ سەرچاوە:**

کاتێک پەیوەندی بۆ هەواڵنێر سوودمەندە کە بەردەوام و هەمیشەیی بێت. وا نەبێت کە هەر کاتێک هەواڵنێر پێویستی بوو، پەیوەندی بگرێت. بەڵکو هەواڵنێریش لەبەرامبەردا، هەر کاتێک هەواڵ یان زانیارییەکی بەسوودی بۆ ئەو



وەدەستکەوت دەبێ پێی بگەیەنێت. لەم کاتەدایە کە هەواڵنێر دەتوانێ هیواداری یارمەتی ئەو بێت. دەبێت ئەم کارە دوولایەنی بەشێوەی دوستانە بەڕێوە بچێت، تا سەرچاوەی ئێوە لە کاتی پێویستدا هەواڵە گەرم و گرنگەکان بەپەلە بەدەستتان بگەیەنێت. دیارە ئەگەر لە زانیاری و هەواڵەکانی سەرچاوەکەتان بە باشی کەڵک وەرگرن، دەبێتە هاندەری ئەو بۆ درێژەدان بە هاوکاری.

**سیاسەتمەدارەکان:**

تێکۆشەرە سیاسییەکان(پارت، دەوڵەت و ...) ئەو کەسانەن کە دەبێت هەواڵنێر پێوەندی لەگەڵیان هەبێت. ئەمانە نزیکترین کەسانی لە ناوەندە گرنگە بڕیاردەرەکانی وڵات و ناوچە، و زانیارییەکانیان هەمیشە بەکەڵکی هەواڵنێر دێت. پێوەندی باش و گونجاو لەگەڵ ئەمانە، کاری رۆژنامەوان سادەتر دەکاتەوە. دیارە یارمەتی سیاسەتوانەکان بە رۆژنامەوان، مەبەستی تایبەتی تێدایە بەڵام هەواڵنێریش نیازی بە زانیاری ئەوان هەیە، بۆیە دەبێت پەیوەندییەکی گونجاو و بەردوام لەناویاندا هەبێت.

بەرپرسێکی دەوڵەتی عیراق کە دۆستایەتی لەگەڵ هەواڵنێرێک هەبوو، بوو بەهۆی چوونی پسپۆڕێکی هەواڵە سیاسییەکانی رۆژنامەی "ئابزروێر" بۆ ناو خاکی ئەو وڵاتە. ئەو هەواڵنێرە توانی گوزارشێکی بێ‌وێنە لە تاوانەکانی سەدام حسێن دژ بە تێکۆشەرانی بەرهەڵەستکار ئامادە بکات.

زۆربەی ئەو سەرچاوانە بۆ یارمەتییەکانیان مەبەستێکی تایبەتییان نییە و هۆی دانی یارمەتی و زانیارییە گرنگەکان دەگەڕێنەوە بۆ لوتف و محەبەتیان!

**راپۆرتە فەرمییەکان:**

بە گشتی هەواڵنێران دوورەپەرێزی لە گوزارشە فەرمییەکان دەکەن. بەڵام جاری واهەیە کە لە گۆشەوکەناری ئەم بەڵگەنامانەدا، هەواڵی نایاب بەدەست دەکەوێت. وەک هێندێک ئاماژە یان رێژە کە لە پەراوێزی ئەو گوزارشاندا خۆیان شاردۆتەوە، واتە ئەو شوێنانەی کە هەواڵنێر زەحمەتی خوێندنەوەی بەخۆی نادات. کەوابوو گوزارشە فەرمییەکان بە گشتی خاڵی لە هەواڵ نین.

**گرووپە نافەرمییەکان:**

ئەم گرووپانە بە شێوەی ڕێکخراوەیی کار دەکەن. وەک لایەنگرانی ژینگە و ئاشتی و سەوزەکان کە لەدەرەوەی دەسەڵات و بە شێوەی خێرخوازانە هەڵدەسووڕێن و هەرکامیان بۆ تێکۆشانی خۆیان مەبەست گەلێکی گرنگیان هەیە. بۆ نموونە لە بوارەکانی، ئازادی مەدەنی، یەکسانی ژنان، تەندروستی، منداڵان، لایەنگری لە پەککەوتووان و... کار دەکەن.

لە وڵاتانی ئەوروپایی سەدان لەم ڕێکخراوانە خەریکی لێکۆڵینەوە و گوزارش نووسینن و ئامادەن لەم بوارانەدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووساندا هاوکاری بکەن. بۆ هەواڵنێر، هاوکاری و پەیوەندی کارا لەگەڵ ئەم گرووپانە - بەتایبەت کەسانی پسپۆڕ، زۆر گرنگە.

**ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان:**

ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کارا گوزارش و ئامار و زانیاری بڵاودەکەنەوە، کۆنفرانس و سمینار دەبەستن و سەدان پسپۆڕ و کارزان لە بوارە جیاوازەکان هاوکاریان دەکەن. هەواڵنیر، دەبێت زۆر گرنگی بەم ڕێکخراوانە بدات. ئەوانە سەرچاوەی زۆر گرنگی ڕوژنامەوانن.

هێندێک لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم ڕێکخراوانە تەرخان کراوە بۆ گیروگرفتە تایبەتییەکانی شوێنە گرنگەکانی جیهان. هەواڵنێران لە وڵاتە جیاوازەکان دەتوانن بە سەردانی بنکەکانی ئەو ڕێکخراوانە لە وڵاتی خۆیان یان پەیوەندی گرتن لەگەڵ نووسینگە ناوەندییەکان، داوای دواین لێکۆڵینەوەکانیان لە سەر وڵاتی خۆیان یان هەر وڵاتێکیتر بکەن، بێگومان ئەم زانیارییانە بۆ خوێنەران سەرنجڕاکێش دەبن.

بەردەوام بوون لەم پێوەندییانەدا دەبێتە هۆی پێوەندی گرتنی سەربەخۆیی بەرپرسانی ئەم ناوەندانە لە داهاتوودا. بۆ نموونە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان هێندێک ناوەندی هەیە لە بوارەکانی: ژنان، منداڵان، تەندروستی، بێخانومانی، پەروەردە، ئابووری، گەشە، ژینگە، زەریا، بازرگانی، فەزا، کۆچبەری، خۆراک، وزەی ناوکی و.. هەر کامیان لەگەڵ دەیان



ڕێکخراوە و دەزگا پێوەندیدارەکانی سەرانسەری جیهان کاردەکەن. تۆ بڵێی لەم ڕێکخراوە پانوبەرینانە، ناتوانین هەفتانە هەواڵێکی گرینگ ئامادە بکەین؟

**زانکۆکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە:**

بەرهەمی لێکۆڵینەوە زانکۆییەکان زۆرجار سەرنجڕاکێشن. ئەم لێکۆڵینەوانە چ سەبارەت بە کاردانەوەی دەرمانێکی تایبەت بێت و چ لەبارەی ڕەنگی دڵخوازی پۆشاکی کوڕە لاوەکان بێت، بۆ خوێنەر سەرنجڕاکێشە. هێندێک هەواڵنێر زاتی کار کردن لەم بوارەیان نییە، لە کاتێکدا بەشێکی زۆر لەم لێکۆڵینەوانە چاوەڕوانکراو نین. بۆ نموونە، چەند ساڵە ناوەندێکی لێکۆڵینەوە لە مۆسکۆ خەریکی هەڵسەنگاندنی هەڵسوکەوتی "کۆسمەناوت"ەکانە لەکاتی مانەوەیان لە ویستگەی دەستکردی "میر" لە بۆشایی و ئەگەری پێکهەڵچوونیان لەگەڵ یەکتر!

ئەگەر هەواڵنێر بەرهەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی هاوسایەتی دانیشتووانی خانوو بەرزەکان بەیەکەوە هەڵسەنگێنێ، دەسکەوتێکی سەرنجڕاکێشی دەبێت.

**بڵاوکراوە زانکۆیی و پسپۆڕییەکان:**

خوێندنەوەی بڵاوکراوە زانستییەکان، زانکۆیی و پسپۆڕییەکان، کاری ئاسایی هەواڵنێرە. وەدەستهێنانی زۆربەی ئەم بڵاوکراوانە تەنیا پێویستی بە داوا کردن لە لایەنە پێوەندیدارەکان هەیە و بەزووترین کاتیش دەگاتە دەست ڕۆژنامەوان. تەنانەت خوێندنەوەی بڵاوکراوە سیاسییە نهێنییەکان - بۆ ڕۆژنامەوانی سیاسی- پێویستە. هەواڵ و گوزارشەکانی ئەم بڵاوکراوانە زۆرجار لایەنگرانە و ناپسپۆڕانەیە، بەڵام تایبەتمەندییەکیان هەیە کە بابەتەکانی ڕاستەوخۆ و لە سەرچاوە ئاگادارەکان وەرگیراون. زۆربەی هەواڵە گرینگەکان لە لاپەڕەی یەکەمی ئەو بڵاوکراوانەدا پێشکێش دەکرێن.

**ئاگادارییەکان:**

بەشی ئاگادارییەکان گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆ ڕۆژنامەوان. خوێندنەوەی ئەم بەشە لە هەر ڕۆژنامەیەکدا، ڕاسپاردەیەکی هەمیشەیی بۆ هەواڵنێرە. بەشی ئاگادارییەکان و بڵاوکراوە تایبەتەکانی ئاگاداری، لە پێناسەیەکی

گشتیدا رادەی پەسەندی و سەرنجی گشتی بۆ بوارە جۆراجۆرەکان پێشاندەدات. لێرەدا لایەنێکی گرنگ ئەوەیە کە لە بەشێکی سەرەکی ئەم ئاگادارییانەدا، کۆمەڵێک خەڵک مەودای پێوەندی گرتن لە دەرەوەی بازنەی راگەیاندن بۆخۆیان دەرەخسێنن (هەڵبەت زۆرتر لە چاپەمەنییەکانی بیانیدا).

بۆنموونە: لە رۆژی ٢ی مانگی مای ساڵی ١٩٦٢دا، خاتوو "گلادیس کید" لە بەشی ئاگادارییەکانی رۆژنامەی "سانفرنسیسکو ئێگزامینێر"دا رایگەیاند:

"من ناخوازم هاوسەرەکەم بەهۆی تاوانی نەکردوو لە هۆدەی گازدا سزا بدرێت. بۆیە بەپێویستی دەزانم کە رایبگەیەنم ئامادەم بۆ ماوەی ١٠ ساڵ، تەواوی کاتم وەک چێشتکەر پاشماڵە یان پەرستار بۆ پارێزەرێک کار بکەم بەمەرجێک پارێزەری هاوسەرەکەم لە دادگا لەئەستۆ بگرێت."

"وینسێنت هالی‌نان'، یەکێک لە پارێزەرانی بەناوبانگی شار، پاش دیتنی ئاگادارییەکە پێوەندی لەگەڵ خاتوو "کید" گرت. هاوسەری ئەو ژنە بە هۆی دیتنەوەی شوێنەواری پەنجەی لە سەر شەمشێرێکی کۆن لە دوکانی کوژراوەکە کە ئەنتیکفروش بوو، تاوانی کوشتنی بەسەردا سەپابوو. پارێزەر هالی‌نان، سەلماندی کە کوژراوەکە تەنانەت بە شەمشێر نەکوژراوە. شوێنەواری پەنجەش دەگەڕایەوە بۆ کاتێک کە بەڕێز "کید" لەگەڵ دۆستێکی بۆ کڕینی شەمشێر سەردانی ئەو دوکانەی کردبوو.

دادگا بێتاوانی "کید"ی راگەیاند، بەڵام پارێزەرەکە چاوپۆشی لە بەڵێنی خاتوو "کید" کرد.

لە ناوەڕۆکی ئاگادارییەکان دەتوانین زۆر بابەت بدۆزینەوە. وەک ژنێک کە بە هۆی نەدارییەوە، منداڵەکەی دەفرۆشێت یان کاسانێک کە گیانلەبەرە نایابەکان قاچاخ دەکەن و دەیانفرۆشن و...

**هێزەکانی پۆلیس، رێکخراوە یارمەتیدەرەکان:**

پۆلیس (بەشە جۆراجۆرەکانی)، بنکەی ئاگرکوژانەوە، فریاگوزاری و ... سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ چاپەمەنییە ناوچەییەکان، بڵاوکراوە سەرتاسەرییەکان لەکاتێک رووداوەکەنە ئەم هەواڵانە کە رێژەی زیان، کوژراو، دەستگیرکراوەکان و... زۆر بێت. لەم بوارەدا باشترە هەواڵنێر و رۆژنامە



پێوەندی بەردەوامیان هەبێت لەگەڵ ئەم ناوەندانە، بەتایبەتی لەگەڵ بەشی مادەسڕکەرەکان و ئاسایش.

**بەدواداچوون:**

"بەدواداچوون" یەکێکە لە سەرچاوەکانی هەواڵ کە زۆرجار فەرامۆش دەکرێت و دەتوانین دابەشی سەر سێ جۆری بکەین:

پەیگیری هەواڵە کورتەکان کە بە کاری زۆرتر و بەدواداچوونەوە مەودای فراوان کردن و سەرنجراکێشتر بوونی هەبێت،

بەدواداچوونەوەی هەواڵە خێراکان، بەپەلە پاش روودانیان،

بەدواداچوونەوەی هەواڵە ناتەواوەکان بۆ داهاتوو، وەک بەردەوامی دادگاکان.

**تێبینی:** هەواڵنێر دەبێت لە کاتی هاتوچۆ لە شەقامەکان، شوێنی کار، میوانی، کۆبوونەوەکانی خانەوادە و لە هەموو شوێنەکان بە چاو و گوێی کراوەوە سەیری دەوروبەری بکات. لە دەوروبەری ئێمە گەلێک هەواڵی سەرنجراکێش هەن.

بۆ نموونە، هەواڵێک سەبارەت بەبێ خانوومانی، ئەم گوزارشە دەتوانێ بەرهەمی تێڕوانین لە خەڵکی بێخانوومان لە شەقامەکان و لە دواین کاتی شەو لە ویستگەکانی میترۆ، پارکەکان و.. بێت و تەنیا چەند پرسیارێک لەم خەڵکە و دەسپێکێک، دەبێتە گوزارشێکی سەرنجراکێش.

ساڵنامەکان، گوزارشەکانی ساڵانە:

بە یارمەتی سەرچاوە چاپکراوەکان (ساڵنامە) یان رێژە و ئاماری بڵاوکراوە لە گوزارشە ساڵانەکان، هەواڵنێر دەستی دەگاتە سەرچاوەیەکی بێپایان لە بابەتی سەرنجراکێش. لە ساڵنامەکاندا زانیاری سەبارەت بە رۆژی لەدایکبوون، مەرگ، دیاردە مێژووییەکان، ساڵوەگەڕی دۆزینەوەکان و تەنانەت دۆزینەوە تازەکان دەستدەکەون. یان ئامرازە نوێیەکانی ماڵ کە یەکەم جار تاقیکراونەتەوە و گەیشتوونەتە بازاڕ.

**چاوپێکەوتنەکان:**

چوونەدەرەوە و دیداری رووبەڕو لەگەڵ خەڵک زۆر گرنگترە لە پێوەندییە تەلەفۆنییەکان. چاوپێکەوتنی راستەوخۆ کاردانەوەی باشتر و خێراتری هەیە، و زیاتر دڵنیامان دەکات، زانیاری زۆرتر وەدەستدێنێت و مەودای دەردەدڵ کردن زیاتر دەکات. هەواڵنێر هەڵە دەکات ئەگەر پاش پێوەندی گرتن لەگەڵ سەرچاوە، یەکودوو داوای زانیاری بکات، زۆرجار پاشخستنی وەرگرتنی زانیاری، مەودای دڵنیایی زیاتر دەکات. وتووێژی لە کاتی گونجاوتر، ئەگەری وەدەستهێنانی زانیاری زۆرتر و گرنگتر دەرەخسێنێت. جاری وا هەیە کە وتە گرینگەکان پێش یان پاش دیدار و کۆبوونەوە چاپەمەنییەکان دەگوترێت. هەواڵنێرێک کە هەل و کاتی دیدار لەگەڵ سەرچاوە هەواڵییەکان لەدەست دەدات، لە هێندێک هەواڵ و زانیاری بێبەش دەبێت.

**خۆ باش ناساندن:**

هەواڵنێر ئەگەر لە کۆمەڵگا و مەیدانی میدیاییدا بە کەسایەتییەکی باش و گونجاو ناودەرکات و وەک رۆژنامەوانێکی جێیباوەڕ بناسرێت، لایەنەکان بە دڵنیاییەوە زانیاری و هەواڵی پێرادەگەیەنن.

لە ساڵی ١٩٦٨دا، کاتێک "ئەلکساندەر گینزبیرگ"، جاسووسی ئینگلتەرای لە یەکێتی سوڤێت بە نهێنی دادگایی و بەند کرا، هاوسەرەکەی "لودمیلا" وتووێژێکی رۆژنامەوانی سازکرد. شەوێک پێش وتووێژەکە، ناوەندی ئاسایشی میدیایی هەڕەشەی لە ١٠٠ هەواڵنێر لە مۆسکۆ کرد کە بەشداربوونیان لەم وتووێژە دەبێتە هۆی گیروگرفتێکی زۆر بۆیان. رۆژی دواتر تەنیا ٤ هەواڵنێر زاتیان کرد لە ماڵی "گینزبیرگ" بەشداری لە وتووێژەکە بکەن، لە ناویاندا "رەیمۆند ئەندرسۆن"، هەواڵنێری "نیویورک تایمز" بوو. چەند مانگ پاشتر، لە جولای ١٩٦٨دا، لە رێگای دۆستێکی رووس، پاکەتێکی گەیشتە دەست کە مێژوویی بوو: داواکاری "ئاندرەی ساخاروڤ"، قوتابی ناڕازی رووس، دژی شێوەکانی سەرکوتکردن لە یەکێتی سوڤێت.



"ئەندرسۆن" پاش دڵنیایی لە رەسەنی نووسراوکە، ناردی بۆ رۆژئاوا، کە بوو بە گرنگترین هەواڵی ئەو سەردەمە. "ئەندرسۆن" ئەو سەرکەوتنەی بە هۆی ئەو نەترسییەوە وەدەستهێنا.

**میدیاکانیتر:**

یەکێک لە وانە بێماناکانی کۆلیجە رۆژنامەوانییەکان سەبارەت بە رکەبەری کاری رۆژنامەگەری، خۆپارستن لە هاوکاری لەگەڵ چاپەمەنییەکانیترە و بەردەوام رۆژنامەوانەکان لە هاوکاری ئاوا دەسڵەمێننەوە. ئەم تێبینیانە زۆرتر ئاماژە بە رکەبەری میدیایی دەکەن. لە حاڵێکدا هێندێک لە باشترین هەواڵە چاپکراوەکان لە رۆژنامەیەکدا، ئەم هەواڵانەن لە رۆژنامەیەکیتردا یان بە کەم و کورتی بڵاوبۆتەوە یان لە رۆژنامەی یەکەمدا بڵاو کراوەتەوە و رۆژنامەی دووهەم گۆڕانە بنەڕەتییەکانی پەیگیری کردووە.

هەروەها زۆرجار دەبینین کە زۆربەی رۆژنامەکان هەرکامیان لە گەلێک لایەنەوە هەواڵ بڵاودەکەنەوە، کۆی ئەم لایەنانە، نەخشێکی روونتر لە رووداوەکە دەخاتە بەرچاو.

ئەمە هەڵبەت بەمانای نووسینی دووبارەی هەواڵەکانی یەکتر نییە. بەڵکو ئەم دەستەواژەیە کە دەڵێت، رۆژنامە جێگای بڵاوکردنەوەی تازەترین هەواڵەکانە و پێویست ناکات بەدواچوونەوەمان هەبێت لە سەر هەواڵە بڵاوکراوەکان لە شوێنیتردا، لە بنەڕەتدا هەڵەیە. بەتایبەت لەبەر ئەوەی هەمیشە ئەگەری هەڵە لە رۆژنامەی یەکەمدا هەیە.

ئەگەر هەواڵنێر نەتوانێت سەبارەت بە هەواڵێکی تایبەتی داخوازی سەرنووسەر بە هۆی نەبوونی سەرچاوەی زانیاری دابین بکات، بۆی هەیە لە زانیاری رۆژنامەیەکیتر بە ئاماژەکردن بە سەرچاوە، کەڵک وەربگرێت. بەڵام دەبێت لەمەر کۆششی خۆی بۆ دۆزینەوەی زانیاری تازە، خوێنەر ئاگادار بکاتەوە. وەلێ باشترە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بدۆزێتەوە و زانیارییەکانی ئەو بگۆزێتەوە.

هەرگیز نابێت وەک سەرچاوە ئاماژە بە گوزارشی پشتڕاست نەکراوە بدەین.

هەواڵنێر لە کاتی ئامادەکردنی رووداوێکدا دەتوانێت لە ناوەڕۆکی هەواڵی هاوکارانی لە رۆژنامەیەکیتر بەهرە وەربگرێت و وەک زۆر جار ئاماژە دەکرێت کە: "بەپێی میدیاکان"، بەڵام بەتەواوی ئاماژە بکات بە ناوی رۆژنامەی سەرچاوە. ئەگەر سەرچاوەکە چەند رۆژنامەیەک بن، دەبێت ئاماژە بە ناوی هەموویان بکرێت. هەروەها واتەی "سەرچاوە ئاگادارەکان" لەم نموونەدا گونجاو نییە و ئەو هەواڵنێرە لەپێشچاو هاوکارانی دەخات.

**لێکۆڵینەوە بنەڕەتییەکان:**

نارەواترین ئاماژەیەک کە رۆژنامەوان دەیڵێت، ئەوەیە: "نەمتوانی هیچ وەدەست بێنم!"، بەتایبەت ئەگەر لە درێژەدا دەڵێت: "هەموو شوێنی پێویست گەڕام!" دەبێت ٩٩% دڵنیا بین کە رۆژنامەوان هەموو شوێنە پێویستەکان نەگەڕاوە و لانیکەم ٢-٣ شوێنیتر بۆ بەدواچوون دەتوانین پێشنیار بکەین. بێگومان هەمیشە شوێن گەلێک هەیە بۆ وەدەستهێنانی زانیاری.

**وانەی سەرەکی ئەوەیە:**

"**هەرگیز مەتاڵ فرێ مەدە و هەرگیز لە پرسیار مەترسێ**" رەنگە بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پەندە، هەواڵنێر بە شوێنێک بگات.

بەشێوەیەکی ئاسایی، لێکۆڵینەوە بنەڕەتییەکان بە زانیاری تەواو و متمانەپێکراو کۆتاییان پێنایە، هەرچەندە سەرچاوەی باوەڕپێکراویشان هەبێت.

هەمیشە سەرچاوە راستەوخۆکان جێگای متمانە و دڵنیایی زۆرترن.

وەک سەرچاوە دەوڵەتی، ناوچەیی، رێکخراوە فەرمی و نێونەتوەییەکان. رادەی بەکەڵک بوونی زانیاری رێکخراوە فەرمییەکان لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکیتر جیاوازی هەیە. شێوازی دەسەڵاتداری و کولتوور، لەم بوارەدا کاردانەوەی هەیە. خەڵک لە وڵاتانی گەشە سەندوودا، دەستیان ئاواڵەیە بۆ هەڵبژاردنی بەرپرسان، لە بەرپرسانی وڵات بگرە تاکو شار وناوچە و تەنانەت بەرپرسی بنکەی ئاگر کوژانەوەش. ئەو دەنگدانە راستەوخۆیە وا دەکات لە هەر کاتێک کە بیانەوێت، دەتوانن لێپرسینەوە لە کاروباری هەڵبژاردراوەکانی خۆیان بکەن و هەر بەم هۆیەشە کە تەنیا زانیاری راستەوخۆی ئەوان دڵنیا دەکاتەوە.



ئەم لێپرسینەوەیەی بەرپرسەکان ناچار دەکات سەرەڕای مەیل و ئارەزوی خۆیان، زانیاری بە خەڵک بدەن. بەشی پێوەندییە گشتییەکان لە رێکخراوە دەوڵەتییەکانی ئەم وڵاتانە ئەرکیانە و بەرپرسن لە بڵاوکردنەوەی بەردەوامی هەواڵەکان بۆ خەڵک.

خوێنەرانی وڵاتانی گەشەسەندوو، زۆرتر بابەتی کورت، گرنگ و ئاشکرا دەخوێننەوە نەک هەواڵی ئاڵۆز و ناڕوون.

ئەگەر هەواڵنێر لە چوارچێوەیەکی داڕێژراو و بەرتەسکدا کار نەکات، بەرپرسانی رێکخراوە فەرمی و نافەرمییەکان هەمیشە ئامادەی یارمەتیدانن بە مەرجێک هەست بە بەرپرسایەتی هەواڵنێر بکەن.

ئەو سەرچاوانە بریتین لە باڵوێزخانەکان، نووسینگە بازرگانییەکان، پسپۆڕی زانکۆکان و ناوەندی لێکۆڵینەوەکان پۆلیس، میدیاکانیتر، رێکخراوە نێونەتەوەییەکان. زۆرجار تەنیا بە تەلەفۆنێک دەدۆزرێنەوە. نووسینگە بازرگانییەکانی رۆژئاوایی بەگشتی - نە هەموویان - زۆر بەکەڵکن.

کتێب و رێنموونییە چاپکراوەکان (وەک کۆمپانیا کەشتیوانییەکان، ئاسن و ... سازی، ئۆتۆمبێل سازی، گەشتیاری و...) بۆ دەستپێکی لێکۆڵینەوە بنەڕەتییەکان گرنگن، بە مەرجێک زانیارییەکان بە وردی و ئەسپایی بەکار بێنن.

لە هەمووان گرنگتر ئەنتەرنێتە کە بە بازنەیەکی بەربڵاو سەدان کتێبخانە، ناوەندی زانیاری، رێکخراوە و نووسینگە دەوڵەتی و نادەوڵەتی و زانکۆیی و... دەگرێتەوە.

**سەرچاوەی گومانلێکراو:**

رۆژنامەوان دەبێت بە گومانەوە، لە دوو سەرچاوە بڕوانێت:

سەرچاوەیەک کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەنگۆ یان نوکتە بڵاودەکاتەوە،

کەسانێک کە ناتوانن بەخێرایی پەیوەندی بە هەواڵنێر یا رۆژنامە بکەن.

کەس نابێت متمانە بەم سەرچاوانە بکات. بەڵام ئەمانە تەواوی سەرچاوە گومانلێکراوەکان نین.

سەرچاوە گومانلێکراوەکان ئەوانەن کە زانیارییەکانیان "بۆن"دارە یان لە سەرچاوەیەکی متمانە پێکراوەوە ناگات.

پێش بەکار هێنانی زانیاری سەرچاوەکان، ئەم تێبینیانە لەبەرچاو بگرن:

● لەخۆمان پرسیار بکەین: چ مەبەستێکی هەیە؟

خەڵک یارمەتیدەری باشن بۆ میدیاکان، ئەگەرچی بەدەگمەن هەڵدەکەوێت، چونکە خەڵک، ناشارەزایانە زانیاری دەدەن. مەبەستیان دژایەتی کردنە لەگەڵ بەرامبەری سیاسی، ماڵی یان تاکەکەسیی، مەبەستیان گەیشتنە بە ئاکامێک یان لێدانی دوژمنی بە تواناترە لە خۆیان. هێندێک جاریش مەبەستیان تۆڵە سەندنەوەیە.

بە پێی ئەمانە و زۆر هۆی نەناسراویتر، رۆژنامەوان دەبێت گومان لە خۆی بکات و ئەگەریش دەستی دا، لەو کەسە پرسیار بکات بە چ مەبەستێک یارمەتی دەدات؟

زۆرکەس ئارەزوویانە وتەکانیان- بە ناو یان بێناو- لە میدیاکاندا بڵاو بێتەوە. هەڵبەت گومانکردن بە مانای چاوپۆشین نییە لە زانیارییەکان، بەڵکو زۆرتر بۆ تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی پترە. لە خۆتان و ئەوان پرسیار بکەن، لە پشت ئەم هەواڵە چ مەبەستێک هەیە؟ ئەو رووداوەی کە لە سەرەتادا بۆ هەواڵنێر دەگێڕنەوە، زۆرجار بەکردەوە هەمان وردی و توانایی و گرنگیتی نییە کە پاشان وەدەستی دێنێت. بۆیە باشترە لە سەرچاوە، پرسیاری لایەنەکانیتری ئەو زانیارییە بکەن، یان داوای روون کردنەوەی زۆرتر لە سەرچاوەکە بکەن.

هیچ کاتێک ئەم پرسیارانە لەبیرمەکەن. هێندێک جار رووداوی گاڵتاوی لەم بابەتەوە روودەدا، هەواڵنێر هەواڵێک لە سەرچاوەیەک لە کۆڵان و بازاڕ بڵاو دەکاتەوە کە هیچ پەیوەندی بەراستی و ناوەرۆکی رووداوەکە نییە.

بە کردەوە هەواڵنێر تێدەگات کە رووداوەکان هەمیشە بەم چەشنە نین کە سەرچاوەی دەرفەتی و کەمتەرخەم دەیگێڕێتەوە و دەیهەوێت هەواڵنێریش بەم باوەڕە بگات. ئایا سەرچاوە دەرفەتی ئاگادار بوونەوەی لەم رووداوە هەبووە؟

هێندێک جار کەسانێک زانیارییان کە خۆیان لە شوێنی رووداوەکە نەبوون و هیچیان نەبینیوە. بەتایبەت کاتێک کە سەرچاوە بێبەڵگە زانیاری دەدات.



کەسانێک کە زانیاری ئاوا دەدەن دوور نییە بەرژەوەندییان هەبێت یان مەبەستیان خۆ گەورەکردنەوە بێت. تەنانەت زۆر سەرچاوە دەڵێن: من خۆم دیتم کە ... بەڵام لە راستیدا لە رووداوەکە دوور بووە و تەنیا شتێکی بیستووە، ئەوانیتر خەیاڵاتە. هەواڵنێر زیان لەم زانیارییە دەستکردانە دەبینێ، بەتایبەت کاتێک کە لەسەر بنەمای ئەم چەشنە زانیاریانە، تەواوی رووداوەکە ئامادە بکات.

نموونەیەکی بەرچاو و بە ناوبانگ لەم بارەوە، راگەیاندنی شۆڕشی بۆڵشەڤیکی رووسیا لە میدیاکانی ئەو کاتی رۆژئاواییە دوو ساڵ پاش شۆڕش بوو. ئەو کات هەواڵنێرانی رۆژئاوایی ریگایان پێنەدەدرا بچنە روسیا و ئەوانیش ناچار لە شاری "ریگا"وە کە لە ٣ میلی "پێتروگراد" (ناوەندی دەسەڵاتی بۆڵشەڤیکەکان) هەڵکەوتبوو، هەوڵی وەدەستهێنانی هەواڵیان دەدا.

تەواوی هەواڵە بڵاوکراوەکان ئاڵۆز، ناروون و سووکایەتی کردن بوو بە بۆڵشەڤیکەکان دواتر روون بووەوە کە سەرچاوەی هەموو هەواڵەکان جەنەڕاڵێکی خانەنشینی سوپای رووسیای تزاری بوو کە دوژمنایەتی لەگەڵ شۆڕش هەبوو، تەنانەت ئەو هەواڵانەی بە میدیاکانیش دەفرۆشت و هەواڵەکان بە سەر دێڕی: ئاگامان لێ بوو کە ... بڵاو دەبوونەوە، کە هیچ کامیان راست نەبوون.

ئەو هەواڵە گرنگ، بەڵام ئاڵۆزانەی کە لە "ریگا"وە دەگەیشتن، لە لایەن "واڵتر لیپمەن" و "چارلز مێرتێز"ەوە کۆکرانەوە و وەک لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بە شۆڕشی رووسیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٧-١٩١٩ لەچاپدران.

دوو رۆژنامەوان لەسەر بنەمای ئەم هەواڵانە پێشبینییان کرد کە:

دەسەڵاتی کۆمۆنیستی لە ئاستی روخاندایە(٩١ جار)، لینین و تروتسکی (وەزیری کاتی دەرەوە) لەم رۆژانەدا لە مۆسکۆ هەڵدێن(٣ جار)، لینین و تروتسکی دەست لەکار دەکێشنەوە(٤ جار)، لینێن زیندانی کرا(١ جار)، لینین مرد(١ جار)!

رۆژنامەی "تایمز" لەو کاتە و لە ماوەیەکی کورتدا سەبارەت بە سوپای سپی رووسیا (بەرهەڵستکارانی شۆڕش) سێ مانژیتی لاپەڕەی یەکەمی بەم شێوەیە دارشتبوو (کە بێگومان لە هەمان سەرچاوە وەرگیرابوو):

١- سوپای دژی سوورەکان ئێستا لە "پتروگراد" (١٨ ئوکتوبەر)ە.

٢- سوپای سپی لە دەوروبەری "پتروگراد" (٢٠ ئوکتوبەر)ە.

٣- دژی سوورەکان ئامادەی جێهێشتنی "پتروگراد"ن (٢٤ ئوکتوبەر)

● تا رادەی پێویست سووربن بۆ وەرگرتنی بەڵگەنامە

سەبارەت بە رووداوە کتوپڕەکان، بۆ هەواڵنێر هەمیشە دژوارە بە خێرایی هەست بە راستیی ئەو رووداوانە بکات، بەتایبەتی لە رێگای وتەکانی سەرچاوەوە. ئەوە دەبێتە هۆی دووربین بارهێنانی هەواڵنێر بۆ خێرا قەبووڵنەکردنی وتەکان. باشترە هەواڵنێر داوای بەڵگە بکات، بەلانی کەم کۆپی یان مەودای وێنە گرتن لە بەڵگەکە بخوازێت، یان هەر نەبێت، یەک جار بتوانێت بەڵگەکە ببینێت و لای سەرچاوەکە بیخوێنێتەوە. ئەگەر هیچکام لەمانە دەستی نەدا، ئیتر باوەڕ کردن بە وتەکانی سەرچاوە مانای نییە.

ئەگەر سەبارەت بە زانیارییەکانی سەرچاوەیەک دووچاری گومان هاتن، بۆ دڵنیا بوون لەدوای سەرچاوەیتر بگەڕێن، بەتایبەت کاتێک رووداوێکی گرنگ و بەردەوام بگەڕێتەوە سەر گەورە بەرپرسان، هەواڵنێر ناچار دەبێت لە ٢-٣ سەرچاوەیتر لیکۆڵینەوە بکات.

● رۆژنامەوان نابێت فریوی ئەو وتەیە بخوات کە: ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێت، دەبێتە شاکار!

لە بارەی هەواڵی دادگاکان یان هێندێک لایەنی ئاڵۆزاوی، هەواڵنێر دەبێت لە شایەتی دڵخواز کەڵک وەربگرێت، نە ئەوانەی کە لە دادگادا شایەتی دەدەن. رووداوەکانیش زۆر بە وردی و بە تەواوی وەربگیرێت. هەڵەیە ئەگەر هەواڵنێر خۆی دڵنیا بکات کە: دەبێت رووداوەکە هەر ئاوا بووبێت"، یان لەمەش خراپتر: "هەواڵنێرانیتریش هەر بەم شێوەیە بڵاویان کردووەتەوە، کەوابوو راستە!"



لە پاییزی ساڵی ١٩٨٩ لە چیکوسلۆڤاکیا و لە کاتی رووداوەکانی ناسراو بە "بەهاری پراگ"دا، ژنێکی لاو بە هەواڵنێرانی راگەیاند کە سەرباز و هێزەکانی ئاسایش، خوێندکارێکیان بە ناوی "شمید" تا رادەی کوشتن خستووەتە بەر لێدان.

هەواڵەکە لە میدیاکانی ئەم وڵاتەشدا بڵاوکرایەوە، خەڵک سەردانی ئەم شوێنەیان دەکرد کە "شمید"ی لێ کوژرابوو و خێرا پەیکەری مرۆڤێکیان دروستکرد. ئەم شوێنە بووبە ناوەندی زیارەتی ئازادیخوازان.

ئاژانسی "رویتێرز" هەواڵەکەی بڵاو کردەوە و هەواڵنێریی فەرەنسا، هەواڵی کوشتنی سێ لاوی راگەیاند. ئاژانسی هەواڵنێری "ئاسۆشیێتێتپریس" کە ئەم هەواڵەی لەدەست دەرچوو، رەخنەی لە نوێنەرایەتی خۆی لە پراگ گرت و داوای پڕکردنەوەی ئەم کەمتەرخەمییەی کرد.

"ئاندرە هیما" هەواڵنێری "ئاسۆشیێتێتپریس" لە پراگ، لەگەڵ هاوسەرەکەی سەردانی تەواوی خەستەخانەکان، گۆڕستانەکان، ناوەندەکانی پۆلیسی کرد بۆ دۆزینەوەی "شمیدی لاو"، بەڵام چی دەست نەکەوت. چەند رۆژ دواتر ئاژانسە هەواڵییەکان ناچار بوون ئاشکرای بکەن کە لاوێک بەناوی "شمید" و رووداوی مەرگی، داستانێکی سازکراوە و رووداوێکی لەم چەشنە رووی نەداوە.

هەرچەندە سەرچاوە دەمارگیرتر و هەستدارتر بێت، گوماناوییترە.

جاری وا هەیە کە سەرچاوە درۆ و زیادەڕەوی ناکات،(ئەم دوو لایەنە لەبیرمەکەن)، بەڵام کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ گێڕانەوەی رووداوەکان، خەڵکی بەگشتی لە گێڕانەوەی رووداوەکان وردبین نین، بەتایبەت ئەگەر کێشەیەک بەهەست و جۆشەوە بگێڕنەوە. لەم چەشنە سەرچاوانە دەبێت زۆر بەوردی پرسیار بکرێت. ئەوانە زۆرجار باسەکان بە هەست و رای خۆیان هەڵدەسەنگێنن و ئەم بەشە لە راستی زانیارییەکان کە لەگەڵ بۆچوون و هەستی تاکەکەسییان یەک نەگرێتەوە، چاوپۆشی لێدەکەن یان بە شێوەی دڵخواز دەیگێڕنەوە. هەواڵنیرێکی هۆشیار لەم لایەنەی سەرچاوە دەتوانێ کەڵکی پێویست وەربگرێت.

بۆ هەواڵ یان گوزارشە بەردەوامەکان، کۆکردنەوەی را و بۆچوونەکانی چەند سەرچاوە، بابەتەکە دەوڵەمەندتر دەکات.

"دانیال مارسێلین"، رۆژنامەوانی ئەمریکی دەڵێت: " ئەو کاتە هەواڵنێر لە بناوانی کێشەیەک نزیک دەبێتەوە، کە ژمارەی کەسانی دژبەر و لایەنگری راستی کێشەکە، بەرانبەر بێت."

- وتەی سەرچاوەی بێناونیشان، جێگای باوەڕ نییە.

راستە کە چاوپۆشی ناکرێت لە زانیاری و رای سەرچاوە و شایەتی نەناسراو، بەڵام هەڵەیە ئەگەر هەواڵنێر بنەمای هەواڵ لەسەر ئەم زانیارییانە دابنێت و تەنیا بەیارمەتی ئەم سەرچاوانە هەواڵ یان گوزارش ئامادە بکات. بەلانی کەم ئەم سەرچاوەیە دەتوانێت بۆ دەستپێکی تۆژینەوە سوودمەند بێت، تەنانەت لەم کاتەشدا پێویستە سەرچاوە، ناسراو بێت. ئەگەر هاتوو هەواڵەکە لەچاپدرا و کێشەی ساز کرد و ئاشکرا بوو کە راست نییە، هەواڵنێر لە کێ داوای روونکردنەوە بکات؟ کێ لە دادگا وەڵامدەرە؟

هەمیشە رۆژنامە بەناوبانگەکان تووشی خەڵکانی بێناو و نیشان دەبن کە گوایە سەبارەت بە گەندەڵی، بێئەخلاقی و پێشینەی ناپەسەندی کەسایەتییە سیاسی و بەناوبانگەکان(یان خزم و کەس و کاریان) زانیاریان هەیە و داوای پارە دەکەن و زۆربەیان داوا دەکەن ناویان ئاشکرا نەبێت یان تەنانەت ئامادەن بەڵگەی پێویست وەک دەنگ و وێنە و فیلم پێشکەشبکەن.

ئەگەرچی ئەم زانیارییانە دەتوانن راست بن، بەڵام هەرگیز بە بێ پشتراستکرنەوەی سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو ئەم زانیارییانە بڵاو مەکەنەوە.

هێندێک جار هەیە هەواڵنێر بەم شێوەیە دەبێتە قوربانی تۆڵەسەندنەوە و دەکەوێتە داوێکی ترسناک کە خۆی و رۆژنامەکەشی تووشی گێرەوکێشەی نادیار دەکات.

**مل مەدەن بۆ کڕینی زانیاری**

"ئاسایی بڵێین لە بەرامبە زانیارییدا پارە مەدە، بەڵام زۆر دژوارە بە هەواڵنێر بڵێین کە چاوبپۆشی لە دانی پارە بە بەرپرسێک کە ئامادەی هاوکارییە."

باشترە هەواڵنێر دوور بێت لەم کێشەیە.



کێشەی کڕینی زانیاری دوو کاردانەوەی نەرێنی (نێگەتیڤی) هەیە:

١- بەم کارە فرۆشتنی زانیاری دەبێتە باو و بازاڕ پەیدا دەکات و دەگاتە هەموو شوێنێک. سەرەنجام لە هەموو بوارە چاوەڕوان نەکراوەکاندا، هەواڵنێر دەبێت پارە بدات. تا چەند ساڵ لەمەوبەر لە ئوروپا بەدەگمەن سەرچاوەکان بۆ زانییارییەکانیان داوای پارەیان لە هەواڵنێران دەکرد. بەڵام ئێستا، بەتایبەت لە رادیۆ و تەلەڤزیۆن بۆ ئامادەکردنی گوزارشە گرنگەکان، لە هەر کەس پرسیار بکەن داوای پارە دەکات، تەنانەت ئەو کەسانەی بە هەڵکەوت ئاگاداری رووداوێک دەبنەوە.

لە هێندێک لە وڵاتان وەک ژاپۆن و بەریتانیا، ئەم کێشەیە دژوارییەکی گەورەی بۆ کاری میدیاکان پێکهێناوە. رووداوێک دەقەومێ، یەکەم هەواڵنێر کە دەگاتە شوێنی رووداوەکە دەکەوێتە چەنە لێدان لەگەڵ شایەتەکان بۆ کڕینی مۆنۆپۆلانەی زانیارییەکان تا شایەتەکان تەنیا بەوی بفرۆشن. دیارە ئەم شێوەیە رێگا بە ئاڵوگۆڕی ئازادانە و ئاسایی زانیاری دەگرێت. هەروەها پێش بە شایەتەکان دەگرێت تا زانیارییەکانیان بێدەردەسەر بگاتە میدیاکانیتر و بەم چەشنە ئەم سەرچاوانە کە روون نییە چەندە ئاگاداری رووداوەکەن، دەبنە "سەرچاوەی ئاگادار و تایبەتی". درێژەی ئەم شێوازە ناڕاستە دەگاتە رادەیەک کە میدیاکان بۆ هەر رووداوێک چەند شایەتێکی تایبەتی دەدۆزنەوە و بەردەوام بەهای "گرێبەستەکان"یش زیاتر دەبێت.

٢- دانی پارە لەبەرامبەر زانیاریدا دەبێتە هۆی درۆ و دەلەسە کردنی زۆرتری "سەرچاوە ئاگادار و تایبەتەکان" بۆ وەدەستهێنانی "گرێبەستی" باشتر و پارەی زۆرتر. ئەم کێشەیە لەبواری رووداوە تایبەتەکان بە کەسایەتییە ناودارەکان و سیاسەتوانانیدا زۆرتر بەرچاوە. چەند ساڵ لەمەوبەر هونەرمەندێکی پلە دووهەم لە بەرامبەر پارەدا هێندێک بابەتی سەبارەت بە گۆرانیبێژی ئینگلیز "ئێڵتون جۆنز" فرۆشت بە رۆژنامەی بەناوبانگی "سان" کە لە ژمارە ٢٥ فوریەی ١٩٨٧دا لەچاپدرا. بەڵام هیچ راستی تێدا نەبوو و رۆژنامەی سان لە دادگادا کێشەکەی دۆڕاند و ناچار بە دانی یەک میلیۆن پاوند سزا درا.

### هەواڵنێر دەبێت لە کڕینی شریتی دەنگ و ڕەنگ خۆبپارێزێت

لە بەریتانیا ئەم کێشەیە زۆر گرنگە. لەم وڵاتە لەبەرامبەر شریتی دەنگ و ڕەنگ، هەواڵنێران پارەی زۆر دەدەن. بۆ نموونە ڕۆژنامەی "سان" لە ماوەی ساڵێکدا بە پێشنیاری هەواڵنێرە بەردەوام یان ئازادەکانی، یەک ملیۆن پاوندی بۆ کڕینی ئەم شریتانە خەرجکرد.

یەکێک لە فرۆشیارانی ئەم شریتانە کە "پسپۆڕە" لە سازکردنی فیلم و دەستکاری کردنی و بە ناونیشانی جیاوز کار دەکات، فیلمێکی ساختەی سەبارەت باڵوێزی وڵاتەکان لە "هیمالایا" کە مادە سڕکەرەکان بەکار دێنن و پێوەندیان لەگەڵ ژنانی خۆفروش هەیە، بە ڕۆژنامەی Peopel فرۆشت. هەروەها فیلمێکی ساختەی سەبارەت بە "گورباچوڤ" بە ڕۆژنامەیەکیتر فرۆشت کە گۆیا دەستی لەکار کێشاوەتەوە (دوو ساڵ پێش دەست لە کار کێشانەوەی) و بوو بە هۆی زیانێکی ملیۆنی لە بازاڕی بوورسەی لەندن. هەروەها سوور بوو لەسەر زیندوو بوونی "مارتین بۆرمان" فاشیستی بەناوبانگی هاوکاری هیتلەر، یان شریتی ساختەی لە وتوویژی "پرینس چاڕلز" و هاوسەری پێشووی، "دایانا" (کە دواتر لە ڕووداوێکی ئاڵۆزدا کوژرا)، بە ١٨ هەزار پاوند بە میدیاکانی فرۆشت. دواتر وتوویژێکی تەلەفۆنی ساختەی ئامادە کرد کە گۆیا بەرپرسێکی ئاسایشی وڵات سەبارەت بە کۆشکی شاژنی بریتانیا دەدوێ، کە توانی بە ٧٥ هەزار پاوند بە ڕۆژنامەی Peopelی بفرۆشێت، هاوکاتیش هەمان شریتی بە ڕۆژنامەکانیتریش فرۆشت.

### وردبینی لە سەر لایەنیتری ڕووداوەکان

هەواڵنێر لەپاڵ لێکۆڵینەوە و بەدواچووندا، پێویستە سەبارەت بە خەڵک ویژدانی هەبێت. هەواڵنێر نابێت کەسانی تاوانبارکراو یان گۆمانلێکراو بەتاوانبار بزانێت. پێویستە مەودای بەرگری لەخۆیان پێبدرێ. هێندێک جار پێویست ناکات چەند ساتێک پێش بەستنی لاپەڕەکان و سەبارەت بەم کەسانە بابەت بڵاو بێتەوە. هەواڵنێر پاش هێندێک لێکۆڵینەوە، ڕەنگە بە لایەنی ڕاستی نوێ بگات، بەچەشنێک تەواوی ڕووداوەکە بگۆڕێت. دەستڕاگرتنی وا هەواڵنێر لە کێشەکانی



داهاتوو ڕزگار دەکات. بەتایبەت سەبارەت بە ڕووداوە ئاڵۆز و گرنگەکان پێویست ناکات هەواڵنێر پەلە لە چاپکردنیان بکات. هەڵسەنگاندنی لایەنە ئاڵۆز و نادیارەکانی ڕووداوەکە، باشترە لە پەلە کردن. وانەیەکی زۆر گرنگ لەم بارەوە ئەوەیە کە ئەگەر هەواڵنێر تا ڕادەی دڵنیابوون سەبارەت بە تەواوی ڕووداوەکە زانیاری وەدەست نەهێنابێت، نابێت پەلە بۆ بڵاوکردنەوەی بکات.

### ئالودەی هەستی بەرپرسیایەتی بوون

هێندێک لە "سانسۆر"ی تایبەتی کاتێک پێش دێت کە هەواڵنێر بیر دەکاتەوە، ئەگەر چاپ بێت، چ پێش دێت؟ هەمان هۆی لەمێژینە کە نووسەران هاندەدات بۆ لەچاپ نەدانی کتێبەکانیان.

بەدەگمەن دەتوانین ئاماژە بە بابەتێک بکەین کە هەواڵنێر نابێت هەواڵی سەبارەت بڵاوبکاتەوە.

هێندێک جار لایەنی ڕووداوەکە خوازیاری بڵاوکردنەوە نییە، لە کاتی وادا پێویستە هەواڵنێر ڕاوەستێت. هەواڵنێر بڵاوکەرەوەی زانیارییە، نە ئامرازی پروپاگاندەی فەرمی، مەگەر لە کاتی شەڕدا کە ڕەنگە دوژمن سوود لە زانیارییەکان وەربگرێت.

چوونە ژێرباری خۆخوازانەی لەم شێوەیە، لەمپەرێکە بۆ ئاڵوگۆڕی زانیاری لە کۆمەڵگادا.

### ڕاپۆرتنووسی تایبەت

وەک دەرکەوتووە، ڕۆژنامە ناوچەیی و سەرتاسەرییەکان لەگەڵ هێندێک ڕۆژنامەوان کە تایبەت لە بوارێکدا پسپۆڕن، کار دەکەن. ئەم ڕۆژنامەوانانە تەنیا لە چوارچێوەی بواری خۆیاندا گوزارش ئامادە دەکەن. وەک، هەواڵنێری تاوانکارییەکان، هەواڵنێری پەروەردەیی، یان هەواڵنێرانی شەڕ، سیاسەتی دەرەوە، پێوەندییە نێونەتەوەییەکان، کاروباری خاووخێزان، تەندروستی، ژینگە، هونەر، زانست، دین، کۆمەڵ، میدیاکان، گەیاندن، مۆد، پیشەسازی و ئابووری، وەرزش و بازرگانی.

بۆ رۆژنامەیەک بوونی هەواڵنێرانی بەتوانا و بەئەزموون لە بوارە تایبەتییەکاندا، سەرمایەیەکی مەزنە. هەم رۆژنامە و هەم ئەم رۆژنامەوانانە پێویستە لە هێندێک گیروگرفتی بوارەکە ئاگادار بن.

هەروەها رۆژنامەوانی تایبەت پێویست ناکات خۆی بە نوێنەری ئەم بوارە و ناوەندی تایبەت لە رۆژنامەدا بزانێت، دەنا بۆچوونی هەواڵنێر بۆ بابەتەکان لە روانگەی زانیاریدان بە گوێگرانی نابێت، بەڵکو لە روانگەی بەرژەوەندی ئەو لایەنە و ناوەندەدا دەبێت کە زانیاری سەبارەت بڵاودەکاتەوە. ئەم هەواڵنێرانە پێویستە ئەم لایەن و ناوەندانە بکەنە جێگای سەرنج لە رۆژنامەکەدا، نە رۆژنامە بکێشنە لای ئەم ناوەندانە.

هەواڵنێری تایبەت، پێویستە خۆ لە بڵاوکردنەوی بەرژەوەندی و پێداویستییە تایبەت و نائاساییەکانی ئەم ناوەندانە بپارێزێت. دەنا ئەمە یەکەم هەنگاوە بۆ نوێنەرایەتی کردنی ئەم ناوەندانە. گرنگ ئەوەیە کە هەواڵنێر تەنیا بۆ رەزامەندی و پێخۆشبوونی بەرپرسانی ئەم ناوەندانە، نەنووسێت.

ئەم هەواڵنێرانە نابێت تا ئەو رادەیە لەم ناوەندانە نزیک ببنەوە کە پێش بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە رەخنە سەبارەت بەو هەواڵە بگرێت. ناتوانن بەگشتی بڕواننە ئەگەری بەرژەوەندی تاکەکەسی سەبارەت بە هەواڵنێرانێک کە پێشگیری دەکەن لە بڵاوبوونەوی هەواڵێک لەبارەی ناوەندی خۆیاندا، رەنگە هێندێک جار هەواڵنێر لەبەر وەرگرتنی هەواڵێکی گرنگتر، چەند هەواڵێکی کەمگرنگ بڵاو نەکاتەوە. لێرەدا، پێویستە هەم هەواڵنێر دەست لە مکوڕبوونی خۆی هەڵگرێت و هەم سەرنووسەر تەسلیمی بەڵێنی وەها نەبێت.

لێرەدا ئاماژە بە نموونەیەک دەکەین لەم مەترسیانە کە رەنگە تووشی هەواڵنێر یان رۆژنامە بێتەوە و پێشاندەدات چۆن هەواڵنێر لەڕادە بەدەر ئالوودەی بەرژەوەندی ناوەندێکی تایبەتی دەبێت.

لە بیستەکاندا، "ئالفرد جیک لینگل"، هەواڵنێری رۆژنامەی "شیکاگۆ تریبون" لە بەشی پۆلیسدا، زۆر ئازایانە خەریکی کاری خۆی بوو. ژمارەیەکی زۆر هەواڵی ورد و راستی بە یارمەتی سەرچاوەکانی خۆی لەم بوارەدا سەبارەت



بە گرووپە تاوانکارەکان ئامادە دەکرد کە شوێنێکی تایبەتی لە رۆژنامە و لە ناو خەڵکدا وەدەستهێنابوو.

"لینگل" ناوبانگی دەرکرد و پاشان گوترا کە بە هۆی میراتێکی ٥٠ هەزار دۆلاری باوکییەوە ژیانێکی گونجاو و باشی بۆخۆی رێکخست. کتوپڕ لە رۆژی ٩ی یۆنیۆ ١٩٣٠دا، پرۆسەی هەواڵە ڕاگەیاندراوەکانی پچڕا، لە رۆژی رووناک و لە ویستگەیەکی مێترودا بە دەست پیاوێک لە جلوبەرگی قەشەییدا تەقەی لێکرا و کوژرا. هۆی ئەم کارە خسترا سەر گرووپە تاوانکارەکان و تۆڵە سەندنەوە.

رۆژنامەکەی نووسی:

هۆی کوژران روونە. بە تۆڵەی کۆشش بۆ ئاشکرا کردنی رووداوێکی پیاوکوژی،"لینگل" کوژرا. ئەو هەواڵنێرەی بەشی پۆلیسی ئێمە کە بە هاوکارێکی زانا دەژمێردرا. دۆستانی نزیکی ئەو، فەرمانبەرە پلەبەرزەکانی پۆلیس بوون....ئەم لایەنەی کە بۆ رۆژنامە گرنگ بوو، بوو بە بەڵای گیانی ئەو.

لە رووداوی کوشتاری رۆژی "سەنت والێنتین"دا (رۆژێک کە گانگسترەکان لە هێرشێکدا، ٧ کەس لە دوژمنانی خۆیان کۆشت)، ناوی "لینگل" وەک ئاشکراکەری ناونیشانی بکوژەکان، خرا پاڵ ناوی قوربانییەکان.

رۆژنامە ئاگاداری مەترسییەکان بوو....سەرەنجام دادپەروەری رووی خۆی ئاشکرا دەکات، ئەگەرچی قوربانییەکی زۆری لێبکەوێتەوە.

"شیکاگۆ تریبون" زۆر بەجدی دەستی بە لێکۆڵینەوە لە کوژرانی هاوکاری خۆی کرد و پاداشێکی ٢٥ هەزار دۆلاری بۆ ناساندنی بکوژی "لینگل" تەرخان کرد و رۆژنامەکانی‌تر پشتگیریان کرد. مەیتی "لینگل" زۆر شکودار و بە شێوەیەکی فەرمی لە گۆڕستانی پاڵەوانان نێژرا. دەیان هەزار دانیشتوانی شیکاگۆ سەرەیان بەست بۆ رێزگرتن لە قوربانی راگەیاندن.

پاش ماوەیەک، هێندێک بەڵگەنامە سەبارەت بە هۆکاری کوژرانی "لینگل" بڵاوکرایەوە. ئاشکرابوو کە باوکی پاش مردنی، تەنیا چەند سەد دۆلاری دارایی جیهێشتبوو.

"لینگل" لە کاتی مەرگ، ١٠٠٠ دۆلاری لە گیرفاندا بوو و کەمەربەندێکی نگینداری ئەڵماسی بەستبوو کە خەڵاتی "ئاڵ کاپۆن"، سەردەستەی مەزنترین

گرووپی گانگستری ئەمریکی بوو. هەروەها روون بووەوە کە لە ماوەی ١٨ مانگدا، ٦٠ هەزار دۆلاری لە ژمارەی بانکیدا کۆکردبۆوە. لەگەڵ "ویلیام راسێل"، کەلانتەری بەرزی شیکاگۆ ژمارە بانکی هاوبەشیان هەبوو، کە پاشان بەهۆی گەندەڵی لە کار دوورخرایەوە.

"لینگل" بە "راسێل" کە لە کاتی منداڵییەوە هاورێی بوو، یارمەتی دەدا تا مامەڵەکانی ناوخۆیی پۆلیس لەگەڵ گرووپە تاوانکارەکان لە ناو بیرورای گشتیدا وەک کاری قارەمانانە بڵاوبێتەوە.

ئەو بە میوانی هەمیشەیی "ئاڵ کاپۆن" لە سەرتاسەری ئیمپراتۆری ئەو گانگسترە گەورەیە دەژمێردرا. بەڵام کاتێک گوشاری خستە سەر "ئاڵ کاپۆن" بۆ وەرگرتنی ١٠٠ هەزار دۆلار کە لە قومار لێی بردبۆوە و هەڕەشەشی لێکرد، شێف، کەسێکی لە جلوبەرگی قەشەییدا بۆ کوشتنی نارد.

سێ هەفتە پاش تیرۆری "لینگل"، شیکاگۆ تریبوون ئاشکرایکرد:

ئەمرۆ پێویستە رووخسارێکی تازەی "ئالفرد لینگل" پێشانبدەین، رووخسارێک کە لە کاتی ژیانیدا، بۆ رۆژنامە نەناسراو بوو. ئەو رۆژنامەوانێکی مەزن و شەریف نەبوو. ئەو لایەنی تاوانکارانی گرت و توانی پارەیەکی خەیاڵاوی وەدەست بێنێت، پارەیەک کە لەناوچوونی خۆی لێکەوتەوە.

"فرانک سیناترا" گۆرانیبێژ و هونەرمەندی ئەمریکی رۆژێک بەتوورەییەکی زۆرەوە گوتی:

"هەواڵنێرانی هالیوود، سەرتاسەری رۆژ خەریکی فێڵەبازین و کاتێک شەو داهات، بەرایی درۆکانیان دەستپێدەکات."

## شێوەکانی هەواڵ نووسین (News Styles)

**١- شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو** (Inverted-Pyramid Style)

کارئاماترین و باوترین شێوەی ئامادەکردنی هەواڵ، "هەرەمی بەرئاوەژوو" ناو بێژ کراوە. لەم شێوەیەدا، گرنگترین ناوەرۆکی رووداوەکە لە سەرەتا، بەڵام بابەتە ئاساییەکان لە کۆتایی هەواڵدا، ئاماژەیان پێدەکرێت. لەم شێوەیەدا، بەخوێندنەوەی سەرەتای هەواڵ(بە هۆی کەمی کاتی خوێنەر)، بۆ خوێنەر دەردەکەوێت کە پاشماوەی هەواڵەکە کەڵکی هەیە یان نا؟

لایەنی ئەرێنی ئەم شێوەیە:

ئا) تێگەیشتن لە گرنگترین بەشی هەواڵ لە کەمترین کاتدا(خێرایی گواستنەوەی هەواڵ).

ب) هەواڵ بە لید Lead دەستپێدەکات کە گرنگترین بەشی هەواڵە.

پ) ئاسانی لە دارشتن، مانشێت و رازانەوەی لاپەڕە.

ت) هەواڵ بەپێێ بەهای بابەتەکان رێکوپێک کراوە.

لایەنی نەرێنی ئەم شێوەیە:

ئا) هەواڵ هەرگیز تەواو نییە، چونکە بەشەگرنگەکان هەڵبژێردراون.

ب) زەوقی هەواڵنێر کاردانەوەیەکی زۆری هەیە لە هەڵبژاردنی بەشە گرنگەکانی هەواڵ،

پ) رێچکەی کات لە هەواڵەکەدا دەپچرێنرێت،

ت) خوێنەر پاش خوێندنەوەی لید، درێژە بەخوێندنەوەی هەواڵەکە نادات،



ج) هێندێک جار لید لە درێژەی هەواڵەکەدا دووپات دەبێتەوە.

سەبارەت بە رێچکەی بابەتەکان لەم شێوە هەواڵنووسینەدا، پێویستە بەپێی ژمارەی بابەتەکانی هەواڵ، روونکردنەوەمان هەبێت.

● شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو بۆ هەواڵە یەک بابەتییەکان:

لە برگەی یەکەمدا لید دەنووسرێت.

لە برگەی‌تردا، لید پتر شی‌دەکەینەوە.

بەم شێوەیە، بۆ هەر برگەیەکی‌تر بە پێی گرنگایەتی، بابەتەکانی هەواڵەکە روونەدەکەینەوە تا هەواڵەکە تەواو دەبێت، کۆتایی هەواڵ زۆر گرنگ نییە و تەنیا تەواوکەری هەواڵەکەیە.

● شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو بۆ هەواڵە چەند بابەتییەکان:

سەرەتا، گرنگترین بەشی هەواڵ دیاریدەکەین و لە لیددا ئاماژەی پێدەکەین، پاشان لە یەک یان دوو برگەدا بەشی یەکەمی هەواڵ تەواو دەکەین و پاشان بەشی دووهەم و بەم شێوازە لە برگەکانی‌تردا و لە کۆتاییدا، بەشی سێهەم دەنووسین و برگە کۆتاییەکان، تەواوکەرەوەی هەواڵەکە دەبن. واتە، ئەگەر بەشی A لە بەشی B گرنگتر بێت، بە برگەکانی A2,A1 و ... پێش بەشیB ئاماژەی پێدەکەین.

تێبینی: بە هۆی ئاسانی گواستنەوەی هەواڵ بۆ خوێنەر، شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو گرنگترین و باشترین شێوەی هەواڵ نووسینە.

نموونەی شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو:

لید: بانکوک (تایلەندا) - رویتێرز: یەکێک لە سەرنشینانی فرۆکەی هێڵی ئاسمانی بولگاریا لە هێڵی تایلەندا - ڤێتنام لە ئاسمانی ڤێتنامدا، لەرێگای پەرەشوتەوە خۆی فرێدایە خوارەوە.

بە وتەی بەرپرسانی هێڵی ئاسمانی بولگارستان، کاتێک فرۆکەی Airbas 300ی هێڵی ئاسمانی G.S.S، لە بانکوک بۆ شاری "هۆشی‌مینە"ی ڤیەتنام دەفری، یەکێک لە سەرنشینەکانی، بەزۆر خزمەتکاری فرۆکەکەی ناچار کرد کە یەکێک لە دەرگاکان بکاتەوە. بەرپرسێکی هێڵی ئاسمانی بولگارستان گوتی: گەشتکەری ناوبراو کە وێدەچێ هاووڵاتی ڤیەتنام بێت، وێرای

بڵاوکردنەوەی نووسراوێک، لە ڕێگای پەرەشوتەوە لەسەر خاکی ڤیەتنام خۆی لە فڕۆکەکە فڕێدا دەرەوە. بەرپرسانی هێڵی ئاسمانی بولگاریا گوتیان کە لەم ڕووداوەدا زیان بەکەس نەگەیشتووە.

نموونەیەکی‌تر:

لید: تاران - هەواڵنێری کۆماری ئیسلامی: بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران و بۆ زیادکردنی سەرمایەگوزاری لە کەرتی "یارمەتییەکان"دا و بەهێزکردن و هاندانی فەرمانبەران بۆ بەشداری لەم بەشەدا، مانگانە ٣ هەزار ریاڵ لە مووچەی فەرمانبەران کەم دەکرێتەوە و دەچێتە هەژماری یارمەتییەکان.

بڕگەی ٢: ئەم بڕیارە لە کۆبوونەوەی مانگانەی ئەنجومەنی جێگرانی وەزارەتەکان و بە سەرۆکایەتی جێگری سەرکۆمار، دوێنێ لیکۆڵینەوەی لێکرا و بڕیار درا بڕیارنامەیەک لەم بارەوە لە لایەن "وەزارتی هاوبەشایەتی"ەوە ئامادە بکرێت.

بڕگەی ٣- بە پێی ئەم بڕیارە، پاش وەرگرتنی بەڵێنی فەرمانبەران، مانگانە بڕی ٣ هەزار ریاڵ لە بڕی یارمەتی خێزانداری یاسای X، کەم دەکرێتەوە و دەخرێتە سەر حیسابی "یەکێتی هاوبەشایەتی شتومەکی فەرمانبەرانی دەوڵەت" و کۆمپانیاکانی هاوبەشایەتی فەرمانگەی پێویست.

بڕگەی ٤- بەم شێوەیە بە زیادبوونی سەرمایە و دارایی کۆمپانیاکانی بەشی "هاوبەشایەتی"، دەرفەتی سەرمایەگوزاری فەرمانبەران لە بوارەکانی بەرهەمهێنان لە کەرتی "هاوبەشایەتی"دا دەرەخسێت.

**٢- شێوەی مێژوویی:** (Chronologicaly Style)

لەم شێوەیەدا بابەتەکان بەپێی کاتی ڕوودانیان، ڕێکوپێک دەکرێن.

بە لەپێشچاوگرتنی پێویستی ڕاگەیاندنی خێرا بۆ لاپەڕەکانی هەواڵی ڕۆژ، ئامادەکردنی هەواڵ بە شێوەی هەرەمی بەراوەژوو ڕێکدەخەین. بەڵام، لە لاپەڕەکانی گوزارشی لێکۆڵینەوە و بەڵگەنامەکاندا، دەکرێت لە شێوەی مێژوویی کەڵک وەرگرین.

شێوەی مێژوویی بە پیشەکییەوە:



لەم چەشنە هەواڵ نووسینەدا، سەرەتا بە پیشەکی دەستپێدەکات کە هیچ پێوەندییەکی بە "لید"ەوە نییە، چونکە ئەم پیشەکییە تەنیا بۆ دەسپێکی هەواڵەکەیە و هەواڵ لەخۆ ناگرێت.

نموونە:

تاران- هەواڵنێری کۆماری ئیسلامی: کۆبوونەوەی ئەنجومەنی جێگرانی وەزارەتەکان بە سەرۆکایەتی جێگری سەرکۆمار بۆ بەدواچوونەوەی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران سەبارەت بە کەرتی "هاوبەشایەتی" پێکهات.

بە پێی ڕاپۆرتی ناوەندی زانیاری گشتی ڕێکخراوی کاروباری فەرمانگەکان و فەرمانبەرانی وڵات، کۆبوونەوەی مانگانەی ئەنجوومەنی جێگرانی فەرمانگەیی و دارایی وەزارەتەکان و ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان، سەرلەبەیانی ئەمڕۆ بە سەرۆکایەتی (ناو و پاشناو)، جێگری سەرکۆمار و سکرتێری گشتی ڕێکخراوی کاروباری فەرمانگەکان و فەرمانبەران و بەشداری (ناو و پاشناو)، وەزیری "هاوبەشایەتی" لە شوێنی کۆنفرانسەکانی ئەم ڕێکخراوەیە پێکهات. لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری پێشووی ئەنجوومەنی وەزیران سەبارەت بە فراوانکردن و بەهێزکردنی هاوبەشایەتییەکانی شتومەکی فەرمانبەرانی دەوڵەت و زیادکردنی سەرمایەگوزاری لە کەرتی هاوبەشایەتیدا بە راکێشانی بەشداری فەرمانبەرانی دەوڵەت لەسەر بنەمای بڕی مانگانەی ٣ هەزار ریاڵ پارەی یارمەتی دەوڵەتی بۆ خێزانداران، بابەتی بڕگەی ٩ یاسای X لە مووچەی فەرمانبەران، هاتە بەر باس ولێکۆڵینەوە و بڕیاردرا بۆ جێبەجێی کردنی پەسەندکراوی سەروو، دەزگاکانی جێبەجێکەری دەوڵەتی هەموو مانگێک بە رەزامەندی فەرمانبەران، بڕی ئاماژەپێکراو بچێتە حیسابی "یەکێتی هاوبەشایەتی شتومەکی فەرمانبەرانی دەوڵەت" بۆ کۆمپانیاکانی هاوبەشایەتی دەزگای پێوەندیدار.

بەم شێوەیە بەزیادبوونی سەرمایە و بەهێزبوونی دارایی کۆمپانیاکانی هاوبەشایەتی، دەرفەتی سەرمایەگوزاری فەرمانبەرانی دەوڵەت لە بواری بەرهەمهێنان و لە ڕێگای کۆمپانیاکانی هاوبەشایەتیدا، دەرەخسێت.

هەروەها بریاردرا لەم بارەوە وزیری هاوبەشایەتی و جێگری سەرکۆمار بریارنامەیەکی هاوبەش بۆ دەزگاکانی دەوڵەتی دەربکەن.

**٣- شێوەی مێژوویی بە "لید"ەوە:** (Chronologicaly Style with Lead)

لەم شێوەیەدا کەڵک لە لید وەردەگرین کە تێکەڵاوێکە لە شێوەی مێژوویی و هەرەمی بەرئاوەژو. لە دەستپێکدا هەمیشە ئاماژە بە هەواڵێک دەکەین کە گرنگترین بەشی بابەتەکە دەگرێتەخۆ، پاشان رووداوەکان بە پێی رێسکەی کاتی روودانیان ئاماژەیان پێدەکەین.

ئەم شێوەیە زۆرتر بۆ راپۆرت لە کارەساتەکان بەکاردێت، هەڵبەت بۆ هێندێک هەواڵە کۆمەڵایەتییەکان و راپۆرتی هێندێک لە کۆبوونەوەکان یارمەتی لەم شێوەیە وەردەگرێن.

نموونە بۆ شێوەی مێژوویی بە "لید"ەوە:

لید: بکوژی قاڵیفرۆشە ٢٥ ساڵە ئێرانییەکەی دانیشتووی کانزاس سیتی (ئەمریکا)، بە زیندانی هەمیشەیی سزا درا.

دەقی رووداوەکە: "فیلیپ مەکوێی" لە مانگی مارسی ١٩٨٩ لەگەڵ دوو لاوی ئەمریکی لە یەکێک لە ئوتوبانەکانی کانزاس سیتی رێگا بە ئۆتۆمبێلی "حامید رەزیزادە"، قاڵیفرۆشی ئێرانی و دایکی دەگرن و پاش تەقە کردن، حامید دەکوژن و دایکی بریندار دەکەن. بکوژەکان پاش دزینی پارەی کوژراوەکە، شوێنی رووداوەکە جێدێڵن.

پۆلیسی ئەم شارە، پاش رێنموونییەکانی دایکی "رەزی زادە"، "فیلیپ مەکوێی" دەستگیر دەکەن.

لە سەرەتا "فیلیپ مەکوێی" حاشا لە کوشتنی "رەزیزادە" دەکات، بەڵام دواتر ئاشکرای دەکات کە بۆ دزینی پارەی ئەو، رێگای بە ئۆتۆمبێلەکەی گرتووە و قاڵیفرۆشی ئێرانی کوشتووە.

رۆژنامەکانی کانزاس سیتی رایانگەیاند کە "دەستەی راوێژکاری داد"ی دادگا، لە مانگی مارسی رابردوودا، "فیلیپ مەکوێی" ٢٨ ساڵەی بە هۆی "کوشتنی بە ئەنقەست"، تاوانبار زانی و دادگای ناوچەی "جانسون" سەر بە ویلایەتی کانزاس سیتی، هەفتەی پێشوو، ئەوی بە زیندانی هەتاهەتایی سزادا.



لە شێوەی مێژووییدا بەکردەوە، بابەت گۆرانی بەسەردا نایەت و بە پێی رێسکەی کاتی رووداوەکان، ئاماژەی پێدەکرێت و پیشەکییەکی بۆ ئامادە دەکرێت. کەوابوو، هەواڵ بەتەواوی و بەبێ بۆچوونەکانی هەواڵنێر دەنووسرێت. ئەمە تەنیا لایەنی باشی شێوەی مێژوویی بە "لید"ەوە.

لە کەمایەسییەکانی ئەم شێوەیە، پێشەکییەکەیەتی کە گرنگترین بەشی هەواڵەکە لە سەرەتادا دێت، درێژ و کات برە، هەروەها دەستەبەندی و رێسکە کردنی دژوارترە لە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو.

**٤- شێوەی گەرانەوە بۆ رابردوو:**

لەم شێوەیەدا، سەرەتا لید دەنووسرێت و پاشان لید روون دەکرێتەوە و دواتر پێشینەی هەواڵەکە دێت.

**٥- شێوەی "کۆتایی سەرسورهێنەر":**

لەم شێوەیەدا، خوێنەر لەچاوەروانیدا رادەگیرێت و بۆ گوێگر پرسیار ساز دەبێت بێ ئەوەی وەڵام بدرێتەوە.

لەم شێوەیەدا، لە لیدی نائاسایی و پرسیاری، کەڵک وەردەگیرێت و پەیکەری هەواڵەکە بە شێوەی مێژوویی دەبێت. زۆرتر بۆ هەواڵە کۆمەڵایەتییەکان و کارەساتەکان بەکار دێت.

**٦- شێوەی بازنەیی:**

لەم شێوەیەدا، هەواڵ لە شوێنێک دەستپێدەکات و پاش گێرانەوەی رووداوەکە، دیسان دەگەرێتەوە هەمان شوێن، لە دوای هۆکارەکان دەگەرێت و ئەنجامەکان باس دەکات. ئەم شێوەیە زۆرتر بۆ هەواڵە کۆمەڵایەتییەکان و کارەساتەکان بەکار دێت.

**چەند تێبینییەک بۆ ئامادەکردنی پەیکەری هەواڵ:**

● پێویستە پەیکەری هەواڵ یەکپارچە بێت، دەتوانین بە دووپات کردنەوەی بابەتی سەرەکی (لە شوێنی گونجاو) و کەڵک وەرگرتن لە وشەکانی پەیوەندی، ئەم هەماهەنگی و یەکپارچەییە پێکبێنین.

● پێویستە، کاتی رووداوەکان لە هەواڵدا، بە چەشنی رێکەوت، یان بەهەڵسەنگاندنی کاتی "ئێستا" (دوێنێ، شەممەی رابردوو،....) بەکار بێنین،

ئاماژە بە سەرچاوە بکرێت، ئەگەر یەک سەرچاوە، لە سەرەتای هەواڵ و ئەگەر چەند سەرچاوەمان هەبێت، پێویستە بە پێی ڕێچکەی گرنگێتی بابەتەکان، لە سەرەتای هەر یەک لەم بابەتانە ئاماژەی پێبکرێت.

● لە کاتی گێڕانەوە لە زمانی کەسەکان، پێویستە بە ناو و پاشناو و پلەوپایە، یان پێوەندیان لەگەڵ ڕووداوەکە (وەک: "یەکێک لە بینەرانی ڕووداوەکە) ئاماژە بکرێت.

● بەکار هێنانی کرداری ئاشکرا گونجاوترە لە کرداری ون، مەگەر بکەر گرنگییەکی تایبەتی نەبێت، یان بە هۆیەک چاوپۆشی لێبکرێت.

وەک:

دوکانەکان داخران. (هەڵەیە)

دوکانەکان لە لایەن فەرمانبەرانی شارەوانی داخران. (ڕاستە)

دەوڵەتی پۆڵەندا پاش خۆپێشاندانەکانی کرێکاران، حکوومەتی سەربازی ڕاگەیاند.

لە پاش خۆپێشاندانەکانی کرێکاران، لە پۆلاندا حکوومەتی سەربازی ڕاگەیەندرا. (ئەم دێڕەش ڕاستە، بەڵام بە هۆی بەکار هێنانی وشەی لکێنەدراوی "لە" لە سەرەتای هەواڵەکە، شێوەی یەکەم گونجاوترە.)

● لە بەکار هێنانی وشەی زیادی لە هەواڵدا، خۆبپارێزن.

وەک:

ئەو لە درێژەی وتەکانیدا گوتی: (هەڵەیە)

ئەو لەدرێژەدا گوتی: (ڕاستە)

● لە هەواڵ نووسیندا کاتی بەکار هێنانی ئاواڵناو، پێویستە لە ئاواڵناوی هەڵسەنگاندن و دروشم خۆبپارێزین.

لە جێگای: وتوویژێکی گرنگ لە نێوان وەزیرانی دەرەوەی عیراق و ئێراندا ئەنجامدرا.

پێویستە بنووسرێت: وەزیری دەرەوەی عێراق گوتی: وتوویژێکی گرنگ لە نێوان عێراق و ئێراندا ئەنجامدرا.



لەم نموونەیەدا، بۆچوونی سەرچاوە لە شوێنی بۆچوونی هەواڵنێر داندراوە کە بەپێی شێوازی هەواڵ نووسین گونجاوترە، هەڵبەت لە شرۆڤە نووسیندا بەکار هێنانی ڕەوایە و هێندێکجار پێویستە.

**هەندێک تێبینی سەبارەت بە ئامادەکردنی هەواڵە جۆراجۆرەکان**

ڕاگەیاندراو(نووسراوە)، ئاگاداری، بەیاننامە، پەیام (لێدوان) و بڵاوکراوەکان، ئەگەر گرنگی تایبەتیان هەبێت، پێویستە بە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو ئامادە بکرێن. لەجێگای بڵاوکردنەوەی تەواوی ئەم ڕاگەیاندراو و ئاگاداری و ... ، لایەنە گرنگەکانی کە تەواوکەری پێکهاتە هەواڵییەکانە لەگەڵ پێشینەی پێویست، ئامادە بکرێن.

نموونە:

ئاگاداری

بۆ تەواوی مامۆستایان و فەرمانبەرانی سەر بە وەزارەتی پەروەردە

بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە دامەزراندنی "سیستەمی بیمەی دەرمانی" بۆ مامۆستایان و فەرمانبەرانی سەر بەم وەزارەتە، لە هەموو هاوکارانمان کە خوازیاری بەهرەمەندین لەم سیستەمەدا، داو دەکەین ئامادەیی خۆیان بە شێوەی نووسراوە تا کۆتایی مانگی سیپتەمبەر بە بەڕێوبەرایەتییە گشتییەکانی وەزارەتی پەروەردە لە پارێزگاکانی هەولێر، سلێمانی و دهۆک ڕابگەیەنن.

بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی پەروەردە

● ئامادەکردن بە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو:

وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، دوایین دەرفەتی بەشداربوونی مامۆستایان و فەرمانبەرانی سەر بەم وەزارەتە بۆ بەشداربوون لە "سیستەمی بیمەی دەرمانی" ڕاگەیاند.

بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی پەروەردە بە بڵاوکردنەوەی ئاگادارییەک ڕایگەیاند: ئەو مامۆستا و فەرمانبەرانەی کە خوازیاری بەهرەمەندی لە خزمەتگوزارییەکانی سیستەمی بیمەی دەرمانن، پێویستە تا کۆتایی مانگی

سیپتەمبەر، داخوازییەکەیان بە نووسراوە پێشکێشی بەڕێوەبەرییە گشتییەکانی وەزارەتی پەروەردە لە پارێزگاکانی هەولێر، سلیمانی و دهۆک بکەن.

هێندێک جار بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتانە، لە شێوەی مێژوویی بە "لید"ەوە کەڵک وەردەگرین، هەڵبەت لەکاتێکدا کە ئەم بڵاوکراوانە گرنگی تایبەتی و سەرنجراکێشیان هەبێت.

ئەو بڵاوکراوانەی کە خشتە، رێژە و ئامار لەخۆ دەگرن، پێویستە بەپێی نمودار و خشتە و ئامارەکان، بە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو ئامادە بکرێت. لەم هەواڵانەدا باشترە لە سەرەتا بە پێی بایەخە هەواڵییەکان، وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە کە لە خشتەکاندا هەیە. دارشتنی هەواڵ بەپێی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دەبێت.

- باشترین شێوە بۆ لێدوانەکان، شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوویە.

**ئامادەکردنی هەواڵی کارەساتەکان**

ئەم هەواڵانە پێویستە لایەنی ئاگاداری، پەروەردەیی و هۆشیارکردنەوە لەخۆبگرن، هەر بۆیە سەرەرای ئاماژەکردن بە تاوان و سزاکان، پێویستە هۆشیارکردنەوە و بەرجەستەکردنی پێویستی لەگەڵ بێت.

- شێوەی مێژوویی بە لیدەوە بۆ ئەم هەواڵانە شێوەیەکی گونجاوە.

لە هەواڵی دادگاکاندا، چونکە بابەتەکە لەسەر بنەمای پرسیار و وەڵام پێکدێت، پێویستە رێچکەی گفتوگۆ نەپسێت، بۆیە لە شێوەی مێژوویی بە لیدەوە کەڵک وەردەگرین.

لەم هەواڵانەدا پێویستە لەبەکار هێنانی ئەو دەستەواژانەی باری یاساییان هەیە، زۆر بە تێبینی و سەرنجەوە کەڵک وەربگرین. تاوانکار، تاکو لە لایەن دادگاوە تاوانبار نەناسرێت، بە پێشێلکەری یاسا ناژمێردرێت.

لە هەواڵی دادگاکاندا، هەروەها دەکرێت لە گوزارشی دادگا و وتوویژ لەگەڵ تاوانکار کەڵک وەرگرین و هەڵسەوکەوت و هەستی تاوانکار شرۆڤە بکەین.



**ئامادە کردنی هەواڵی وەرزشی**

لە هەواڵە وەرزشییەکاندا سەرەرای لەپێشچاوگرتنی پێکهاتەکانی هەواڵی، پێویستە هەستی تەماشەڤانەکان و یاریزانەکان بۆ خوێنەر بگوازینەوە، لەم رووداوانەدا ئەگەر هەواڵەکە تەنیا ئاماژە بە ئاکام و چۆنێتی رووداوەکە بکات، لە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو کەڵک وەردەگرین، بەڵام ئەگەر پێویست بە ئاراستەیەکی مێژوویی بێت، شێوەی مێژوویی بە لیدەوە بەکار دێنین.

**ئامادەکردنی هەواڵە زانستی و هونەرییەکان**

زۆرجار بۆ ئامادەکردنی هەواڵە زانستی و هونەرییەکان، شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو بەکار دێت. هەڵبەت سوودوەرگرتن لە دەستەواژە رازاوەکان دەبێتە هۆی جیاوازی ئەم هەواڵانە لە هەواڵە وێشک و فەرمییە سیاسی و ئابوورییەکان. لە هەواڵی هونەریدا زانینی لایەنە تایبەت و ناسکەکانی هونەری پێویستە و دەقی وەسفی لە نووسینی هەواڵدا، رۆڵی سەرەکی دەبینێت.

لە بەرێوەچوونی هێندێک لە کۆبوونەوە فەرمییە سیاسی و کولتوورییەکاندا، زۆرجار لە پەراوێزدا ئاگاداری هەندێک ئاراستەی نائاسایی دەبین. وەک نەبوونی رێکوپێکی، لاتاو و لێدوانە نافەرمییەکانی دەوروبەر، هەستی بەشداران و...پێویستە ئەمانە بە ئاراستەیەکی جیاواز لە هەواڵەکە لە کۆتاییدا ئاماژەی پێبکرێت (بە دانانی نیشانەی ئەستێرە یان لەژێر دێری " لە پەراوێزی کۆبوونەوەدا:".

جاری وا هەیە لەگەڵ هێندێک هەواڵی کورت رووبەڕوو دەبینەوە (کە خۆبەخۆ کورتن) یان بە هۆی نەبوونی کات و شوێن لە لاپەڕەکاندا، مەودای بڵاوکردنەوەیان بە تەواوی نییە، دەتوانین لە ژێر دێری "کورتە هەواڵ" ئامادەیان بکەین.

وەک: کورتە هەواڵەکانی جیهان یان پەرلەمان.

# خاڵبەندی لە هەواڵدا

مەبەست لە خاڵبەندی لە هەواڵدا، سوودوەرگرتن لە نیشانەکانە بۆ خوێندنەوەی دروست و تێگەیشتنی ئاسانی بابەتەکان. هەروەها یارمەتیدەرە بۆ روونکردنەوەی هێندێک لە ئاڵۆزییەکان لە نووسراوەکاندا.

واتە بۆ وەرگرتنی مانای تەواو و لێکتر جیاکردنەوەی دێڕەکان، پێویستە لە نیشانەکان کەڵک وەرگرین تا خوێنەر بە ئاسانی لەپەیامەکە بگات.

لێرەدا زۆر پوخت و کورت ئاماژە بە چۆنیەتی بەکار هێنانی هێندێک لەو ئامرازانە بە یارمەتی نموونە پێویستەکان دەکەین.

- خاڵ (.)

ئا) خاڵ بۆ لێکتر جیاکردنەوەی دێڕەکانی هەواڵ بەکار دێت و تەواوبوونی دێڕ پێشاندەدات.

وەک:

مەسعود بارزانی، سەرۆکی کوردستان گوتی: "گوناح نییە ئەگەر کورد داوای سەربەخۆیی بکات."

ب) هەروەها پێش هەر تیپێک کە بۆ کورتکرنەوەی وشە بەکار دێت، سوود لە خاڵ وەردەگرین.

وەک:

- پۆست و تەلەگراف و تەلەفون (P.T.T.)
- شەرەفخان لەدایکبووی ساڵی ١٧٣٣ز. (زایینی)



تێبینی:

بەگشتی نیشانەکان، وەک خاڵ، دووخاڵ و وێرگول دوابەدوای وشەی پێش خۆی دێت و لەگەڵ وشەی پاش، پێویستە مەودای هەبێت.

- دوو خاڵ (:)

نیشانەی دوو خاڵ لەم شوێنانە بەکار دێت:

پێش لێدوانی راستەوخۆ وەک:

جەلال تاڵەبانی، سەرکۆماری عێراق گوتی: "عێراق پێویستی بە یارمەتی هەموو وڵاتانی ناوچەکە هەیە."

تێبینی:

- لێدوانی ناراستەوخۆ پێویستی بە دوو خاڵ نییە.

وەک:

جۆرج بۆش رۆژی یەکشەمە گوتی ئێران بۆ وەڵامدانەوەی لایەنە نێونەتەوییەکان کاتێکی کەمی ماوە.

- خۆبپارێزن لە دانانی دوو خاڵ پاش دەستەواژەکانی وەک "بە وتەی ئەو"، "لەو گوزارشەدا هاتووە"، "بریتی لە" و ....

وەک:

لەو گوزارشەدا هاتوو کە پاش شەپۆلی نائارامییەکان لە شارەکانی ناوەندی عێراقدا، ئەمرۆ لە بەغدا حکوومەتی سەربازی راگەیەندرا.

- سێ خاڵ (...)

نیشانەی سێ خاڵ بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە بەکار دێت:

أ) بۆ لێدوانی راستەوخۆ لەناو دوو کەوانەدا ئەگەر بە هەر هۆیەک بەشێک لە لێدوانەکە چاوپۆشی لێبکرێت، لەجیاتی ئەم بەشە سێ خاڵ بەکار دێنین.

وەک:

لەم بەیاننامەیەدا هاتووە: "سەرەرای ئەوەی باڵیۆزخانەی کۆماری چیک بەتەواوی لە سەر ئەو باوەرەیە کە سەردانی سەرکۆماری عێراق بۆ کۆماری چیک، بەهێزتر کردنی پتری پێوەندییە دۆستانەکەی نێوان پراگ و بەغدای لێ چاوەروان دەکرێت... بەڵام تا ئێستا کاتی ئەو سەردانە دیاری نەکراوە."

ب) وشە یان دەستەواژەی نزم و دوور لە ئەخلاق (جنێو) کە لەگەڵ هەواڵدا ناگۆنجێن.

وەک:

نوێنەری خوێندکارانی کوردستان خێرا لەجێگای خۆی هەستا و روویکردە نوێنەری سوریا و گوتی: ئێوە ئاگاتان لە کارەساتەکانی کوردستان نییە، دانیشە سەر جێی خۆت هەی...!

پ) ئەگەر بە هۆیەک لە هۆیەکان بابەتێک ناتەواو بمێنێتەوە و نەمانهەوێت تەواوی بکەین لە نیشانەی سێ خاڵ کەڵک وەردەگرین.

وەک:

"لە پلەی یەکەمدا هەموومان هیوادار بووین کە ئەو مرۆڤە رزگار بکەین، بەڵام ئێستا کە لە رووی پزیشکییەوە هیچ دەرەتانێک نەماوە، ئیتر چیمان لە دەست نایەت..."

ت) لە کاتێکدا کە وشە یان بەشێک لە بابەتێک ناروون و ئاڵۆز بێت، لەجێگایدا سێ خاڵ دادەنێین.

وەک:

رادیۆی بی.بی.سی لە گوزارشێکدا گوتی لە کاسێتێکی ڤیدیو کە لە ئەفغانستان دۆزراوەتەوە چوار کەس لە ئەندامانی گرووپی... پێشاندراون، بە بۆچوونی بەرپرسانی ئەمریکی یەکێک لەوانە کە یەمەنییە لە رووداوەکەی ١١ سیپتەمبەردا دەستی هەبووە.

ج) بۆ پێشاندانی لێکپچڕانی وشە، کاتێک کەسێک بە هۆی لێدوانی تایبەتی خۆی یان شێوازی لێدوانی بە پچڕاوی ئاخافتن دەکات.

وەک:

لە وەڵامی پرسیاری سەرۆکی دادگادا، تاوانبار گوتی: "ب...ە...ڵ...ێ."

تێبینی:

- سێخاڵ بێمەودا بە وشەی پێش خۆی دەنووسێنرێت و پێویستە لەگەڵ وشەی پاش خۆی مەودای هەبێت.

● وێرگول (،)



وێرگول نیشانەی راوەستان یان پشوودانە و بۆ ئەو مەبەستانە بەکار دێت:

ئا) کاتێک چەند وشەیەکی بەدوای یەک بەکاردێنین کە هەمان خەسڵەتی هاوبەشیان تێدایە و خەسڵەتەکەشی لەکاری رستەکەدا روون کراوەتەوە.

وەک:

ئاو، خۆراک و هەوا لە پێویستییە سەرەتاییەکانی ژیانی مرۆڤ دەژمێردرێن.

ب) بۆ جیاکردنەوەی ژمارەکان.

وەک:

ژمارەکانی ٢،٤،٦،٨ جووتن.

**تێبینی:**

وێرگول، بێمەودا بە وشەی پێش خۆی دەچەسپێت و لەگەڵ وشەی دوای خۆی، مەودای دەبێت.

دوو کەوان یان نیشانەی لێدوان " "، «»

دوو کەوان بۆ نیشاندانی لێدوانی راستەوخۆی کەسێک (نە نووسەرەکە) و بۆ جیاکردنەوەی وشە یان دەستەواژە تایبەتییەکان بەکاردێت.

دوو کەوان بۆ ئەو مەبەستانە بەکاردێت:

ئا) کاتێک لێدوان یان نووسراوەی کەسێک بێگۆڕانکاری و وەک خۆی بڵاو دەکەینەوە.

وەک:

محەممەد بەڕادعی رایگەیاند: «تا ئێستا هیوا ماوە بۆ ئەوەی ئێران و یەکێتی ئەوروپا سەبارەت بەدۆسیە ئەتۆمییەکەی ئێران دەست بە گفتوگۆکان بکەنەوە.»

ب) ئەگەر بمانهەوێت لە ناو دێڕی هەواڵەکاندا و لە کاتی نووسینی لێدوانی ناڕاستەوخۆ، هێندێک وشە یان دەستەواژەی گرنگ بە شێوەی راستەوخۆ و لە زمانی بێژەرەکە، بەرجەستە بکەینەوە. واتە دەقی وشە یان دەستەواژەکە لە ناو دوو کەواندا ئاماژەی پێدەکرێت.

وەک:

عەدنان موفتی، سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لە دیدار لەگەڵ نوێنەرانی لاوانی کوردستان، لاوانی بە "هیوا و ئومێدی داهاتووی کوردستان" ناوبێژکرد.

**تێبینی:**

- هێندێکجار بۆ ئاماژەکردن بە ناوی تایبەت، لەجێگای دووکەوان لە یەک کەوان () کەڵک وەردەگرین.
- خاڵی تەواوکەری دێڕ بۆ ئەو دێڕانەی لە نێوان دوو یان یەک کەوان دەنووسرێن، پێویستە پێش داخرانی کەوان دابنرێت. وەک هەموو ئەو نموونانەی ئاماژەمان پێکردووە.

● نیشانەی سەرسوورمان (!)

نیشانەی سەرسوڕمان لە کۆتایی هەموو ئەو دێڕانەی کە پیشاندەری هەستە بەتینەکانی مرۆڤن وەک، سەرسوڕمان، پێداگری، بێزاری، ستایش، فەرمان، خۆشی و شادمانی، دادەندرێت

وەک:

- هەی کاکە گیان!
- ئارام!
- زۆر باشە!
- ئاخ!
- عەجەب مرۆڤێکی ریاکارە!

● نیشانەی پرسیار (؟)

ئەم نیشانەیە لەم کاتانەدا بەکار دێت:

أ) لە کۆتایی رستە پرسیارییەکەرەکاندا.

وەک:

هۆی نەگەڕانەوەی خەڵکی کەرکوک لەچیدایە؟

ب) پاش هەر وشە یان دەستەواژەیەک کە جێگای دێڕی پرسیارکە بگرێتەوە.



وەک:

بێدەنگی نیشانەی چییە؟ ئەرێنی یان نەرێنی؟

**چەند تێبینییەکی پێویست:**

- هێندێک جار لەبری نیشانەی سەرسوڕمان، نیشانەی پرسیار دادەنرێت کە هەڵەیە هەروەها بۆ نیشاندانی سەرسوڕمانی زۆرتر، دوو یان چەند نیشانەی پرسیار بەکار دێت کە ئەویش هەڵەیە.
- پاش نیشانەکانی سەرسوڕمان و پرسیار، پێویست بە دانانی خاڵ نییە.
- ئەو پرسیارانەی کە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە هەواڵدا دێن، پێویستییان بە نیشانەی پرسیار نییە.

وەک:

وەزیری دەرەوەی عێراق لە وتووێژەکانیدا لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی عەرەبی دووپاتی کردەوە کە بۆچی وڵاتانی عەرەبی لەبەرامبەر تیرۆر لە عێراقدا هەڵوێست وەرناگرن.

# ژمارە نووسین لە هەواڵدا

بۆ نووسینی ڕێژە و ژمارە لە هەواڵدا، شێوازێک پێشنیار دەکرێت تا هەم خوێندنەوە ئاسان بکات و هەم شوێنی کەمتر بگرێت.

**ژمارە یەکرێژەییەکان**(١-٩)

لە هەواڵدا هەموو ژمارە یەکرێژەییەکان بەوشە ئاماژەیان پێدەکرێت، ٩ و ٣ی لێدەرچێت، چونکە نووسینی ئەم دوو ژمارەیە بە وشە، لەگەڵ وشەکانی‌تردا ئاڵۆزی سازدەکات.

تێبینی:

- لە مانشێتدا دەتوانین ئەم ژمارانە بە شێوەی ژمێریاری بنووسین.

وەک: تەقینەوەکانی ئەمڕۆی بەغدا، ٨ کوژراوی لێکەوتەوە.

- لە ناو هەواڵدا، خشتە ئامارییەکان، ئاکامی کێبەرکێ وەرزشییەکان، پانایی و درێژایی جوگرافی، برگەی یاساکان، ژمارەی تەلەفۆن، ژمارەی ئۆتۆمبێل، ژمارەی لاپەڕە، ژمارەی ناسنامە، کاتی رۆژ، ژمارەی ماڵ، پلەی گەرما، بەرزی و کێشی مرۆڤ بە شێوەی حیسابی واتە ژمێریاری دەنووسرێت.
- لە سەرەتای دێڕدا ژمارە بە شێوەی ژمێریاری دەنووسرێت.

وەک: ٣ کەس بە تاوانی قاچاخی مادەسڕکەرەکان لە سەر سنووری حاجی ئۆمەران دەستگیرکران.

ئەم تێبینیانەی سەرەوە ژمارە زۆر ڕێژەییەکانیش دەگرێتەوە.



**ژمارە دوو، و ٣ ڕێژەکان**

ژمارە دوو، و ٣ ڕێژەکان بە شێوەی ژمێریاری دەنووسرێن بەڵام ئەو ژمارانەی بە یەک و چەند سفر ساز دەبن بە وشە دەنووسرێن وەک: دە، دەهەزار، سەدهەزار،...

نموونەکان:

لە کارەساتی هاتوچۆدا، ئەمڕۆ ١٧ کەس کوژران.

وەزارتی ئەنفالکراوەکان، ٧٥٠ خانوو بۆ خانەوادەی ئەنفالکراوەکان ساز دەکات.

لە سەرەتای ساڵەوە تا ئێستا، ٨٥٠ تەن کەلوپەلی تەکنیکی لە سنووری برایم خەلیلەوە هاتۆتە ناو کوردستان.

سەد خوێندکار لەبەردەم پارلەماندا مانیان گرت.

زۆرتر لە دەهەزار کەس یاری تۆپی‌پێیَ نێوان هەڵبژاردەی کوردستان و هەڵبژاردەی (ئوردون)یان تەماشا کرد.

**ژمارە لە ٣ ڕێژە زیاترەکان**

ئەم ژمارانە بە شیوەی تێکەڵاو دەنووسرێن:

٤٢ هەزار و ٨٥٠

یەک ملیۆن و ٢٥٧ هەزار و ٤٣٦

چوار ملیۆن و ٥٢٢ هەزار و ١٧٣

١٢ ملیۆن و ٤٨٠ هەزار و ٩٧٠

١٨٢ میلیارد و ٣٥٠ ملیون

بۆ ئاسانکاری لە خوێندنەوەی ئەو ژمارانە لە هەواڵدا، پێویستە ٣ بە ٣ لێکتر جیابکرێنەوە و بنووسرێن.

نموونە:

ژمارە ١٥٦٤٥١٢ دەنووسرێت: یەک ملیۆن و ٥٦٤ هەزار و ٥١٢

ژمارە ٢٠٠٠١٠٠ دەنووسرێت: دوو میلیۆن و سەد

ژمارە ٦١٤٢١ دەنووسرێت: ٦١ هەزار و ٤٢١

**ژمارە دەییەکان**

ژمارە دەییەکان بە شێوەی ژمێریاری دەنووسرێن.

نموونە:

٥/٨٥٢ ، ٢/٣

**لەسەدا**

لەسەداکان بە شێوەی تێکەڵاو دەنووسرێن.

وەک:

سەدا٣، سەدا٥٦، سەدا١٠٠

**ژمارە کەرتییەکان**

ژمارەی لە یەک کەمتر بە شێوەی وشە دەنووسرێن. (تەنها ٣ و ٩ نەبێت).

وەک: دوو لەسەر ٣، یەک لەسەر پێنج، ٩ لەسەر ٣، شەش لەسەر پێنج.

**ژمارە بۆ هەڵسەنگاندن (یا مەزەندەکردن)**

ئەم ژمارانە بە وشە دەنووسرێن.

وەک: رۆژانە لە هەولێر بیست تا بیستوپێنج تەن نان فرێدەدرێت.

**ژمارەی هەڵسەنگاندن**

ئەم ژمارانە بە وشە دەنووسرێن.

وەک:

کتێبی یەکەم

پۆلی چوارەم

پلەی پازدەیەم

دەیەمین ساڵ

یەکەم رۆژ

**تێبینی:**

- ئەگەر ژمارەکان بەشێک بن لە وشەیەک، هەروەها رۆژەکانی هەفتە بە وشە دەنووسرێن.



وەک:

یەکشەممە، پێنجشەممە

چوارڕیانی، دوانە، هەشتپێی

- ئەو ژمارانەی کە وەکو هاوەڵناوی ژمارە بەکاردێن بە وشە دەنووسرێن.

وەک:

پیرە پیاوێکی حەفتاوپێنج ساڵە پاش ١٢ ساڵ توانی مۆڵەتی ئۆتۆمبێل لێخوڕین وەربگرێت.

خوێندکارێکی دوازدە ساڵە لە ئۆلمپیادی کیمیادا، پلەی دووەمی وەدەست هێنا.

لەم نموونانەدا دەتوانین بە گۆڕینی شێوازی نووسین، ژمارەکان بە شێوەی ژمێریاری بنووسین:

- پیرە پیاوێک کە پاش ١٢ ساڵ توانی مۆڵەتی ئۆتۆمبێل لێخۆڕین وەربگرێت، تەمەنی ٧٥ ساڵە.

- ئەو خوێندکارەی کە لە ئۆلمپیادی کیمیادا پلەی دووهەمی وەدەستهێنا، تەمەنی ١٢ ساڵە.

- رێکەوت لە هەواڵدا بە شێوەی تێکەڵاو دەنووسرێت.

وەک:

- پانزدەمی مای ٢٠٠٦

- دووەمی ئاپریلی ٢٠٠٣

- بۆ ئاماژەدان بە کاتی رووداوەکان، کاتژمێر و خولەک بە شێوەی ژمێریاری و بەجیا دەنووسرێن.

وەک:

- کاتژمێر ١٢ و ٤٥ خولەک

# مانشێت و جۆرەکانی

**مانشێت** (**تیتر** Headline)

لەبەرئەوەی خوێنەر هەمیشە بە خێرایی چاودەخشێنێت بەسەر بابەتی چاپەمەنییەکان و پاشان بابەتێک هەڵدەبژێرێت، مانشێت، رەوانەکەری خوێنەرە بۆ ناو هەواڵ. نووسینی مانشێت، کارێکی ناسکە و تێبینی پێویستە.

لە روانگەیەکیترەوە مانشێت بریتی لە "لیدی کۆکراوە"یە.

تایبەتمەندییەکانی مانشێت:

١- پێویستە مانشێت روون و ئاشکرا بێت و ئاڵوزی تێدا نەبێت.

٢- بە خوێندنەوەی مانشێت، خوێنەر خێرا لە هەواڵەکە تێبگات.

٣- مانشێت، پرسیار ناگرێتەوە.

٤- لە مانشێتدا نابێت کردار نەرێنی بێت. (لە جێگای، سەرکۆمار سەردانی ئێران ناکات، دەنووسین، سەردانەکەی سەرکۆمار بۆ ئێران هەڵوەشایەوە)

ئەگەر مانشێت نەرێنی بەڵام هەڵگری هەواڵ بێت، دەکرێ بەکاری بێنین.

٥- نابێت مانشێت بە تیپی لێکنەدراو دەستپێبکات،(وەک: لە، بۆ، بە، کە، با...) یەکەم وشەی مانشێت بۆ راکێشانی خوێنەر زۆر گرنگە.

٦- پێویستە مانشێت بە کردار کۆتایی بێت. (مەبەست ئەوەیە کە مانشێت ناروون و گشتی نەبێت، ئەگینا هێندێکجار هەیە کە مانشێت, کردار لە خۆ ناگرێت، بەتایبەت لە رۆژنامەکاندا)

٧- لە دووپات کردنەوە یان شکاندنی وشەکان لە مانشێتدا خۆبپارێزن.



٨- هەرچی مانشێت کورتتر بێت باشترە. بەلانیزۆر ٥ تا ٧ وشە، (بەمەرجی گەیاندنی ناوەڕۆک)

٩- لە مانشێتدا لێدوانی ناڕاستەوخۆ باشترە.

١٠- لە مانشێتدا خاڵ (.) تەنیا بۆ وشە کورتکراوەکان بەکار دێت، بەڵام بەگوێرەی پێویست لە نیشانەکانیتر(وەک، دوو خاڵ، ویرگوڵ و ..) کەڵک وەردەگیرێت.

**پێکهێنەرەکانی مانشێت:**

١- سەرمانشێت (سەرتیتر Kicker): بریتییە لە پیشەکی مانشێت، بچوکترە لە مانشێتی سەرەکی و لە سەرەوەی مانشێتدا و بچوکتر دەنووسرێت، بە لابردنی سەرمانشێت، نابێت مانشێت بێمانا بێت یان گۆڕانی بەسەردا بێت.

وەک:

سەرمانشێت: لە قۆناخی پێنجەمی هێرشدا

مانشێتی سەرەکی: ئەمریکا بۆمبارانی بەغدای دەستپێکرد

سەرمانشێت: سەرکۆماری عێراق

مانشێتی سەرەکی: ئاکامی هەڵبژاردنەکان دووشەممە ئاشکرا دەبێت

٢- مانشێتی سەرەکی (Main Headline)، باس کرا.

٣- ژێرمانشێت: (Deck): لە ژێرەوەی مانشێتی سەرەکی دەنووسرێت و لە گرنگیدا پلەی دووەمی هەیە.

نموونە:

سەرمانشێت: بەهۆی کارەساتی مرۆڤایەتی لە لوبنان:

مانشێتی سەرەکی: یەکێتی ئوروپا: شەڕوپێکدادان رابگرن

ژێرمانشێت: ژمارەی کوژراوەکان گەیشتە ١٢٠٠ کەس

٤- کورتە مانشێت (Soustitre) ئەم مانشێتە بۆ جوانکاری لاپەڕە و هەروەها دانی زانیاری زۆرتر بەکار دێت و پێویستە بە نیشانەیەکی وەک ئەستێرە، خاڵی مەزن یان چوارگۆشەی رەش جیابکرێتەوە.

٥- مانشێتی نێوبژێو (Subhead)، مانشێتی نێوان برگەکانی هەواڵە، بۆ هێندێک جوانکاری و جیاکردنەوەی زانیارییەکان بەکار دێت کە لە هەواڵ یان راپۆرتە درێژەکاندا بەکار دێت. (لە هەواڵی بچوکدا بەکار نایەت)

مانشێتی نێوبژێو، دێڕیکی کورتە کە لە یەک تا ٣ وشە پێکدێت و بە پیتی گەورەتر دەنووسرێت.

**وشە لە مانشێتدا:**

لەو روانگەیەوە کە وشەکان پێکهێنەری مانشێتن، بۆ هەواڵنێر ناسین و شارەزایی لە وشەکان و ماناکانیان و باری هەستیاریان زۆر گرنگە.

لە مانشێتدا پێویستە لەو وشانە کەڵک وەربگرین کە کاردانەوەیان لە وشەکانیتر زۆرترە.

نموونە:

ئەمریکا: هێرش بۆسەر کوردستان قەبوڵناکات

ئەو وشەو دەستەواژانەی مانای هەڵسەنگاندن لەخۆ دەگرن وەک (باش، خراپ..) بەکار مەهێنن.

بۆچوون و بیروڕا (چونکە جیاوازیان هەیە) بەکار مەهێنن.

لە "هاوەڵکردار" کە "هاوەڵناو" سازدەکات، دەکرێت کەڵک وەرگرین.

زیادە دووپات کردنەوەی "هاواڵ کردار" کە "هاوەڵ ناو" سازدەکات و "هاوەڵ ناو"ەکان، کاردانەوەی مانشێت کەم دەکاتەوە.

هێرشی دڕندانەی هێزەکانی تورکیا بۆ سەر کوردستان

هێرشی دڕندانەی تیرۆریستان لە لەندن

کوشتاری بێبەزێییانەی تیرۆریستەکانی ئەلقاعیدە لە بەغدا

دووپاتکردنەوەی ئەو وشانە، هێز و کاردانەوەی مانشێت لەناو دەبات، بۆ نموونە، "کوشتار" خۆی مانای بێبەزەیی تێدایە و خۆی لە خۆیدا بێبەزێیەتی دەگرێتەوە و پێویست ناکات.

یان: گورگێکی دڕندە شوانێکی کوشت.

گورگ دڕندەیە و پێویست ناکات بۆ گورگ ئەو هاوەڵ ناوە بەکار بێنین.



**ئاهەنگ لە مانشێتدا:**

لە مانشێتدا هەمیشە ریتم و ئاهەنگ هەیە.

وەک: "کات بۆ ئێران بەسەر چوو"، یان: "کۆنگرەی نالی لە سلێمانی"

هێندێک پیت ئاهەنگیان خۆشە. (وەک، ش، ژ، ز، گ)

هێندێک پیت ئاهەنگیان ناخۆشە. (وەک، ق، غ، خ، ع)

ئەگەر ئەم دوو دەستە تیپانە بتوانین تێکەڵاو بکەین، جوانی و ناسکی دەستەی یەکەم رەنگدەداتەوە سەر ناخۆشی دەستەی دووهەم.

هەروەها لە مانشێتدا پێویستە ئاهەنگ و مانای وشەکان تەواوکەری یەکتر بن.

جۆرەکانی ئاهەنگ:

١- ئاهەنگی یەکنەوا: (فیستیڤالی پیشەوا لە هەولێر دەست پێکرا.) ریتمی کەمە.

٢- ئاهەنگی شەپۆلی: (کەشی هەفتەی داهاتوو، سەرما، باران، بەفروبۆران)

٣- ئاهەنگی شکاو: (سەدام لە دادگا ماتە، ئێران کاتی نەما)

**جۆرەکانی مانشێت:**

١- مانشێتی دەرهێنەرانە: (Intuitive Heads) دەرکی هەواڵنێر لە ناوەڕۆکی هەواڵە کە لە وێنەی مانشێتێکدا خۆی پێشاندەدات.

وەک:

- وتەکانی مەسعود بارزانی سەبارەت بە ئابووری کوردستان
- پەیامی سەرکۆماری عێراق بەبۆنەی کۆچیدوایی سەرکۆماری ئاڵمانیا

لە مانشێتی دەرهێنەرانەدا مەبەست ئاماژەکردن بە وشە یان دێڕێک نییە، لە ناو هەواڵەکەدا چونکە رەنگە دێڕێکی گرنگ نەدۆزینەوە یان بە هەر هۆیەک لە هۆیەکان پێویست ناکات ئاماژە بە دێڕێک لە هەواڵەکە بکەین.

پێویستە هەواڵنێر بە پێی ناوەڕۆکی هەواڵەکە بتوانێت مانشێتی دەرهێنەرانە ئامادە بکات. (هۆشداری، هەڕەشە یان تێگەیاندن)

وەک:

پەیامی توندوتیژی ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان بۆ جەعفەری

توندوتیژ بوونی پەیامەکە لە لایەن هەواڵنێرەوە وەرگیراوە. چونکە ناوەڕۆکی پەیامەکە توندوتیژە.

مانشێتی دەرهێنەرانە، سادەیە بەڵام دۆزینەوەی ناوەڕۆک هێندێک جار دژوار دەبێت. هەروەها دەکرێت دێڕیکی تەواو، بەپێی ناوەڕۆکی هەواڵێک سازبکرێت کە دەگەڕێتەوە سەر زانست و هۆشیاری هەواڵنێر.

تێبینی:

لە مانشێتدا دەتوانرێت دوو کردار بەیەکەوە بەکاربهێنرێن.

وەک:

ئێران ناتوانێت بەربەرەکانی ئەمریکا بکات

٢- مانشێتی چەکوچی(بەگورز):

مەبەست لەو مانشێتە ورووژاندنی خوێنەرە.

ئەو مانشێتە بە بەرجەستەکردنی وشەیەکی جۆشهێنەر، لەگەڵ دێڕێک و وێنەیەک بەکاردێت.

وەک:

مانشێت: سەهوڵبەندان

فەرانسە بێداد دەکات

مانشێت: کودەتا

عارف لە بەغدا دەسەڵاتی گرتە دەستی

٣- مانشێتی سەلماندن: (Persuasive Heads) ئەم مانشێتە بە مەبەستی ڕاکێشانی بیروڕای گشتی، بۆ پروپاگاندەی ناڕاستەوخۆ و جێگرکردنی پەیام لە زەینی خوێنەر، بەکار دێت.

لەم مانشێتەدا باری هەستیاری وشەکان بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەر گرنگی تایبەتی هەیە.



بۆ نموونە وشەگەلی (ڕێکەوتن، پەسەندکردن، سازش) یان (سیستەم، ڕژێم، دەسەڵات) یان (مەرگ، کۆچیدوایی، کوژران و...)

مانشێتی ئاسایی: عێراق وەڵامی پێشنیاری ئەمریکا بۆ وتووێژ سەبارەت بە کوێت دەداتەوە.

مانشێتی سەلماندن: ڕێکەوتنی عێراق و ئەمریکا بۆ وتووێژ لە ژنێڤ

٤- مانشێتی دووانە

وەک: داوا لە جیهان بۆ یارمەتیدانی عێراق

توندوتیژی لەبەغدا بەردەوامە

لەم مانشێتەدا، پێویستە وشەکان لەژێر یەکتر و هاوسەنگ بن، کە بۆ هەواڵی چەند بابەتی و لە ڕێگای تێکەڵاوکردن وەدەستدێت، کەوابوو دوو بابەتی هەواڵەکە دەبێتە مانشێت.

لەڕووی پێکهاتەی دێڕەوە، پێویستە دێڕی یەکەم بەشێوەی چاوگی بێکردار بێت، بەڵام دێڕی دووهەم بە کردار کوتایی بێت. شوێنی ئەم دوو دێڕە ناتوانین بگۆڕین.

وەک: داوای ئێران بۆ سازدانی کونفرانسی وڵاتانی ئیسلامی

بەرەی دووهەمی دژی عێراق لە تورکیا دەکرێتەوە

لەو نموونەیەدا پێوەندی مانا لە نێوان دوو دێڕی مانشێت، گەرچی دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەر بەڵام لێک دوورن. کەوابوو، لدی هەواڵەکە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە تا ئەگەر لێک دووربوونەوە هەبوو، خوێنەر ڕاکێشێت بۆ خوێندنەوەی تەواوی هەواڵەکە.

مانشێتی دووانە لە میدیا چاپکراوەکان بەکار دێت و لە هەواڵی ئاژانسەکانی دەنگوباس کارا نییە.

# چۆن هەواڵی سۆفت بنووسین (Soft News)

*دکتر یونس شکرخواه*

### سادە وەک سۆفت

لەپێشدا چەند تێبینی و پاشان دەچمە سەر بناوانی بابەتەکە:

پەیدابوونی سافت نیوز (Soft News) لە پانتایی هەواڵدا پتر لەرووی ناچارییەوە نەوەک هەڵبژاردنەوە بۆ ئەو مەبەستانە هاتووتە ئاراوە:

- بۆ کێبەرکێ لەگەڵ میدیا دیدارییە راستەوخۆکانی وەک سی.ئێن.ئێن، بی.بی.سی و...
- بۆ کێبەرکێ لەگەڵ ئینتەرنێت کە تان و پۆی رووداوەکان لە چاوترووکانێکدا پێشکێش دەکات.
- بۆ رزگاربوون لە گیروگرفتی چاوەڕوانی چاپکردن و بەسەرچوونی کات،( کۆنبوونی هەواڵ)، تا رادەیەک رێگاکەی پشتبەستن بە شرۆڤە. (دەرفەتێک کە سافت نیوز پێشکێشی دەکات و هەرەمی بەرئاوەژوو دوژمنێتی.)
- سەردەم گۆڕاوە، کێشەی "کەرەسەی نەرم" و "کەرەسەی پتەو" (لە کامپیوتێردا) دەتوانێت ببێتە "هەواڵی نەرم" و "هەواڵی پتەو" لە رۆژنامەوانیدا.

پرسیارێک:

هەواڵی سافت، هەمان شێوەی هەواڵی مێژوویی نییە؟

بە یەک هۆی سەرەتایی، واتە بە هۆی دژایەتی هێندێک لە رۆژنامەوانان و پسپۆڕانی بەشی هەڵسەنگاندنی هەواڵ لەگەڵ هەواڵی سافت، دەتوانین بڵێین



هەواڵی (سافت) لایەنێکی تازەی شێوەی مێژوویی نییە و ئەگەر چاوپۆشی لە "وێنەگەری" و "وردەزانیاری" لە هەواڵی سافت دا بکەین، ئیتر هیچ شتێکی لە شێوەی هەواڵی مێژوویی ناچێت.

هەواڵ یان گوزارش؟

سافت نیوز، هەواڵە یان گوزارشە؟

ئەگەر سافت، گوزارش بوایە، ئیتر ناویان نەدەنا نیوز!

بەڵام لەهەمان کاتدا دانی پێدادەنێم کە ناوەڕۆکی سافت نیوز ئێستا ناڕوونە، نەک تەنیا بۆ ئێمە، بەڵکو لەئاستی جیهاندا، تا ئێستا لەسەر ناوەڕۆکی، رێکەوتنێکی دیار وەدەست نەهاتوو، هەڵبەت لەناو رۆژنامەوانانی مودێرندا. رەخنەکانی دژ بە سافت نیوز پێوەندی بە تەکنیک و بنیاتی سافت نووسینەوە نییە و دژبەرانی تیفوسی سافت نیوز زۆر وردبینانە دەزانن لە کوێ دەوەشێنن: رۆژنامەگەری رەخنەیی پشتی بە سافت نووسی بەستووە.

سافت نیوز + رۆژنامەگەری رەخنەیی = هاوجۆشیکی مەترسیدار!

رۆژنامەوانی رەخنەگرانە (Critical Journalism) بەڕاستی لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ شێوازی باوی رۆژنامەگەری جیهانیدا، چەشنێک رۆژنامەگەری ئالترناتیڤ و رادیکالە و ئەمەش بۆ ناوەندەکانی ماڵی و دەسەڵات، دیاردەیەکی پەسەند نییە، چونکە بە پشتبەستن بە پێکهاتە هەواڵییەکانی: "بۆ چی" (Why) و "چۆنییەتی" (How) وەک بنەمایەکی سەرەکی سافت نیوز، دەستدەکات بە لەقاودان، هەروەها لەو روانگەیەوە کە سافت نووسین بەجێگای پشتبەستن بە یەک سەرچاوە، ئاماژە بە چەندەها سەرچاوە دەکات- کە دەتوانێت سەرچاوەی نافەرمیش بێت - باری دژایەتی ئەو ناوەندانە پان و بەرینتر دەکات. ئەوان دەڵێن، سافت نیوز دیموکراتی لاواز دەکات.

رەنگە بەو روونکردنەوەیە، بنەمای دژایەتی سیاسەتمەدارەکان و ناوەندە گشتییەکانی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لەگەڵ سافت نیوز ئاشکراتر و مانادارتر بووبێت.

ڕێگام بدەن تا هێندێک پتر نزیک بمەوە لە ناوەڕۆکی سافت نیوز. بیرم کردەوە کە لەسەرەتادا چەند تێبینییەکی گشتی باس بکەم و پاشان بچمە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکە.

### سۆفت نیوز: پێناسەی سەرەتایی

سۆفت نیوز، بەپێچەوانەی هەرەمی بەرئاوەژوو، دیلی کات نییە و زۆرتر سەروکاری لەگەڵ بزوێنەری سەرەکی ڕووداوکانەوە هەیە و ڕووی لەم ئاراستەیە، هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوە و شرۆڤە، کۆشش دەکات تا ڕێگای چارەسەر بدۆزێتەوە، باسی پێویستی ئاڵوگۆڕ دەکات و بە شێوەیەکی جیاواز دەنووسرێت تا خوێنەر ماندوو نەبێت و بە زەوق و شەوقەوە بەدوای بابەتەکە کەوێت تا کۆتایی دێت.

دیسان پرسیار

چەشنی نووسین، واتە شێوازی نووسینی هەواڵێک، ڕووداوەکە دیاری دەکات یان ڕۆژنامەوان؟

وریا بن! کە ڕووداو و ناوەڕۆک، شێوازی نووسین دیاری دەکات و بەسەر ڕۆژنامەواندا دایدەسەپێنێت. هەڵبژاردنی شێوازی نووسین دڵخوازانە نییە وەک هەموو لایەنەکانی (تازەیی، هەمەلایەنی، ئارەزووی خوێنەر، ڕکەبەرکێ و ..) کە دیاریکەری باشترین بڵاوکردنەوەی ڕووداوێکن. کەوابوو، دەتوانین بڵێین، کێشەی دژبەرایەتی دوو شێوازی پتەو نووسین و نەرم نووسین لەبنەڕەتەوە کێشەیەکی لادەرانە و بێبنەمایە. ئەوە ڕووداوەکانن کە شێوازی نووسین بەسەر ڕۆژنامەواندا دەسەپێنن.

چۆن دەبێت بنووسین؟

وا دیارە نزیک دەبمەوە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە. ئەگەر لەبەردەستانە، بۆخۆتان پیاڵەیەک چای یان قاوە بێنن.

- هاتنەوە؟

...

نووسین بە شێوازی سافت نیوز ئاسانە، بەمەرجێک داب و نەریتەکانی بە باشی فێربین.



لێرەدا من وا لێکدەدەمەوە کە خوێنەری ئەو نووسراوە، لەپێشدا ئاشنایی لەگەڵ شێوازی نووسینی هەرەمی بەرئاوەژوو هەیە. کەوابوو لەسەرەتادا دەبێت بڵێم:

١- نووسین بە شێوازی سافت نیوز، بۆ ئەو ڕووداوانەی کە پێویستە لە ماوەی ٧٢ کاتژمێری ناسراو بۆ ڕۆژنامەوانان (دوێنێ، ئێمڕۆ، سبەینێ) بڵاو بێتەوە، ناگونجێت. چونکە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕووداوی ئاوا، کات و مەودای مانۆڕمان نییە و پێویستە هەرچی زووتر ئامادە و تەواو بکرێن. واتە ئەگەر ڕووداوەکان پێوەندیان هەبێت بە ڕۆژی پێش، ئەمڕۆ یان ڕۆژێک پاش، باشترین شێواز بۆ نووسین هەمان هەرەمی بەرئاوەژووە (دایناسوڕەکان ئێستاش سەرنجراکێشن! بەڵگە: پارکی ژۆراسیک!)

٢- دڵنیام، تەنانەت ڕووداوەکانی ٧٢ کاتژمێریش دەکرێت بە شێوازی سافت بنووسرێن، بەڵام بۆ تازەکارەکان کارێکی پڕ ڕێچکەیە. (واتە تا ڕادەیەک دڵنیا نیم!)

بنخانی (ستروکتوری) بازنەیی بۆ سافت نیوز:

بە پێچەوانەی هەرەمی بەرئاوەژوو کە خۆی لە ناوەکەی دەچێت، سافت نیوز ستروکتوری بازنەیی هەیە.

لە سافت نیوزدا پێویستە هەواڵەکەتان لە هەمان شوێن تەواو بکەن کە دەستپێکی هەواڵەکەیە. واتە گرنگی بڕگەی کۆتایی سافت نیوز هاوسەنگە لەگەڵ گرنگی بڕگەی یەکەمی هەواڵەکە و لەو ڕوانگەوە بەپێچەوانەی پیرامیدی بەئاوەژوویە کە هەرچی بەرەو کۆتایی دەچێت، گرنگی زانیارییەکان کەمتر دەبێتەوە. دەستەواژەی "شایانی باسە کە " و "پێویستە دووپاتی بکەینەوە کە" ... لەیادتاندا ماوە!؟ (مانای ئەوەیە، کلاشم درا! واتە هیچم پێنەماوە!)

- هێشتا ڕوون نەبۆتەوە؟

زیاتر ڕوونی دەکەمەوە، چۆنە نموونەیەک بێنینەوە؟

وای دادەنێین کە بڕگەی یەکەمی هەواڵێک کە دەمهەوێت بە شێوازی سافت بینووسم بەم شێوەیە:

● تەنانەت بە پێوانەی خودی عێراقییەکانیش بێت، ئەمڕۆ بەغدا خوێناویترین رۆژی تێپەڕ کرد.

باشە.. ئێستا بەو دەستپێکە، پێویستە دواتر سەبارەت بە رووداوەکە زانیاری بدەین و کۆتاییش لەبیر نەکەین کە گوتم پێویستە بەقەت دەستپێک گرنگی هەبێت.

● ئایا رۆژانی خوێناویتر بەرێوەن؟

ئەو برگەیە دەتوانێت کۆتاییەکی گونجاو بێت، چونکە دەگەڕێتەوە بۆ برگەی یەکەم.

● پێویستە ئەمڕۆ لە مێژووی عێراقدا بنێژرێت و پێی بۆ داهاتوو رانەکێشێت. ئایا عێراقییەکان چاوبەسەر پێوانەکانیاندا دەخشێننەوە؟

باشە.. ئەوەش کۆتاییەکی گونجاوی دیکە کە ئەمەش هەر وەک کۆتاییەکەی تر دەگەڕێتەوە بۆ برگەی یەکەم. ئەوە یانی بنخانی بازنەیی و گەڕانەوە بۆ خاڵی دەسپێکی هەواڵ لە شێوازی سافت نیوزدا.

پێکهێنەرەکانی سافت نیوز:

سافت نیوز لە چەند پێکهێنەری سەرەکی پێکهاتووە کە تێدەکۆشم لە خوارەوە لەگەڵ نموونەی پێویستدا ئاماژەی پێبکەم. تەنیا ماوە ئەوە بڵێم، کەسەکان و کات و شوێنم بەهەڵکەوت هەڵبژاردوون و هەر ویچوونێک بەتەوای بەهەڵکەوتە.

**١- قسەکەر، راناوی یەکەمە:**

لای سافت نووسەرە پسپۆڕەکان پەسەندە کە هەواڵەکانیان لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە زمانی راناوی یەکەمەوە بنووسن کە پێدەڵێن "شایەت حاڵ" (Eyawitness)

● من لە پایتەختی عێراق بووم، لە ناو دڵی خوێناویترین رۆژی بەغدا. هەژدە عێراقی لە ناو ئاگری تەقینەوەکاندا سووتان و نازانم لە رێگای خەستەخانەدا چەند کەسیتر رەوانەی گۆڕستانەکان کران...

ئەوە دەسپێکێکیترە بۆ هەمان هەواڵ، بەڵام ئەمجارە لە زمانی راناوی یەکەمەوە. نووسین لە زمانی راناوی یەکەم، کارێکی زۆر دژوارە و بەڕاستی



دژوارترین بەشی سافت نووسینە و هەر بۆیە تەنیا و تەنیا پسپۆڕە ناودارەکان دەتوانن بەم زمانە بنووسن و تازەکارەکان بە هەمان زمانی راناوی سێهەم دەنووسن بەڵام نە بە شێوەی کۆن و رێزمانی باو کە ئێستا لە رۆژنامەکاندا دەنووسرێن.

**٢- چەند سەرچاوە:**

بەپێچەوانەی هەرەمی بەرئاوەژوو کە تەنیا پشت بە تاقە سەرچاوەیەک دەبەستێت و ئەویش زۆرجار وتەبێژی فەرمییە، سافت نیوز لەسەر بنەمای چەند سەرچاوە دەنووسرێت و پێویست ناکات سەرچاوەکان فەرمی بن و زۆرجار لە تێکەڵاوێکی سەرچاوە فەرمی و نافەرمییەکان کەڵک وەردەگرن. (پسپۆڕ و ئەلتەرناتیڤەکان بۆ پاشەکشە پێکردنی هەڵوێستی فەرمی رووداوەکان، بەگشتی پشت بە سەرچاوە نافەرمییەکان دەبەستن).

● "عەبدولقادر سەمیر"ی ٦٣ ساڵە کە جامی چێشتخانەکەی بە هۆی تەقینەوەکە شکابوون، سەبارەت بەو تەقینەوەی کە بەیانی شەممە لە کاتژمێر ١١ و ١٠ خولەک لە سووچی خۆرهەڵاتی گۆڕەپانی "تەحریر"ی بەغدا روویدا، گوتی: "هاتوهاوارەکان، شۆکی تەقینەوەکەی پتر دەکرد، من خۆم پێش هاتنی ئامبولانسەکان، بە یارمەتی خەڵکی، چەند بریندارم رەوانەی خەستەخانە کرد."

● "ئامانجی سەرەکی ئەم تەقینەوەیە، کاروانێکی سەربازی بوو." ئەمە ئاماژەی وتەبێژی باڵوێزخانەی ئەمریکایە لە بەغدا، کە بووەتە ماتۆری مەحکووم کردن. ئەو پاش ماوەیەکی کورت، تەقینەوەکەی مەحکووم کرد.

● لەو کاتەوەی کە دەستەڵاتی تازەی عێراق پێکهاتووە، ئەو وڵاتە توشی شاڵاوی هێرشە خۆکوژییەکان بووە و تا ئێستا بەلانی کەم ٣٧٠ کوژراو و سەدان برینداری لێکەوتووەتەوە."

● "برادەرانی ئێوە لە رێکخراوی ئەلقاعیدە، ئۆتۆمبێلێکی مێنرێژکراویان لە گۆڕەپانی تەحریر لە بەغدا دانا کە بە هۆی تەقینەوەی، چەند ئۆتۆمبێلی داگیرکەران لەکارخران و ژمارەیەک سەربازیان کوژران."

ئەو دێڕانە لە بەیاننامەی گروپی تیرۆریستی ئەبو مسعەب ئەلزەرقاوی وەرگیراوە کە لە سەر سایتێکی ئەنتەرنێتی بڵاوبۆتەوە و هەواڵنێری فەرەنسا لە دوبەی ئاشکرای کردووە، بۆ دەستگیرکردنی ئەبو مسعەب ئەلزەرقاوی، ٢٤ میلیۆن دولار خەڵات تەرخانکراوە.

● بەڵام "بەشار ئەلحەسەن" ئەندامی ڕێکخراوی پزیشکانی بێ‌سنوور و پزیشکی ئەو خەستەخانە کە چەند برینداریکی ڕووداوەکە چارەسەر دەکات، گوتی: "تاکو ئێستا لە زۆر ناوەندی قەیراناویی جیهاندا خزمەتم کردووە، بەڵام لە هیچ شوێنێک ئەوەندە کارەساتی پەیتاپەیتام وەبەرچاو نەکەوتووە."

ئینجا لێرەدا سەرچاوەی هەواڵەکان دەژمێرین: عەبدولقادر سەمیر، وتەبێژی باڵوێزخانەی ئەمریکا، ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، هەواڵنێری فەرەنسا و بەشار ئەلحەسەنی پزیشک.

**٣- Backgrounder**

Backgrounder یەکێکە لە پێکهاتە پێویستەکان بۆ سافت نیوز و بەپێچەوانەی شێوازی هەرەمی بەرئاوەژوو کە تەنیا لە کۆتایی هەواڵدا ئاماژە بە Backgrounder دەکەین و دواتریش بە هۆی کەم بوونی شوێن چاوپۆشی لێدەکرێت! (چ نەخشێکی پیرۆزی هەیە!)، لە سافت نیوزدا لە سەرتاسەری هەواڵدا بڵاو دەبێتەوە، تا بە کردنەوەی گرێ کوێرەکان، یارمەتیدەری سافت نیوز بێت و سەبارەت بە کات وسات، شوێنەکان و مرۆڤەکان، وردەزانیاری زۆرتر بە خوێنەر بدات. هێندێکجار Backgrounder، هەواڵ ڕەنگاوڕەنگ دەکات تا لە دووپات بوونەوە و بێزاربوون لە بابەتەکە کەم بکاتەوە و ڕووداوەکان باشتر شیبکاتەوە.

- ئایا ئەو هەواڵە Backgrounderی هەیە؟

بەڵێ بەڵێ.. زۆریش: خوێناویترین ڕۆژ، ٦٣ ساڵە، سوچی خۆرهەڵاتی گۆڕەپانی "تەحریر"، پاش ماوەیەکی کورت، ٣٧٠ کوژراو و سەدان بریندار، ٢٤ میلیۆن دۆلار خەڵات، ئەندامی ڕێکخراوی پزیشکانی بێ‌سنوور.



**٤- لێدوانی ڕاستەوخۆ:**

یەکێکیتر لە پێکهاتەکانی سافت نووسین، لێدوانی ڕاستەوخۆیە. لە ڕوانگەی لایەنگرانی سافت نیوزەوە، لێدوانی ڕاستەوخۆ گیان بە هەواڵ دەبەخشێت و ئامادە بوونی لایەنی مرۆیی لە هەواڵەکەدا بەهێز دەکات. لێدوانی ڕاستەوخۆ بۆ سافت نیوز وەکو دەنگی ڕووداوە بۆ هەواڵی ڕادیۆیی.

- ئایا لەو هەواڵەدا لێدوانی ڕاستەوخۆ هەبوو؟

بەڵێ، بێگومان، چەند جاریش:

"- هاتوهاوارەکان، شۆکی تەقینەوەکەی پتر دەکرد، من ...."

"- ئامانجی سەرەکی ئەم تەقینەوەیە کاروانێکی سەربازی بوو"

"- برادەرانی ئێوە لە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، ئۆتۆمبێلێکی مینڕێژکراویان لە گۆڕەپانی تەحریر...."

"- تاکۆ ئێستا لە زۆر ناوەندی قەیراناویی جیهاندا خزمەتم کردووە، بەڵام........"

**٥- زمانی نافەرمی:**

زمانی سافت نیوز، وشک و فەرمی نییە. لە پلەی یەکەمدا، لێدوانە ڕاستەوخۆکان باری فەرمی بوونی دەستەواژەکان و دابونەریتی هەواڵ نووسینی باو، کەم دەکەنەوە. پاشان، خودی ڕۆژنامەوان بۆ خۆپاراستن لە دووپات کردنەوەی وشەکان و کەڵک وەرگرتن لە دەستەواژە ڕازاوەکان و تەنانەت بەکارهێنانی نوکتە و وشەی گاڵتەجاڕی، هێزی فەرمیی بوونی زمانی هەواڵ لاواز دەکات. پێویستە هۆشیار بین لە بەکارهێنانی زمانی نافەرمی، نەکا دوچاری زیادەڕەوی بین کە ئەوە "پاژنەی ئەخیل"ی سافت نیوزە.

- وادیارە لەبیرم کرد پاشماوەی هەواڵەکە بنووسم. لەکوێدا بووین!؟

(نموونەی زمانی نافەرمی)

"ڕاجر نوواک"، لێکۆڵەری کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەڵێ: "سەرەڕای ئەوەی پسپۆڕان خەریکی ڕوونکردنەوەن کە تەقینەوەکان لە لایەن تاقمە وەفادارەکانی دەوڵەتی پێشووی سەدام حوسێن ڕوودەدات یان بەرهەڵستکارانی ئیسلامگەرا کە ڕەنگە پێوەندیان لەگەڵ تۆڕی ئەلقاعیدە بە سەرۆکایەتی ئوسامە بن‌لادنەوە هەبێت، بەڵام چەشنی هەڵبژاردنی

ئامانجەکان، پسپۆڕی لە داڕشتن و ئەنجامدانی تەقینەوەکان و کەڵک وەرگرتن لە ئامرازە جۆراجۆرەکان، هێندێک لە پسپۆڕانی بوارەکەی گەیاندۆتە ئەو باوەڕە کە بیر لە ئەگەری هەبوونی دەستێکی دەرەکی بکەنەوە."

ئەگەرچی هەر مەزەندە و گومانێک لەوبارەدا دەتوانێت لایەنێکی راستی لەخۆبگرێت، بەڵام نابێت نەخشی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی سعودی و بەرهەڵەستکارانیتری ئیسلامگەرا فەرامۆش بکەین کە بە شێوەیەکی بەربڵاو رۆژانە خۆ دەخزێننە ناو خاکی عێراق، لە لایەک بۆ رزگاری لە چەنگ ناوەندە یاساییەکانی وڵاتانی خۆیان و لە لایەکیترەوە چوونە ناو ریزی هێزە جیهادییەکان کە وڵاتی عێراقیان وەک بەرەی تازەی جیهاد دژی ئەمریکا هەڵبژاردووە.

باواکەین کە تەقینەوەی ئێمڕۆ لە مێژووی بەغدا بەخاک دەسپێردرێت و بۆ داهاتوو پێ رانەکێشێت. ئایا عێراقییەکان چاو بەسەر پێوانەکانیاندا دەخشێننەوە؟

**٦- شرۆڤە:**

بەڵێ، تابۆی شرۆڤە! نە بۆ سافت نیوز، بۆ هەرەمی بەرئاوەژوو.

شرۆڤەکردن لە سافت نیوزدا زۆر باوە. شرۆڤە یەکێک لە پێکهاتەکانی سافت نیوزە، بەڵام لەم کارەدا زۆر زیادەڕۆیی مەکەن کە کار دەداتە دەستتان.

ئایا لەو هەواڵەدا شرۆڤەمان هەبوو؟

بەڵێ، هەمانبوو، سێ جۆر.

- ماتۆڕی مەحکووم کردن (شرۆڤە لە رێگای Backgrounder ەوە)
- سەرەڕای ئەوەی پسپوڕان خەریکی روونکردنەوەن کە...... بەڵام چەشنی هەڵبژاردنی ئامانجەکان، پسپۆڕی لە داڕژتن و ئەنجامدانی تەقینەوەکان...... هێندێک لە پسپۆڕانی بوارەکەی گەیاندوتە ئەو باوەڕە کە بیر لە ئەگەری هەبوونی دەستێکی دەرەکی بکەنەوە." (شرۆڤە لە زمانی سەرچاوەیەکیتر)



- ئەگەرچی هەر مەزەندە و گومانێک لەوبارەدا دەتوانێت لایەنێکی راستی لەخۆبگرێت، بەڵام نابێت نەخشی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی سعودی..... (شرۆڤە لە زمانی وێژەری هەواڵ)

نەکا ئێوە چاوەڕوانی ئەوە بکەن کە هەر ئێمڕۆ بە خوێندنەوەی بابەتێک سەبارەت بە نووسینی سافت نیوز، هەموو شتێک لەو بارەوە فێربن و سبەینێش خەڵاتی "پولیتزر"ی رۆژنامەوانی وەرگرن! ؟

ئێستا رێگام بدەن تا مانشێتێک ئامادە بکەم و تەواوی هەواڵەکە بەیەکەوە دابرێژین، با بزانین ئەوەی لە ئاو دەردێت، هەرچی بێت پیروزە!

**خوێناویترین رۆژی بەغدا**

من لە پایتەختی عێراق بووم، لە ناو دڵی خوێناویترین رۆژی بەغدا. هەژدە عێراقی لە ناو ئاگری تەقینەوەکاندا سووتان و نازانم لە رێگای خەستەخانەدا چەند کەسیتر رەوانەی گۆڕستانەکان کران.

"عەبدولقادر سەمیر"ی ٦٣ ساڵە کە جامەکانی چێشتخانەکەی بە هۆی تەقینەوەکە شکابوون، سەبارەت بەو تەقینەوەیەی کە بەیانی شەمە لە کاتژمێر ١١ و ١٠خولەک لە سوچی خۆرهەڵاتی گۆڕەپانی "تەحریر"ی بەغدا روویدا، گوتی: "هاتوهاوارەکان، شۆکی تەقێنەوەکەی پتر دەکرد، من خۆم پێش هاتنی ئامبولانسەکان، بە یارمەتی خەڵکی، چەند بریندارم رەوانەی خەستەخانە کرد."

"ئامانجی سەرەکی ئەم تەقینەوەیە کاروانێکی سەربازی بوو" ئەمە ئاماژەی وتەبێژی باڵوێزخانەی ئەمریکایە لە بەغدا، کە بووەتە ماتۆڕی مەحکووم کردن. ئەو پاش ماوەیەکی کورت، تەقینەوەکەی مەحکووم کرد.

لەو کاتەوەی کە دەسەڵاتی تازەی عێراق پێکهاتووە، ئەو وڵاتە توشی شاڵاوی هێرشە خۆکوژییەکان بووە و تا ئێستا بەلانی کەم ٣٧٠ کوژراو و سەدان برینداری لێکەوتۆتەوە."

"برادەرانی ئێوە لە رێکخراوی ئەلقاعیدە، ئۆتۆمبێلێکی مینرێژکراویان لە گۆڕەپانی تەحریر لە بەغدا دانا کە بە هۆی تەقینەوەی، چەند ئۆتۆمبێلی داگیرکەران لەکارخران و ژمارەیەک سەربازیان کوژران."

ئەو دێڕانە لە بەیاننامەی گرووپی تیرۆریستی ئەبو مسعەب ئەلزەرقاوی وەرگیراوە کە لە سەر سایتێکی ئەنتەرنێتی بڵاوبووتەوە و لە لایەن هەواڵنێری فەرەنسا لە دوبەی ئاشکرا کراوە. بۆ دەستگیرکردنی ئەبو مسعەب ئەلزەرقاوی، ٢٤ میلیۆن دۆلار خەڵات تەرخانکراوە.

بەڵام بەشار ئەلحەسەن ئەندامی رێکخراوی پزیشکانی بێسنوور و پزیشکی ئەو خەستەخانەیە کە چەند برینداری رووداوەکە چارەسەر دەکات، گوتی: "تاکو ئێستا لە زۆر ناوەندی قەیراناویی جیهاندا خزمەتم کردووە، بەڵام لە هیچ شوێنێک ئەوەندە کارەساتی پەیتاپەیتام وەبەرچاو نەکەوتووە."

"راجر نوواک"، لێکۆڵەری کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست دەڵێ: "سەرەرای ئەوەی پسپۆران خەریکی روونکردنەوەن کە تەقینەوەکان لە لایەن تاقمە وەفادارەکانی دەوڵەتی پێشووی سەدام حوسین روودەدات یان بەرهەڵەستکارانی ئیسلامگەرا کە رەنگە پێوەندیان لەگەڵ تۆری ئەلقاعیدە بە سەرۆکایەتی ئوسامە بنلادنەوە هەبێت، بەڵام چەشنی هەڵبژاردنی ئامانجەکان، پسپۆری لە دارشتن و ئەنجامدانی تەقینەوەکان و کەڵک وەرگرتن لە ئامرازە جۆراوجۆرەکان، هێندێک لە پسپۆرانی بوارەکەی گەیاندوتە ئەو باوەرە کە بیر لە ئەگەری هەبوونی دەستێکی دەرەکی بکەنەوە."

ئەگەرچی هەر مەزەندە و گومانێک لەوبارەدا دەتوانێت لایەنێکی راستی لەخۆبگرێت، بەڵام نابێت نەخشی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی سعودی و بەرهەڵەستکارانیتری ئیسلامگەرا فەرامۆش بکەین کە بە شێوەیەکی بەربڵاو رۆژانە خۆ دەخزێننە ناو خاکی عێراق، لە لایەک بۆ رزگاری لەچەنگ ناوەندە یاساییەکانی وڵاتانی خۆیان و لە لایەکیترەوە چوونە ناو رێزی هێزە جیهادییەکان کە وڵاتی عێراقیان وەک بەرەی تازەی جیهاد دژی ئەمریکا هەڵبژاردووە.

باوا بکەین کە تەقینەوەی ئێمرۆ لە مێژووی بەغدا بەخاک دەسپێردرێت و بۆ داهاتوو پێ راناکێشێت. ئایا عێراقییەکان چاو بەسەر پێوانەکانیاندا دەخشێننەوە؟



ئێستا لە تەنیشت پیاڵەکەتان، چایدان زیاد بکەن. سەرەی ئێوەیە کە هەواڵێکی رەمزی بنووسن، تەنانەت ئەگەر حەوسەلە و کاتتان زۆرە. لەدوای منیش مەگەرێن تا بەسەر نووسراوەکەتاندا بچمەوە. من لە هەرەمی بەرئاوەژوو هەزاران "نوستالژیا"م هەیە!!

## جۆرەکانی راپۆرت

راپۆرت بەپێی ناوەرۆک و شێوازی ئامادە کردن بریتییە لە:

١- راپۆرتە هەواڵ
٢- راپۆرتی وەسفی (ناسێنەر)
٣- راپۆرتی لێکۆڵینەوە
٤- راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژ
٥- راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی
٦- راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان
٧- راپۆرتی ئازاد
٨- راپۆرتی وێنەیی
٩- راپۆرتی نوکتەیی و گاڵتەجاڕی
١٠- راپۆرتی بازرگانی
١١- راپۆرتی پەیگیر (درێژەدار)

- **راپۆرتە هەواڵ**

رووداوەکان لە میدیاکاندا هەمیشە بە شێوەی هەواڵ رەنگدەدەنەوە. بەڵام، ئەگەر روداوێک بە هۆیەک لە هۆیەکان خاوەن گرنگییەکی تایبەتی بێت، میدیاکان بۆ خوێنەرانی خۆیان بە لێکۆڵینەوە و شرۆڤەی زۆرتر لەسەریان بە شێوەی یەک یان چەند راپۆرت، ئامادەی دەکەن.



بۆ نموونە، لە رۆژنامەدا هەواڵی دزی کردن لە دوکانەکانی بازاڕگەیەکی گەورە بڵاودەبێتەوە:

"دەستەیەک چەکداری نەناسراو، ئەمڕۆ بەیانی هێرشیان بردە سەر چواردە دوکان لە بازاڕگەی X لە شەقامی Yی شاری Z و پاش هەڕەشە وبریندار کردنی ٣ کەس لە دوکاندارەکان، بڕی ٤٦ میلیۆن دینار پارە، چەند مافور و هێندێک زێڕ و جەواهیریان دزی..."

دیارە چاوەڕوانی بۆ وەدەستهێنانی زانیاری زۆرتر سەبارەت بەم رووداوە، لەوانەیە لە تازەگی هەواڵەکە کەم بکاتەوە، بۆیە پێویستە ئەو هەواڵە لەگەڵ زانیارییە وەدەستهاتووەکان لە ماوەی یەک یان دوو کاتژمێردا بۆ بڵاوکردنەوە لە رۆژنامەدا ئامادە بکەین. بەڵام خوێنەران بێگۆمان چاوەڕوانی زانیاری زۆرتر سەبارەت بەو رووداوە دەکەن، کەوابوو سەرنووسەری رۆژنامە، یەکێک لە هەواڵنێران بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێک رەوانەی شوێنی رووداوەکە دەکات. هەواڵنێر بەپێی هێندێک زانیاری پێشوو بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێک سەردانی شوێنی رووداوەکە دەکات. هەواڵنێر بۆ ئامادەکردنی راپۆرتەکە پێویستی بە چی دەبێت؟ پێویستە لەگەڵ چ کەسانێک وتووێژ بکات؟ و کام بەرپرس بدوێنێت؟

- هەواڵنێر یان راپۆرتنووس پێویستە لەم کەسانە زانیاری وەربگرێت:

- لەگەڵ خاوەن دوکانەکانی بازاڕگەکە بۆ وەرگرتنی زانیاری نزیک لەراستی. پێویستە لەگەڵ زۆرترین رێژەی دوکاندارەکان قسە بکات.

- بینەرانی رووداوەکە: سەرەڕای دوکاندارەکان، لەوانەیە هێندێک کڕیار، کرێکاران یان بەرپرسان و یان هاوسێکانی بازاڕگەکە رووداوەکەیان لە نزیکەوە بینیبێت، دواندنی ئەم کەسانە دەتوانێت یارمەتیدەری باشی هەواڵنێر بێت.

- بەرپرسان و فەرمانبەرانی هێزەکانی ئاسایش و پۆلیس: ئەو کەسانە بە پێی ئەرکی پاراستنی یاسا و پێشگیری لە کردەوە دژ بە یاساییەکان، هەمیشە دەبێت رووبەڕووی پرسیار و لێکۆڵینەوە و وەرگرتنی زانیاری زۆرتر بن. ئەو

زانیارییانە، چۆنیەتی ڕوودانی تاوان، نیشانەکانی تاوان، بەدواداچونەکانیان و ... لەخۆدەگرێت.

- سەرچاوە ئارشیفییەکان: ئارشیفی ڕۆژنامە یان هی خودی ڕۆژنامەوان و زانیاری سەبارەت بە پێشینەی ڕووداوە وێچووەکان، ڕاپۆرتەکە بۆخوێنەران سەرنجڕاکێشتر دەکات. زانیاری سەبارەت بە ڕووداوی ئاوا لە هەفتە، مانگ یان ساڵی ڕابردوو، ڕێژەی کەلوپەلە دزراوەکان لەم ماوانەدا و زانیاریتر کە لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەدا دێت، ناوەندە بەهێزەکانی ڕاپۆرتەکە پێکدێنێت.

ئێستا ڕاپۆڕتەوان لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە دەتوانێت ڕاپۆڕتە هەواڵێکی باش و بەنرخ ئامادە بکات.

ڕاپۆڕتە هەواڵ تەنیا ڕووداوی کارەساتەکان و هەواڵەکانی شار ناگرێتەوە، بەڵکو بریتییە لە ڕاپۆرتی سیاسی، کۆمەڵایەتی، کولتووری، هونەری، وەرزشی و...

ڕاپۆرتی سەردانی وەزیری ناوخۆی فلان وڵات، ڕاپۆرت سەبارەت بە پێشوازی خەڵک بۆ کڕینی کتێبێکی تازە، ڕاپۆرت سەبارەت بە بەرهەمێکی هونەری تازە لەسەر دیوارەکانی شار، ڕاپۆرت لە خانەنشینی وەرزشکارێکی بەناوبانگ و... تەواوی ئەوانە ڕاپۆرتە هەواڵن. چونکە هەموویان لەسەر بنەمای هەواڵێک پێکهاتوون. لە تەواوی ئەم ڕاپۆرتانەدا هەواڵنێر کۆشش دەکات تا زانیاری تازە سەبارە بە ڕووداوە هەواڵێک بگەیەنێتە خوێنەران.

- **ڕاپۆرتی وەسفی**

بە شێوەیەکی ئاسایی ڕاپۆرتی وەسفی زیاتر لە هەموو چەشنەکانی دیکەی ڕاپۆرت لە نووسراوی ئەدیبانە و هەستیار نزیکدەبێتەوە. ڕاپۆڕتەوان لەم بوارەدا زیاتر لە هەموو کاتێک دەتوانێت لە هێز و توانای نووسین و پێنووسەکەی کەڵک وەربگرێت. لە ڕاپۆرتە وەسفییەکاندا سەرنووسەر و خوێنەر زۆرتر سەرنجدەدەنە زەین و بنەماکانی نووسەرانەی تاکی ڕاپۆڕتەوان، نەوەک بەراستی ڕووداو و بایەخە هەواڵییەکان.



ناتوانین بڵێین کە لە ڕاپۆرتی وەسفیدا (Decriptive Report) شوێنێک بۆ ژمارە، ڕێژە و ئامار و پێکهاتە ڕاستییەکانی ڕاپۆرت نییە. هەروەها ناتوانین بڵێین کە ئەگەر لە ڕاپۆرتی وەسفیدا کەڵک لەو لایەنانە وەربگرین، ئەو ڕاپۆرتە ئیتر کەڵکی نییە. بە پێچەوانە، هونەری گەورە ئەوەیە کە ڕاپۆڕتەوان بتوانێت هەماهەنگی و تێکەڵاوییەکی لەبار و گونجاو لە نێوان ئەم لایەنانە لە ڕاپۆرتی وسفیدا پێکبێنێت.

لە پێناسەی ڕاپۆرتدا هاتووە کە پێویستە نەخش و کاردانەوەی هەواڵنێر و ڕاپۆڕتەوان لە کێشەی پێکهاتنی هەواڵدا ڕەچاوبکەین، واتە نابێت میدیا و دەزگای ڕاگەیاندن وەک ماشێنێکی بێگیان هەڵسەنگێنین کە بە شێوەیەکی بەردەوام خەریکی بەرهەمهێنانی هەواڵ و ڕاپۆرتە. بەڵکو، چۆن پێوەندی پێکهاتەیەکی ئینسانی و مرۆڤییە، هۆکاری ئەو پێوەندییەش - هەواڵنێر یان ڕاپۆڕتەوان- لە پێکهاتەیەکی ئاوا مرۆڤانەدا کاردانەوەیەکی بێ ئەملاو ئەولای دەبێت. بەڵام هەمیشە ئەو فەرمان و پەندە لە کاری ڕۆژنامەگەریدا دووپات دەبێتەوە کە هەواڵنێر و ڕاپۆڕتەوان دەبێت تا ڕادەی پێویست لە کاردانەوەی ئاوا خۆبپارێزن. وەلێ لە تەواوی جیهاندا هیچ هەواڵنێرێک نادۆزییەوە کە بیڵێت و بیسەلمێنێت کە بەردەوام وەک ماشێن و بێ کاردانەوە لە لایەن خۆیەوە، ئەرکی ڕۆژنامەوانی هەڵسوڕاندووە. لە ڕاپۆرتی وەسفیدا کاردانەوەی هەواڵنێر و گواستنەوەی بۆ خوێنەر، لە هەموو شوێنێکیتر پترە.

وەک:

لەسەر ڕێگای خانەقین- نەفتخانە، چەند دارەخورمایەکی باڵابەرز و گۆڕستانێکی نوێ و چەند پیاو و گەنجێکی بێکار لە پاڵ دیواری نەخۆشخانە تازە دروستکراوەکە، پێشوازی لە ڕێبواران دەکەن. ڕەنگی پێستی دانیشتوانەکەی لە ڕەنگی خاکەکەیان جیاناکرێتەوە وجیاوازییەکە هەر ئەوەندەیە، مرۆڤەکان کەچی زۆر هەژار و کەم درامەتن، بەڵام باش دەزانن کە خاکەکەیان پڕاوپڕە لە ئاڵتونی ڕەش و زەرد، کەچی تا جلیکانێکی گاز یان

(بانزین)یان دەستدەکەوێت، رەش هەڵدەگەڕێن. پلەی گەرمایی ئەو دەشتە بەزەیی بەکەس نایەت و هیچیش نییە لە سێبەرەکەیدا بحەوێتەوە.

ئاوایی پەڵکانە لە نزیکەی ٨٠ ماڵ پێکهاتووەو زۆر لە(خانەقین)ەوە دوور نییە و رۆژانە دانیشتوانەکەی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە سەرەکییەکانیان روو لە شارەکە دەکەن.

مەهدی ئەحمەد ئیبراهیم (لەدایکبووی١٩٥٩) و هاوسەرەکەی (وەجیهە رەشید مەجید لەدایکبووی١٩٦٥) لەگەڵ پێنج منداڵ (نورا، عەلی، حوسین، میقداد، مەحەمەد) پێکەوە لە بارودۆخێکدا دەژین کە کەمترین پێداویستی سەرەتایی مرۆڤ و نزمترین ئاستی ژیانێکی کەرامەتداریان بۆ دابین نەکراوە.

لەسەر رێگا بۆ ماڵی مەهدی، ناوبراو وتی "کاتی خۆی لە شەلەمچە سەرباز بووم و بەهۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی، چاوێکم لەدەست دا و چاوەکەی تریشم کەم بینا بووە و بەحاڵ دەتوانم ببینم. لەبەر تیشکی خۆر ئەم چاویلکەیەم هەڵگرتووە."

مەهدی بێکارە و بژێوی پێنج منداڵی لەسەرە و ماوەی ٦ ساڵیش دەبێ، هاوسەرەکەشی لە جووڵە کەوتووە. مەهدی وتی "کاتی خۆی نەخۆش بوو، بردمان بۆ نەخۆشخانەیەک لە بەغدا، بەڵام لەوێ دەرمانێکیان پێیدا و سەرئەنجامەکەی ئەوە بوو لە جووڵە کەوت."......

(سەرچاوە: ماڵپەڕی ئاسۆ، "بزەی سەرلێوی ژنێکی لە جووڵەکەوتوو!" ، نووسینی: سەلام عەبدوڵا )

هێندێک لە رۆژنامەنووسان، راپۆرتی وەسفی بە لوتکەی هونەری رۆژنامەنووسی ناوبێژ دەکەن.

ئەگەر رۆژنامەگەری وەک یەکێک لە ئاراستەکانی هونەری هەڵسەنگێنین، ئەوکات ئەم بۆچوونە راستی لەخۆ دەگرێت، بەڵام رۆژنامەوانی لە دوو بەشی هونەری و تەکنیکی پێکهاتووە. پێداگرتنی لە رادەبەدەر لەسەر وەسف - کە بێگومان نووسین هەستیار دەکات - راپۆرتەوان لە کاری سەرەکی خۆی کە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی زانیارییە، دوور دەخاتەوە. لە لایەکیترەوە ناکرێت بێ یارمەتی وەرگرتن لە هونەری وەسف، هێندێک کەشوهەوا و



بابەت بگوێزرێتەوە. راپۆرت لە کۆچی پاییزی مراوییەکان، راپۆرت لە ماڵی بەساڵاچوان، راپۆرت لە جێژنی نەورۆز و .... پێویستی بە وەسف و رەنگاورەنگ کردن هەیە، بەڵام دیسانیش هەر باشترە ئەو وەسفانە بە یارمەتی پێکهاتە و بەهاکانی هەواڵ رێکوپێک بکرێن.

"راپۆرتی خەیاڵاوی" چەشنێک لە راپۆرتی وەسفییە کە بە ئامانجی دووبارە کردنەوە و دووپات کردنەوەی کەشوهەوای رووداو یان بەسەرهاتێک دەنووسرێت. لەم راپۆرتەدا، راپۆرتەوان بە کۆکردنەوەی پێکهاتەکانی رووداوێک، وەک ناوەکان، کاتوساتی رووداوەکە، چۆنییەتی کردەوەکان و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر، تێدەکۆشێ تا رووداوەکە کاریگەر بکات و بەم شێوەیە دووبارە دایبڕێژێتەوە.

پێویست بە تێبینییە کە هەرچی راپۆرتی لێکۆڵینەوە (لە ژێرەوە باسی دەکەین) هەڵگری پێکهاتەکانی وەک، بینینی راستەوخۆ، رێژە، ئامار، کاردانەوەی لایەنە دژبەرەکان و تایبەتمەندی کاتی و ساتی بێت، راپۆرتی وەسفی لە سەر بنەمای هێزی دارشتنی پێنووس، خەیاڵ ناسکی، ئاماژە هەستیارەکان و وەجوڵە خستنی ناسکترین هەستی خوێنەر دادەڕێژرێت و ئامادە دەکرێت.

بۆیە، وەک شێوەیەکی ئاسایی، هەواڵنێری "دانیشتوو"، واتە هەواڵنێرێک کە بە هۆی توانای بەرزی نووسین و زاڵبوونی بەسەر بیروڕای گشتیدا، توانای نووسینی راپۆرتی وەسفی و خەیاڵاوی هەبێت، لە رۆژنامەکاندا شوێنی بەرچاوتر دەگرێت.

مامۆستایانی رۆژنامەوانی و هێندێک لە رۆژنامەوانان پێیان وایە کە راپۆرتی گەشتوگوزار، چەشنێکی جیاوازە لە راپۆرت نووسین. بەڵام چەشنی ئەو راپۆرتانە پەیوەندیان بە شێوازی نووسینیان هەیە، بەڵام بە هۆی باسکردن لە رەوت و شوێنەکان و کەشوهەوای سەفەر، پێکهاتەی "وەسف" لەو راپۆرتانەدا بەهێزترن، کەوابوو زۆربەیان لە رێژەی راپۆرتی وەسفی جێگادەگرن. ئەگەرچی لە روانگەیەکیترەوە، راپۆرتی سەفەر دەکەوێتە رێژەی "راپۆرت لە ناوچە".

تێبینی: راپۆرتی وەسفی لە هەموو راپۆرتەکانی دیکە نزیکترە لە ئەدەب و ئەدەبیات.

● **راپۆرتی لێکۆڵینەوە**

بەپێچەوانەی راپۆرتی وەسفی کە پەیوەندە بە داهێنەری نووسەر و راپۆرتەوانەوە هەیە، راپۆرتی لێکۆڵینەوە لە سەر بنەمای راستییەکان، رێژە، ئامار و لێکۆڵینەوە راوەستاوە.

لە رۆژنامەوانی نوێدا ئەو شێوە راپۆرت نووسینە بە "فیچێر" (Feature) ناوبێژ کراوە.

بۆ ئامادەکردنی راپۆرتی لێکۆڵینەوە کە بە شێوەیەکی ئاسایی، کاتی زۆرتری پێویستە، راپۆرتەوانی بەئەزموون دەبێت لە پانتاییەکی بەرفراوان و تێکەڵاوێک لە بەدواداچوون، وتووێژ، زانیاری سەرچاوە و ئارشیفەکان کەڵک وەربگرێت.

لە پێناسەی راپۆرتدا، "کاردانەوەی راپۆرتەوان" و ئاگاداری لە راستییەکان" وەک دوو بنەمای سەرەکی ئاماژەی پێکرا. دیارە کە لە راپۆرتی وەسفیدا، پێکهاتەی یەکەم (واتە کاردانەوەی راپۆرتەوان) و لە راپۆرتی لێکۆڵینەوەدا، پێکهاتەی دووهەم (واتە ئاگاداری لە راستییەکان) گرنگی سەرەکی و تایبەتی پەیدا دەکەن.

کەوابوو، لە راپۆرتی لێکۆڵینەوەدا قورسایی پتر دەخرێتە سەر زانایی و ئامۆژگارییەکانی فێربووی راپۆرتەوان (زانستی رۆژنامەوانی)، بەڵام راپۆرتی وەسفی پێوەندی سەرەکی بە زەوق و داهێنەری (هەست و سەلیقەی) راپۆرتەوان هەیە.

وەک:

"لە ساڵی ١٣٣٥دا، رێژەی دانیشتووانی وڵاتی ئێران، ١٨ میلیۆن کەس بوو کە لەسەدا ٣١ی لە شارەکان و پاشماوەی لە گوندەکاندا دەژیان. لە ساڵی ١٣٤٥دا، دانیشتووانی وڵات گەیشتە ٢٥ میلیۆن کەس کە لە سەدا ٣٨ی شارنشین بوون. لە هەلومەرجێکی ئاوادا زۆر سروشتییە ئەگەر



بەشێکی سەرەکی سەرمایە و هێزی بەرهەمهێنەر... روو لە کەرتی خانووسازکردن بکات..."

وەک لە نموونەی سەرەوەدا دیار دەکەوێت، راپۆرتەوان لە لیدی راپۆرتەکەیدا، خوێنەر لەگەڵ شاڵاوێک رێژە و ئامار رووبەڕوو دەکاتەوە. چونکە بابەتی راپۆرتەکە ئەو شێوازە هەڵدەگرێت.

یان:

"بە وتەی.Y. X لە ساڵی ٢٠٠٤دا، بڕی ٤٣٢ میلیۆن پشک (سەهم) بە نرخی راوەستاوی یەک میلیارد و ٨٨٠ میلیۆن ریال سەودا کراوە کە ئەو رێژەیە بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ ساڵی ٢٠٠٣دا، هەڵکشانێکی باشی وەدەست هێناوە. X Y گوتی: "رێژەی پشکەکانی مامەڵە پێکراو لە ساڵی ٢٠٠٣دا گەیشتە ١٥٠میلیۆن و لە ساڵی ٢٠٠٤دا ئەو رێژەیە پتر لە ٤٣٢ میلیۆن پشکە....."

لە رۆژنامەوانی رۆژئاواییدا، ئیتر دەستیان لە شێوازی کۆنی پڕکردن و ئاخنینی رۆژنامە لە هەواڵە جۆربەجۆرەکان هەڵگرتووە. پێشتر، "فیچێر" دەبوایە تەنیا لایەنە تاریک و نەگوتراوەکانی هەواڵە بڵاوکراوەکانی روون کردباوە، وەک چۆن لە پێناسەی راپۆرتدا ئاماژەمان پێکرد کە راپۆرت، پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵ و بۆ پتر روونکردنەوەی دەنووسرێت، بەڵام ئێمڕۆ راپۆرتی "فیچێر"نووسی تا ئەو رادەیە بووەتە ناوەندی سەرنجی کردەوەکانی رۆژنامەوانی کە تەنانەت بۆ نووسینی سەروتاریش کەڵکی لێوەردەگرن. "فیچێر" پێویستە قووڵایی، پانتایی و گۆشە تاریکەکانی رووداوەکان روون بکاتەوە، ئەگەرەکان پێشبینی بکات، بیروڕای گشتی رێک و پێوەندی نێوان خوێنەر و میدیاکان پێکبێنێت. ئەو شێوەیە لە راپۆرت نووسین مەودای کار لە بوارەکانی بەربڵاونووسی و وێناسازیدا، بۆ رۆژنامەوان دەڕەخسێنێت.

راپۆرتی لێکۆڵینەوە بە هۆی نوێکاری لە میدیاکاندا، گرنگییەکی تایبەتی پەیدا کردووە. ئێستا میدیاکان لە هەر کاتژمێرێکدا کۆمەڵێک هەواڵی گرنگ لە رووداوەکانی جیهان بڵاودەکەنەوە. ئەمڕۆکە بینەران و خوێنەران بە یارمەتی تۆڕەکانی مانگیدەستکرد، ئەو هەواڵانە بە خێرایی وەردەگرن، بەڵام لە هۆکار و رەهەندەکان، هەروەها لایەنەکانیتری ئەم رووداوانە کەمتر زانیاری

وەردەگرن. لێرەدایە کە فیچێر و راپۆرتی لێکۆڵینەوە پێویستە ئەو ئاگادارییانە بەلانی کەم لەبارەی هێندێک لەو رووداوانە پێشکەش بکات. دیارە راپۆرتێکی ئاوا لەسەر بنەمای شرۆڤە دەبێت و یارمەتی گوێگر و خوێنەر دەدات تا سەبارەت بەم رووداوانە تێگەیشتنێکی رێژەیی وەدەست بێنێت. لە کاتێکدا، هەواڵ تەنیا زانیارییە. ئاگاداریش لەجێگای خۆیدا، دەبێتە مایەی سەرنجدان و هاوکات سەرگەردانی سازدەکات، وەلێ یەک "راپۆرتی لێکۆڵینەوە"ی باش دەتوانێت گوێگران و خوێنەرانی رابێنێت بۆ هەڵسەنگاندن و هاوسەنگی لەنێوان زانیارییەکان و دەرک و بۆچوونەکان.

هۆیەکی‌تری برەوی "فیچێر"، زیادکردنی ئاستی زانستە لە ناو خەڵکدا. فیچێر ئاستی زانیاری خەڵک سەبارەت بە گۆڕانکارییە نەتەویی و نێونەتەوییەکان زۆرتر دەکات. خەڵکی ئاسایی وەک بەرپرسانی بڕیاردەر، پێویستییان بە زانیاری هەیە. راپۆرتێکی لێکۆڵینەوەی شایستە، لە خەڵکەوە دەست پێدەکات و بە پێکهاتە پەیوەندیدارەکان بە ژیانی خەڵکیش، کۆتایی پێدێت.

**پێکهاتەکانی راپۆرتێکی لێکۆڵینەوە:**

- وەسف: لێرەدا رۆژنامەوان پرسێک یان دیاردەیەک شیدەکاتەوە.
- پانتایی: روونکردنەوەی رەهەندی پرس یان رووداوەکە و لەوانە، بۆچوونی بەرپرسان.
- پەیگیری: پێشکیشکردنی راوبۆچوونەکان و ئەگەرەکانی پرس یان رووداوەکە.
- بەدواداچوون: وەدەستهێنانی لایەنە پەیوەندیدارە تازەکان بە لایەنە کۆمەڵایەتییەکان، کەموکوڕییەکان.
- روونکردنەوە: دیاردە بچووک و مەزنەکان، پێوەندییەکانیان، ئاسۆکان، رێژە و ئامار و ژمارەکان.

سەرنجراکێشی: بەکارهێنانی نوکتە و گاڵتە، شک و گومان، ئاماژەکردن بە جوانییەکان.



- ئاماژەدان بە بیروبۆچوون: هەڵسەنگاندن بەگوێرەی پرسیاری "چۆن" و "بۆچی"، پێشاندانی کەموکوڕییەکان، رووبەڕوکردنەوەی دیاردەکان لەگەڵ یەکتر بۆ سەلماندنی رای لایەنی بەرامبەر.

ئاکام: کۆکردنەوە و ئامادەکردنی وێنەیەکی گشتی.

دوو ئاماژەی کۆتایی، نابێت بە شێوەی راستەوخۆ و لێدوانی بن، بەڵکو دەبێ وەک ئەنجام و بۆچوون لە راپۆرتدا بگونجێندرێت.

سەرەڕای گرنگی تایبەتی راپۆرتی لێکۆڵینەوە، لە کوردستان لە ناو چاپەمەنییەکاندا و بەتایبەت لە رۆژنامەکاندا کەمتر چاومان بەم چەشنە راپۆرتانە دەکەوێت. هۆیەکانی ئەمەش روونە. یەکەم، رۆژنامەوان بە هۆی ئاسانی نووسینی راپۆرتی وەسفی زۆرتر خۆ بەوەوە ماندوو دەکات چونکە پێویستی بە هات و چۆی بەردەوام، وتوێژی زۆر، لێکۆڵینەوە و پرسیارکاری نییە.

دووهەم، خۆپاراستنی بەرپرسان لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان لە میدیاکاندا.

سێهەم، کەم ئەزمونی، لاوازی و کەم حەوسەلە بوونی خودی راپۆرتەوان.

کەمتر رۆژنامەوانێک هەیە کە رێگاکانی ئامادەکردنی راپۆرتێکی لێکۆڵینەوە (فیچێر) و چۆنییەتی لابردنی کۆسپەکانی سەر ئەو رێگایە بزانێت.

هۆیەکی لاوەکیش هەیە کە پێوەندی بە دامودەزگا و توانایان هەیە. بە هەرحاڵ لاپەڕەکانی رۆژنامە یان گۆڤارێک دەبێت لە کاتی خۆیدا ئامادەی چاپ بێت، ئەو پێویستییە وەک چەندایەتی، چاپەمەنییەکان دووردەکاتەوە لە خۆماندووکردن بە چۆنایەتی رۆژنامە یان گۆڤارەکە.

دیارە ئەگەر لە بەشێکی رۆژنامە (سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، وەرزشی و...) ژمارەیەکی زۆرتر هەواڵنێر و راپۆرتەوانی بەتوانا کار بکەن، باشتر دەتوانن خۆیان سەرقاڵی راپۆرتە بەکەڵکەکان بکەن.

**● راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژ**

وەک لە بەشی وتووێژدا ئاماژەی پێکرا، راپۆرتی وتووێژ، یەکێک لە چەشنەکانی وتووێژە. ئەگەر تەوەری راپۆرت سەبارەت بە خەڵک و ویست و داواکارییەکانی بێت، لە "راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژ" کەڵک وەردەگرین. جیاوازیی راپۆرت لە سەر بنەمای وتووێژ، لەگەڵ راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی، لە وتووێژەکاندایە کە لە راپۆرتی سەبارەت بە کەسایەتیدا ئەو وتووێژە دوورودرێژ و قووڵترە، لە راپۆرتی وەسفی و لێکۆڵینەوەش، وتووێژەکان کورت و لاوەکین. راپۆرت لە سەر بنەمای وتووێژ بە تەواوی لکێندراوی وتووێژە و بێ ئەو مانای نییە.

کەوابوو، ئەو چەشنە راپۆرتە بە شێوەیەکی ئاسایی پێوەندی بە بابەتە کۆمەڵایەتییەکان وخەڵکەوە هەیە. راپۆرتەکانی وەک، ناونووسین لە قوتابخانە، هاتوچۆی ناوشار، گوزەرانی خەڵک لە کاتی پشوودا، وەرگرتنی خەڵک لە خەستەخانەکاندا، گرانی کەلوپەل لە بازاڕەکاندا، پاک و خاوێنی ناو کۆڵانەکانی شار و... بابەتی باشن بۆ راپۆرت لە سەر بنەمای وتووێژ.

لێرەدا پێویستە سەرنج بدەینە دوو تێبینی:

یەکەم، کاتێک دەڵێن خەڵک، مەبەست تەنیا خەڵکی ئاسایی نییە، بەڵکو تەواوی ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان پێوەندی بە بابەتی راپۆرتەکە دەبێت. بۆ نموونە، لە راپۆرتی ناو نووسین لە قوتابخانەکاندا، پێویستە نەتەنیا قوتابیان و دایک و باوکیان، بەڵکو لەگەڵ پسپۆڕان و بەرپرسانی پەروەردە و مامۆستاکان و بەرپرسانی قوتابخانەکانیش وتووێژ بکرێت.

دووهەم، پێویستە ئەو پرسیارانەی ئاراستەی خەڵک دەکرێن، هاوتای پلە و پایە و زانیاریان بێت، دیارە پرسیاری، "بڕی پارەی تەرخانکراو بۆ سازکردنی قوتابخانە لە قوتابی و یان دایکی و باوکی، ناتوانێت بۆ خوێنەران وەڵامێکی بەکەڵکی هەبێت.

پێویستە لە راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژدا، ئەم خاڵانەی خوارەوە لەپێشچاو بگرین:



- پرسیاری راستەوخۆ: پرسیاری راستەوخۆ، وەڵامی راستەوخۆ و روون دەخوازێت.
- زۆرینەی وتووێژەکان: هەرچی وتووێژەکان زۆرتر بن، ئاکامی راپۆرتەکە بایەخدارتر دەبێت.
- زۆرینەی جوگرافی و شوێنەواری: وێژەرەکان لە شوێنە جیاوازەکانی شار و گوندکان و... بدۆزینەوە.
- سنووورداری پرسیارەکان: هەڵبژاردنی پرسیاری کەم، بۆ گەیشتن بە ئاکامی باشتر، گرنگە.
- وێژەرەکان هەڵبژاردە بن: بەو مانایە کە لە نێوان هاوتاکانی خۆیاندا بە هۆیەک لە هۆیەکان، باڵاتر و بەرچاوتر بن.
- چاوەڕوانی وەڵام: پێویستە وێژەر لەگەڵ بابەتی وتووێژەکە نامۆ نەبێت.

وەک لە بەشی پێکهاتەکانی راپۆرتدا ئاماژەمان پێکرد، یەکێک لە پێکهاتە هەرە گرنگەکانی راپۆرت، وتووێژە. بۆ وێنە، زۆربەی راپۆڕتە هەواڵ، هێندێک لە راپۆرتی لێکۆڵینەوە، راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی و راپۆرتی بازرگانی، بۆ ئامادەکردنی هەموویان وتووێژ جێگایەکی گرنگ دەگرێت. بەڵام مەبەست لە جیاکردنەوەی راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژ، گرنگیدان بەو لایەنەیە کە ئەو چەشنە راپۆرتە ناتوانێت بێڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونی وێژەر، ئەنجام بدرێت و هەر بەو هۆیەشە کە ئەو دەستە لە راپۆرتانە دەکەوێتە ناو بازنەی راپۆرتە کۆمەڵایەتی و مەدەنییەکان.

بە خوێندنەوەی راپۆرتی وا، خوێنەر بیروبۆچوونی خۆی لە زمان و لە ناو وشەکانی وێژەردا دەبینێتەوە. ئەوەیە گرنگی و تایبەتمەندی راپۆرت لە سەر بنەمای وتووێژ. ئەگەرچی هەواڵنێر لە ناو لێدوانەکانی وێژەر، پرس و ئاماژەی تازە دەبینێتەوە و پرسیاری لێدەکات، بەڵام نابێت ئەو بابەتانە لەگەڵ ویست و بۆچوونەکانی خوێنەردا نامۆ بن. هەر بۆیە لە راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژدا، دوو پێکهاتەی راپۆرت واتە "وتووێژ" و "دیتن"، گرنگی و شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە. بێلایەنی هەواڵنێریش زۆر گرنگە. واتە وەک ئەوەیە کە هەواڵنێر یان راپۆڕتەوان، وتەی کەسانیتر دەخاتە ناو لێدوان و

وتاری خۆی و چەندایەتی ڕووداوەکانیش لە ڕێگای گێڕانەوەی دیتنەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە. دیارە داوەری و هەڵوێستی ڕاپۆرتەوان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕەنگدەداتەوە. هەر وەک پێشتریش باسمانکرد ئەو بێلایەنییە بە کۆشش و دووپات کردنەوە و ڕاهێنان وەدەستدێت. ئەوەش ڕاستە کە بێلایەنی سەداسەد لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکان، کارەساتەکان و پەیامەکان، کاری ماشێنییە و بۆ مرۆڤ زۆر دژوارە.

- **ڕاپۆرت لەسەر کەسایەتی**

پێویستە بزانین کە "ڕاپۆرت لەسەر کەسایەتی" و "وتوویژ لەگەڵ کەسایەتی" (واتە ڕاپۆرت لەسەر بنەمای وتوویژ لەگەڵ کەسایەتی) هەرچەند وتوویژەکە زۆر فراوان بێت، بەڵام جیاوازییان هەیە و یەک نین. ئەو چەشنە ڕاپۆرتە تەنیا بە وتوویژکردن کۆتایی نایەت، سەرەڕای ئەوەی کە ڕاپۆرت لە کەسایەتێکی زیندوو ناتوانێت بەبێ‌وتوویژ لەگەڵ ئەو کەسە تەواو و ڕێکوپێک بێت.

"بەهای هەواڵی" لە ڕاپۆرت لەسەر کەسایەتیدا، لە چوارچێوەی ناوبانگ و ناوداریدا دەخولێتەوە، چونکە مەرجی سەرەکی و گرنگی ئەو چەشنە ڕاپۆرتانە پێوەندی بە ناوداربوون و بەناوبانگبوونی کەسی لایەن ڕاپۆرتەکەوە هەیە.

پێویستە "ڕاپۆرت لەسەر کەسایەتی" ئەو تایبەتمەندییانەی هەبێت:

هەڵبژاردن: کەسێک دەبێت هەڵبژێرین کە بە هۆیەک لە هۆیەکان ناودار بێت (خاوەن بەرهەمی ناسراو، دەرهێنەری بابەتە تازەکانی تەکنیکی، هونەری و...،زۆربەی خەڵک بیناسن و ...) و یان بە هۆیەک لە هۆیەکان دەمانهەوێت ناوداری بکەین و ناوبانگ دەرکات!

توێژینەوەی تایبەتی: وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد، بۆ "وتوویژی قووڵ" و لە "ڕاپۆرت لەسەر کەسایەتی"دا، هەواڵنێر پێویستە لەپێشدا، زۆر بەوردی و تێبینییەوە تەواوی لایەنە سەرنج ڕاکێشەکان کەسایەتی هەڵبژێردراو بۆ وتوویژەکە بخوێنێتەوە و زانیاری وەدەستبێنێت.



ڕادەی خوێندنی، بەرهەمی، پلەوپایەی، گەشتوگوزاری، نەخش و کاردانەوەی، ڕووداوی ژیانی، زەوق و ئارەزووەکانی، بیروبۆچوونی و ...، ئەو لایەنانەن کە هەواڵنێر پێویستە ئاگاداری بێت. بەشێک لەو زانیاریانە دەکرێت لە سەرەتا و بەشەکانی‌تری لە ناواخنی ڕاپۆرتەکەدا ئاماژەی پێبکرێت.

بەکارهێنانی شایستە: پێویستە لە شوێنی شایستە کەڵک لەو زانیاریانە وەربگرین. دیتنی پەیکەری "ئەرەستو"، هەواڵنێر ئاگادار دەکاتەوە لە زەوقی وێژەر بە فەلسەفە و مەنتقی یونان، یان دیتنی وێنەیەکی منداڵی و کاتی قوتابخانە، بابەتیەکە ڕەوانەی ئەو کات وساتەمان دەکات.

زاراوەی گونجاو بۆ ڕاپۆرت: پێویستە هەر ڕاپۆرتێک بە زاراوەی گونجاو بنووسرێت کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە هەبێت. زۆر ڕوونە کە وشەکان و دەستەواژە بەکارهاتووەکان لە ڕاپۆرتێک سەبارەت بە وەرزشوانێک، لەگەڵ شێوازی نووسین لەبارەی دەرهێنەر، نەشتەرگەر و یان فەیلەسوفێک جیاوازی زۆریان هەیە. دیارە بەکارهێنانی شێوازی ئەدیبانە بۆ ڕاپۆرت سەبارەت بە سیاسەتمەدار یان پەککەوتوویەک کە بە پێ تابلۆ دەکێشیت و یان هەڵبژاردنی شێوازی نووسینی گاڵتەجاڕی بۆ ڕاپۆرت لە فەیلەسوفێک یان سەبارەت بە خۆکوژی ژنان، گونجاو نییە.

وسفی گونجاو: بۆ ڕاپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان، پێویستە لە بچوکترین تێبینی بگرە تا کەرەسەکانی ژیان و هەڵسوکەوتی ئەو کەسە بە شێوەیەکی وەسفی لە ناو ڕاپۆرتەکەدا کەڵکی لێوەربگرین. لەم ڕاپۆرتانەدا، خوێنەر نەتەنیا ئاگاداری بیرو بۆچوونەکان دەبێت، بەڵکو لەگەڵ شێوەی ژیان و هەست و دەروونی کەسەکە ئاشنا دەبێت. دیارە ڕاپۆرتێکی ئاوا پێویستی بە ئاستێکی بەرزی نووسین و وەسفەوە هەیە.

وتوویژ لەگەڵ کەسانی پایەبەرز لە زانین و زانستدا، پێویستی بە هێز و توانا لە وەسفکردندا هەیە.

چەشنێکی گرنگ لە ڕاپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان بریتییە لە بەسەرهات نووسین یان بیۆگرافی نووسین. ئەگەرچی بەسەرهات نووسین

کارێکی میدیایی نییە، بەڵام هێندێک جار لەگەڵ چەند نموونەیەک لەمانە رووبەڕوو دەبینەوە.

بەسەرهات نووسین، دوور و درێژترە لە راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی، بەڵام کەم تا کورت بە یەک شێواز و شێوە ئامادە دەکرێن.

زۆربەی بەرهەمەکانی "رۆمان رۆلان"، نووسەری ناوداری فەرەنسایی لە سەر بنەمای بیۆگرافی و بەسەرهات نووسین دارێژراون.

چەشنێکی‌تری بەسەرهات نووسین، بیرەوەری نووسین یان ئۆتۆبیۆگرافی نووسینە کە بە گشتی کاری میدیایی نییە.

پێویستە ئەوەشمان لەبەر چاو بێت کە راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان بە شێوەیەکی دوور و درێژ، زۆرتر تایبەتە بە چاپەمەنییەکانی مەودادار لە بڵاوکردنەوە، وەک هەفتەنامە یان مانگنامە. ئەگەرنا، بەلایەنی کەم پێویستە لە رۆژی پێنجشەمە بڵاو بێتەوە کە رۆژنامە دوو رۆژ زیاتر لەبەر دەست دەمێنێتەوە.

وەک لەپێشدا ئاماژەم پێدا، راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی بە دوو شێوە ئامادە دەکرێت. یەکەم راپۆرت سەبارەت بە کەسێک کە دەژی، دووهەم راپۆرت سەبارەت بە کەسانێک کە کۆچی‌دواییان کردووە. چەشنی یەکەم بریتیە لە سێ بەش، لێکۆڵینەوە، وتووێژ و بۆچوون. گرنگی ئەو سێ بەشە و یان هەریەک لەوانە بەپێی بابەتی راپۆرتەکە، جیاوازی پەیدا دەکەن. واتە سەرەتای راپۆرتەکە بریتی دەبێت لە پێشینە، را، زەوق و رادەی زانستی کەسایەتییەکە. پاشان لە کاتی وتووێژدا لایەنە نەبیسراو و تازەکان دێنە ئاراوە. ئەو دوو لایەنە لەگەڵ بۆچوون و بینراوەکانی خودی راپۆرتەوان لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا، پەیکەری سەرەکی راپۆرتەکە پێکدێنن. بەڵام لە چەشنی دووهەمدا، روونە کە لایەنی وتووێژ دەست نادات و بەجێگای ئەو، دەتوانین لە لێدوان و وتەکانی پێشوو یان بەرهەم و نووسراوەکانی ئەو کەسە (ئەگەر خاوەنی بووبێت) و تەنانەت لە وتووێژەکانی پێشووی، کەڵک وەربگرین و لە پەراوێزی راپۆرتەکەدا ئاماژەی پێبکەین.



راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان سەرەڕای دژواری و بەربڵاویی بابەتەکە، بەمەرجێ لەپێشچاوگرتنی شێوازە سەرەکییەکان بۆ ئامادەکردنی راپۆرت و تەرخانکردنی کات و لێکۆڵینەوەی شایستە، یەکێک لە پڕخوێنەرترین چەشنی راپۆرتەکانە.

هەندێک لە مامۆستایانی رۆژنامەوانی "راپۆرت سەبارەت بە شوێن"یش دەخەنە چەشنی راپۆرتەکان. بەڵام لە راستیدا هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی "راپۆرت سەبارەت بە شوێن" لە راپۆرتی وەسفی و هێندیکیان لە راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکاندا خۆی دەگرێتەوە. راپۆرت سەبارەت بە شوێن پێویستی بە شێوازی نووسینی بەهێز و بەکارهێنانی دەستەواژەی هەستیار و کارا هەیە (تایبەتمەندی راپۆرتی وەسفی). لە لایەکی‌ترەوە نووسینی "راپۆرت سەبارەت بە شوێن، بەگشتی پێویستی بە وتووێژ لەگەڵ زانایان و چاودێران هەیە، چونکە زۆر روونە کە لەگەڵ باڵەخانەیەکی مێژوویی یان مۆزەخانەیەک وتووێژ ناکرێت!

سەرەڕای ئەمانە، راپۆرت سەبارەت بە شوێن دەکەوێتە چوارچێوەی راپۆرتە پسپۆڕی و گرنگەکان.

سەفەرنامە نووسین چەشنێکی‌ترە لە راپۆرت سەبارەت بە شوێن.

- **راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان**

راپۆرتێک کە راپۆرتەوان سەبارەت بە بۆنەیەک (کۆنگرە، سیمینار، کۆبوونەوە، رێزلێگرتن، خەڵات کردن و ...) ئامادەی دەکات، لەگەڵ راپۆرتەکانی‌تر جیاوازی هەیە.

بەکردەوە، راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان خاوەنداری یەک یان چەند بایەخێکی هەواڵداری وەک ئەمانەی خوارەوە دەکات:

ناوبانگ: بەشێوەیەکی ئاسایی، میوانەکان، وتارخوێنەکان، یان بابەتی بۆنەکان(رێزگرتن لە کەسێک، خەڵاتکردن و ...) کەسایەتییە ناودارەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە، کەوابوو لایەنی "ناوبانگ" یەکێک لە لایەنە سەرنجراکێشەکانی راپۆرت پێکدینێت.

پانتایی: بابەتی بۆنەیەک دەتوانێت تەواو یان هێندێک لە کۆمەڵگا بگرێتەوە. بۆ وێنە دەستبەکار بوونی خولێکی پەرلەمان.

زۆرینە و رێژە: رێژەی بەشداربووان یان ژمارەی خەڵاتکراوان، بەهای راپۆرت پێکدێنێت. بۆ نموونە بەشداری ٥٠ هەزار کەس لە کۆنگرەیەکدا، بەشداری ٣٠٠ دەرهێنەری تەکنیکی یان ٣٠٠ نووسەر و ... لایەنی سەرنجراکێشی راپۆرتە.

سەرسوڕمان: زۆر بەدەگمەن لە راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکاندا رووداوێکی سەرسورهێنەر دەقەومێت، بەڵام ئەگەر رووبدات، بڵاوکردنەوەی ئەو رووداوە دەبێتە یەکێک لە لایەنە سەرنجراکێشەکانی راپۆرت لە بۆنەکەدا. بۆ نموونە ئەگەر لە کۆنگرەی هەزارەی "فردەوسی" شاعیری ئێرانی، کەسێک لە وتارەکەی خۆیدا بە بەڵگەنامەوە بیسەلمێنێت کە فردەوسی کورد بووە و شوێنی لەدایک بوونی شاری سنە بووە، نە شاری "توس".

کارەسات: ئەگەر لە بۆنەیەکدا کارەساتێک رووبدات، راپۆرت لەو بۆنەیە دەکەوێتە چوارچێوەی راپۆرتی کارەساتەکان، بەڵام ئەگەر کارەساتەکە پێوەندی بە بۆنەکەوە و یان بە بەشدارانی بۆنەکەوە هەبێت، پێویستە لە ناو راپۆرتی بۆنەکەدا ئاماژەی پێبکرێت. بۆ نموونە ئەگەر بەشدارانی بۆنەیەک بە هۆی خواردنەوەی ئاوی ناپاک دوچاری نەخۆشی بن، یان هێندێک لە بەشداران بە شێوەیەکی توندوتیژ بەرەنگاری وتاربێژەکان ببنەوە.

کەوابوو، پێویستە راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان هەڵگری بەها هەواڵییەکان بێت، ئەگینا راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان بێ ناوەڕۆک دەبێت و سەرنجراکێش نابێت.

کورت و پوخت نووسین: لە هیچکام لە راپۆرت نووسینەکاندا کورت و پوخت نووسین بە ئەندازەی راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان، گرنگی پەیدا ناکات. لە چەشنەکانیتری راپۆرت نووسیندا، وەک شێوەیەکی ئاسایی تەوەر یان شێوازی نووسین، قەوارەی راپۆرتەکە دیاری دەکات. لە راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان لەجێگای راپۆرتەوان و تەوەرەکە، ئەوە ناوەڕۆکی بۆنەکەیە کە لایەنی گرنگی راپۆرتەکە دیاری دەکات.



راپۆرت لە کۆبوونەوەی پەرلەمان، کۆنگرەی نالی، فیستیڤالی "کۆماری کوردستان"، یان لە کۆبوونەوەی هونەرمەندانی کوردستان، پێویستە چەندە بێت؟ ئەو پرسیارە وەڵامێکی دیاری کراوی نییە. واتە بە پێی چۆنیەتی بەرێوەچۆن، کەسایەتییە بەشدارەکان لەو کۆبوونەوانەدا، بەها هەواڵییەکانی ئەو کۆبوونەوانە دیاریدەکرێت و گرنگی پەیدا دەکات، بەڵام هەمیشە چارەنووسی سەرنجراکێش بوونی راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان لە لایەن راپۆرتەوانەوە دیاریدەکرێت.

زۆرجار راپۆرتەوان کورت نووسین لەگەڵ خۆ دوورگرتن لە بابەتە رەمەکییەکان بە هەڵە تێدەگات. لە کاتێکدا بابەتی پوختکراوە بۆ چاپکردن ئەو بابەتە دەگرێتەوە کە تا رادەی پێویست کورت کرابێتەوە، بەڵام گشت لایەنەکانی رووداوەکە، بەتایبەت لایەنە گرنگەکانی، لەبیر نەکرابن.

لە لایەکیترەوە، قەوارە و ئەندازەی راپۆرت پێوەندی تەواوی بە شێواز و ئاراستەی هەر میدیایەک هەیە. رەنگە رۆژنامەیەک بە هۆی ئاراستەی سیاسی یان کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆی، گرنگی زیاتر بە هەندێک لە بابەتەکان بدات. راپۆرت سەبارەت بە دەسبەکاربوونی پێشەنگای نێودەوڵەتی پیشەسازی هەولێر رەنگە لە رۆژنامەیەکدا زۆر کورتتر ئاماژەی پێکرابێت تا لە رۆژنامەیەکیتردا.

باشترین شێوە بۆ کورت کردنەوەی راپۆرت سەبارەت بە بۆنەکان بە لەپێشچاو گرتنی ئاراستەی رۆژنامەیەک، ئەوەیە کە لە سەرەتا، راپۆرتێکی تەواو لە هەموو لایەنەکانی بۆنەکە ئامادە بکرێت، پاشان راپۆرتەوان بە سەرنجدان بەو تێبینییانەی کە باسکران، بەشی زیادی راپۆرتەکە وەلانێت، بەڵام لە پوختەی راپۆرتەکەدا نابێت هیچکام لە لایەنی سەرەکییەکان و تەوەرە گرنگەکان لەبیر بکات.

**● راپۆرتی ئازاد**

راپۆرتی ئازاد، چەشنێکە لە راپۆرتی وەسفی یان شێوەیەک لە راپۆرتە کە بە پێی رەنگدانەوەی راستەوخۆی هەواڵنێر ئامادە کرابێت. لەو شێوەیەدا

تەوەر، شێواز و زاراوەی راپۆرتەکە، بەتەواوی لە لایەن هەواڵنێرەوە دیاری دەکرێن. راپۆرتی ئازاد (یان هەڵوێستی)، کۆسپ و تەگەرەکانی زۆر کەمترن لە راپۆرتی وەسفی.

راپۆرتەوانی راپۆرتی ئازاد، لە چوارچێوەی پێکهاتە و تەنانەت بەها هەواڵییەکانیشدا خۆی یەخسیر ناکات و دەتوانێت ئاماژە و سەرنج لە سەر لایەنە دڵخۆازەکانی خۆی دابنێت.

راپۆرتی ئازاد ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە:

هەڵبژاردەی ئازاد: هەواڵنێر لە گۆڕەپانی رووداودا، یەک یان هێندێک لەو لایەنانە هەڵدەبژێرێت کە دەتوانێ زۆرتر یان باشتر لەسەریان بنووسێت. بۆ نموونە، هەواڵنێرێک بۆ ئامادەکردنی راپۆرت رەوانەی بەرەی شەڕ دەکرێت. ئەو دەتوانێت لە نێوان تەواوی ئەو رووداوانەی دەوروبەری، تەنیا کڵاوێکی سەربازی کون بوو، قومقومەیەکی بەتاڵ، ئالایەکی تەنیا و تەنانەت فیشەکێک بخاتە ژێر سەرنجی خۆی و تەواوی راپۆرتەکەی سەبارەت بەمانە بنووسێت، یان لە خوێندنگەیەکی تایبەت بە کوێران، تەنیا سەرنج بداتە پۆلێکی بێ تابلۆی نووسین، یان لە تەقینەوەی موشەکێک لە ناو خانووبەرەیەکدا، تەنیا بووکێک بکاتە بابەتی راپۆرتەکەی.

رازانەوەی وەسفی: وەسفی بەهێز، لە تایبەتمەندییەکانی راپۆرتی ئازادە. بۆ نموونە، بۆ نووسینی راپۆرتی ئازاد سەبارەت بە "کڵاوی سەربازی کون بوو" هەواڵنێر دەبێت لەو تەوەرەدا توانای پەرەپێدانی بابەتەکەی هەبێت، ئەگینا، راپۆرتەکە دەبێتە وەسفی کڵاوەکە، نەوەک بەرەی شەڕ. یان لە خوێندنگەی کوێراندا سەبارەت بە نەبوونی تەختەی نووسین، پێویستە هەواڵنێر لەو روانگەیەوە تایبەتمەندییەکانی خوێندنگەکە وەسفبکات.

رەوانی و روونی: دیارە ئەگەر راپۆرتی ئازاد خاوەن زاراوە و شێوازی نووسینی رەوان نەبێت، سەرنجڕاکێش نابێت و بەرهەمێکی بێتام لە ئاو دەردێت. رۆژنامەوانانێک ئەو شێوە راپۆرت نووسینە هەڵدەبژێرن کە باوەڕیان بە هێز و توانای خۆیان هەیە لە نووسینی جوان و رازاوەدا.



زانیاری کەم: بە شێوەیەکی ئاسایی لە راپۆرتی ئازاد دا پێویست ناکات ، ئاماژە بە زانیاری زۆر ورد بکرێت. دیارە لە راپۆرتی ئازاد دا جێگای ئامار، رێژە، ژمارە و بۆچوونی پسپۆڕانە نییە، دیسانیش ئەوە راپۆرتەوانە کە چارەنووسی راپۆرتەکە دیاریدەکات، ئەگەر دەزانێ کە پێویستە و لەگەڵ شێوازی نووسینەکەیدا دێتەوە، ئەو دەتوانێت کەڵک لەمانەش وەربگرێت.

- **راپۆرتی وێنەیی**

کاتێک وێنەگری میدیایی هەندێک وێنە لە رووداوێک بگرێت و ئەو وێنانە بێ نیاز بن لە روونکردنەوە، یان رووداوەکە لەگەڵ هێندێک شرۆڤە هەڵسەنگێنێت، بەو راپۆرتە دەڵێین، راپۆرت وێنەیی. کەوابوو، راپۆرتێکی ئاوا پێش ئەوەی رەنگدانەوەی ئەزموون و کارایی هەواڵنێری پێوەدیاربێت، پێوەندی بە توانا و هێزی وێنەکانەوە هەیە.

لە رۆژنامەکانی کوردستاندا کەمتر بایەخ بەم چەشنە راپۆرتانە دەدرێت. بۆ نموونە ، ئەگەر وێنەگرێک لە کارەساتێکی هاتوچۆ هێندێک وێنە بگرێت و ئەو وێنانە بێ شەرح و روونکردنەوە بتوانن چۆنیەتی رووداني کارەساتەکە بەیان بکەن، بێگومان راپۆرتێکی سەرنجڕاکێش لە رووداوەکە پێشکێش دەکات.

زۆرجار هەواڵنێر ناتوانێت لە کاتی پێویست خۆی بگەیەنێتە شوێنی رووداوەکە، یان ناکرێت چاوەڕوانی نووسین و ئامادە بوونی راپۆرت بکەین، یان تەنانەت سەرنووسەر بریار دەدات کە راپۆرتێکی بێ شەرح لە رووداوەکە بڵاوبێتەوە، لەو کاتەدا راپۆرتێکی وێنەیی دەتوانێت جێگای راپۆرتی وەسفی، هەواڵی، یان راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژ بگرێتەوە. هەڵبەت دیارە کە راپۆرتی وێنەیی ناتوانێت جێگای راپۆرتی لێکۆڵینەوە، راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی و شوێن و یان راپۆرتی ئازاد بگرێتەوە. هەروەها راپۆرتی وێنەیی بە مەرجێکە سەرنجڕاکێش و تەواو دەژمێردرێت کە وێنەکان بە روونی هەڵگری پەیامی رووداوەکە بن.

لە ساڵی ١٩٧٩ لە شاری "سان دیاگۆ" لە ئەمریکا، مێرمنداڵێک کە خەریکی بەکار هێنانی کامێرای تازەی خۆی بوو لە سەر بانی خانووە بەرزەکەیان لە نزیک فرۆکەخانە و بە کەڵک وەرگرتن لە سیستمی ئۆتۆماتێکی کامێراکەی کە پەیتاپەیتا وێنە دەگرێت، ٢٤ وێنەی فرۆکەیەک لەکاتی فرینیدا دەگرێت. بە هەڵکەوت ئەو فروکەیە پاش هەستان دوچاری کارەسات دەبێت و دەکەوێ و لە ئاگردا دەسووتێت. ئەو ٢٤ وێنەیە چۆنیەتی هەستان، کەوتن و ئاگر گرتنی فرۆکەکە بە روونی پێشاندەدات. رۆژنامەی "لوس ئەنجلۆس تایمز" بە کەڵک وەرگرتن لەو وێنانە، راپۆرتێکی وێنەیی لەچاپ دەدات کە لەئاکامدا وێنەگرە مێرمنداڵەکە، خەڵاتێکی مەزن وەردەگرێت.

لە راپۆرتی وێنەییدا کە پتر پێوەندی بە وێنەگرەوە هەیە تا راپۆرتەوان، چۆنیەتی وێنەکان و پێوەندی وێنە بە بابەتی رووداوەکە گرنگی سەرەکیان هەیە.

شێوازی رازاندنەوەی لاپەڕە و رێکوپێک کردنی وێنەکان، گرنگی تایبەتییان هەیە، هەروەها نابێ سەرنجراکێشی وێنەکان ببێتە هۆی لەبیر کردنی بەکارهێنانی برین و قەوارەی جیاواز بۆ وێنەکان لە راپۆرتەکەدا.

**● راپۆرتی گاڵتەجاڕی**

گومان لەوەدا نییە کە گاڵتە نەتەنیا بەپەسەندترین، بەڵکو بەدژوارترین شێوازی نووسین دەژمێردرێت. گاڵتە نووسین، لوتکەی نووسینە.

لە زۆربەی زمانانی فەرمی نەتەوەکانی جیهاندا، وشە و دەستەواژە فەرمی و رەق و تەقەکان، زۆرترین مەودای بەکار هێنانیان هەیە، لە کاتێکدا لە زمانی نافەرمی خەڵکەکانیاندا بە شێوەیەکی بەربڵاو نوکتە و گاڵتە و وشەی پێکەنین بەکار دێن.

شێوازی باو و گرنگ لە گاڵتەدا، رووبەڕووکردنەوەی دوو بۆچوون، دوو ئاست و دوو کەسایەتی ناتەبا و یان دوو راستی نابەرامبەر لەگەڵ یەکترە. روونکردنەوە و شرۆڤە کردنی ئەو ناتەباییە لە راپۆرتدا، پێویستی بە شێوازێکی نووسینی زۆر زەریف و ناسک هەیە.



دەگمەنی راپۆرتی گاڵتەجاڕی لە میدیاکانی ئێمەدا بەهۆی نەبوونی ناتەباییە گاڵتە جاڕییەکان نییە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، بەڵکو پێشاندەری نەبوونی راپۆرتەوانە لەم بوارەدا کە بتوانێ لە ناتەباییەکانی دەوروبەری خۆیدا، راپۆرتی گونجاو و سەرنجراکیش ئامادە بکات.

هێندێک لە راپۆرتوانان پێیان وایە کە زاراوەی نووسینی گاڵتاوی، پەیامی راپۆرتەکان خەوشدار دەکات و بەرەو ئاراستەیەکی نادیار رەوانەی دەکات و لە ئاکامدا تەنیا کاردانەوەی گاڵتەی پێوە دیار دەبێت. ئەو بۆچوونە تەنیا لە نەبوونی توانا بۆ نووسینی راپۆرتی گاڵتاوی سەرچاوە دەگرێت. گاڵتە هەمیشە نابێتە هۆی پێکەنین. بە پێچەوانەی نوکتە و کۆمێدی کە پێکەنین ئامانجێتی، لە راپۆرتی گاڵتاویدا بە شێوەیەکی ناسک، بیر و هزر هەڵدەتەکێنێت و رەنگە، ببێتە هۆی پێکەنینیش.

هێندێک لە راپۆرتەوانەکان پێیان وایە کە لە جدی بوون و کاردانەوەی راپۆرت کەم دەبێتەوە ئەگەر بۆ نموونە لە ناو راپۆرتێک سەبارەت بە خانووی (بەساڵداچووان) دا، ئاماژە بە لێدوانی خوێندکارێک بکەین کە دەڵێت: بریا من لە جێگای باوەپیرەم لێرە ژیابام!

سەرەڕای ئەمانە، راپۆرتی گاڵتاوی یەکێکە لە چەشنەکانی راپۆرت و بە هۆی شێوازی نووسین و روانگەی گاڵتاوی تەوەری بابەتەکە، لە راپۆرتە دژوارەکانە، چونکە پێویستی بە نووسینی ناسک و زەریفەوە هەیە و رەنگە، دژوارترین چەشنی راپۆرت نووسین بێت.

**● راپۆرتی بازرگانی**

لە ناو هەموو چەشنەکانی راپۆرتدا، راپۆرتی بازرگانی بە شێوەیەکی ئاسایی ئەرکی دەستەی نووسەران نییە. ئەو راپۆرتە تەنیا بە مەبەستی ناساندنی بەرهەمێکی بازرگانی یان خزمەتگوزاری بۆ ناوەندە بازرگانییەکان ئامادە دەکرێت و میدیاکان لە بەرامبەر پارە، لە چاپی دەدەن.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو تێبینییە بکەین کە ئاگادارییە بازرگانییەکان لە میدیاکاندا لایەنێکی گرنگ بۆ دابینکردنی داهاتی چاپەمەنییەکان پێکدێنێت و

باشترە ئەو بەشە بەتەواوی لە دەستەی نووسەران جیاواز بێت و سەربەخۆ ئەرکەکانی راپەڕێنێت.

بەرپرسانی بەئەزموونی میدیاکان بەمەبەستی دابینکردنی سەلامەتی فیکری دەستەی نووسەران، هەمیشە لەسەر ئەو سەربەخۆییە پێدادەگرن. ئەو پێداگرتنە بۆ هێنانە خوار یان ناحەز پێشاندانی نەخش و جێگای بەشی ئاگادارییە بازرگانییەکان نییە، بەڵکۆ بە هۆی ئەوەیە کە تێکهەڵچوونی ئەرکەکانی ئەو دوو بەشە لە میدیاکاندا، کاردانەوەی نەرێنی دەبێت لە سەر ئەرکە گشتییەکانی ناوەندەکە. ئەگینا، ناکرێت حاشا لەو راستییە بکەین کە بەشی ئاگادارییە بازرگانییەکان، یەکێکە لە بەشە هەرە کاراکانی هەر میدیایەک و هیچ میدیایەک ناتوانێت خۆی لەو بەشە بێنیاز بزانێت.

گرفتی سەرەکی لە تێکهەڵچونی ئەرکەکانی ئەو دوو بەشە لێرەدایە کە ئەگەر هەواڵنێر لەگەڵ ناوەندێکی بازرگانی هەڵسوکەوتی ماڵی هەبێت، بە شێوەیەکی هەستپێنەکراو بەرەو ئەو لایەنە دەکێشرێت و سەبارەت بە کەموکوڕی و رەخنە لەو ناوەندانەدا، کەمتەرخەم دەبێت. لە ئاکامدا ئەگەرچی لەرووی داراییەوە قازانج دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا لە ئەرک و نەخشی سەرەکی رۆژنامەوانی دوور دەکەوێتەوە.

ئەو میدیایانەی کە ئەرکی وەدستهێنانی داهاتی ماڵی لە رێگای کۆکردنەوەی ئاگاداری بازرگانی دەخەنە سەر شانی ئەندامانی دەستەی نووسەران، دەستکەوتێکی سەرکەوتوویان وەدەست نەهێناوە. پێوەندی نێوان دەستەی نووسەران و بەشی ئاگادارییە بازرگانییەکان لە رێگای بەشداری بەرپرس یان کارگێڕی ئەو بەشە لە کۆبوونەوەی هاوبەشی بەرپرسانی میدیاکە چارەسەر دەکرێت.

پێویستە راپۆرتی بازرگانی:

دروشمی و کارا بێت: باوە کە لە راپۆرتە بازرگانییەکاندا لە وشە و دەستەواژەی پڕدەنگ و هاوەڵناوە بەرچاوەکان کەڵک وەردەگرن. وەک بەکار هێنانی هاوەڵناوی گەورەتر، مەزنتر، بەتواناتر، مۆدێرنتر یان هەرەگەورە، هەرەمەزن، هەرەبەتوانا و هەرەمۆدێرن. تەنانەت ئەگەر "بازاڕگەیەک" تەنیا



لە شەقامێکدا هەرەمەزن بێت، یان "پێشەنگایەک" تەنیا لە گەڕەکێکدا هەرەمەزن بێت و یان "کارخانەیەک" تەنیا لە شارێکدا هەرەمۆدێرن بێت. لەم دوایانەدا وادەرکەوتووە کە زێدەڕۆیی و موبالەغە وردەوردە لە باوەڕ و سەرنجی خوێنەر بە ئاگادارییەکان کەم دەکاتەوە و چەشنێک "زەینی پۆڵایی" لە بەرامبەر ئەو دروشمانەدا لە لای خوێنەر ساز دەکات. لە شێوازی نوێی ئاگادارییە بازرگانییەکاندا، "دروشم و کارایی" جێگای خۆی داوەتە "هەستپاکی" و "سەرنجدان بە ویستی خوێنەر(یان کڕیار)". واتە خاوەنی ناوەندە بازرگانییەکان راپۆرتی رەخنەگرانە و نەرێنی ئامادە دەکەن تا بە شێوەی پێچەوانە سوود وەرگرن، بەڵام ئەو کارە پێویستی بە هۆشیاری و دەرهێنەری یەکجار زۆر هەیە.

وێنەی گونجاو: راپۆرتی بازرگانی پێویستی بە وێنەی روون، جوان و مەبەستدار هەیە تا بتوانێت پەیامێکی شەفاف بە خوێنەر بگەیەنێت.

نووسینی گونجاو: رێنووسی راپۆرتی بازرگانی دەبێت گونجاو و مەبەستدار بێت تا خوێنەر بە ئارەزووی خۆی تەواو بیخوێنێتەوە و سەبارەت بە بەکارهێنان و کەڵک وەرگرتن لە بابەتی راپۆرتەکە زانیاری وەدەست بهێنێت. لە بەکار هێنانی دەستەواژەی ناڕاست و لاواز خۆبپارێزن. پێویستە لە کۆتایی راپۆرتەکەدا ئاماژە بە تەوەری ئاگادارییە بازرگانییەکە بکرێت.

### • راپۆرتی پەیگیرانە

لەوانەیە رۆژنامەوان لە پلەی یەکەمدا "راپۆرتی پەیگیرانە" بە گاڵتە وەربگرێت، مەگەر لە کاری روژنامەوانیدا راپۆرتی ناپەیگیرانەشمان هەیە؟ کامە راپۆرت پێویستی بە پەیگیری و پێداچوونەوە نییە؟ بۆیە تێگەیشتن لە "راپۆرتی پەیگیرانە" بەبێ مانا دەزانێت. بەڵام هێندێک راپۆرت هەن کە بە پێی تەوەرەکەیان پەیگیرانەترن.

سەرەرای ئەمانە، راپۆرتی پەیگیرانە جیاوازی بنەڕەتی لەگەڵ راپۆرتەکانیتردا هەیە.

## تایبەتمەندییەکانی راپۆرتی پەیگیرانە

**لێکۆڵینەوەی بنەڕەتی:**

راپۆرتی پەیگیرانە بابەتێک نییە کە بە شێوەیەکی ئاسایی زانیاری و تەوەرەکان ڕێکوپێک و ئامادە بکرێت. ئەو راپۆرتە بریتییە لە لێکۆڵینەوەی تایبەتی و بنەڕەتی کە هەواڵنێر لە خاوترین زانیارییە سەرەتاییەکان هەڵیدەهێنجێت و ئامادەی دەکات. ئەو زانیارییانە رەنگە لە وتوویژەکان دەرکەویت، یان بە ڕێکوپێک کردنی بەڵگەنامەکان و ئاماژەکانیتر وەدەستبێت. زۆرجار ئاکام و دەسکەوتە سەرەکییەکان لە ڕێگای دۆزینەوەی رەوتەکان و لێکگرێدانی پێوەندییەکانەوە وەدەستدێت کە تا ئەو کاتە هیچکەس سەرنجی پێنەداون. هێندێکجار هەواڵنێر هەست بە هەڵە یان کەمتەرخەمی لە شوێنێک لە کۆمەڵگا دەکات، بەڵام ناتوانێ زانیاری پێویست لەو بارەوە وەدەستبێنێت، واتە لە لایەن ناوەند، یان کەسانێک هەستی هەڵە و کەمتەرخەمی بە هەواڵنێر دەگات، لێرەدایە کە کۆکردنەوەی بەڵگەنامە و زانیاری پتر دێتە گۆڕێ. بێگومان ئەو پرۆسەیە لەچاو راپۆرتە ئاساییەکان، پێویستی بە هەڵسەنگاندن، کاتی زۆرتر و کۆششی بەربڵاوتر هەیە. هەروەها هێندێکجار پێویستە زیاتر لە یەک کەس بەشداری لەو پرۆسەیەدا بکات. دیارە بەو مەرجەی کە بابەتەکە بۆ خوێنەران سەرنجراکێش و دڵڕفین بێت.

لە پرۆسەی بڵاو کردنەوەی زانیارییەکاندا، هەمیشە کەسانێک هەن کە کۆسپ و تەگەرە دەخەنە سەر ڕێگای هەواڵنێر و زۆربەی راپۆرتەکان و هەواڵنێران لەگەڵ ئەو گیروگرفتە ڕووبەڕوون.

بەپێی پێناسەیەک، هەواڵ بریتییە لە پەیامێک کە کەسێک رازی نییە بڵاو بکرێتەوە بەهەر حاڵ، لە کاری ئاسایی ئامادەکردنی راپۆرتە رۆژانەییەکاندا هەواڵنێر دەگاتە شوێنێک کە بەپێی ئەو زانیارییانەی وەدەستکەوتوون، راپۆرتەکە ڕێکوپێک و ئامادەی بڵاوکردنەوەی دەکات، بەڵام راپۆرتی پەیگیرانە لەو شوێنەوە دەستپێدەکات کە راپۆرتی ئاسایی کۆتایی دێت. ئەو راپۆرتە بە هۆی نهێنیکاری، وەڵامنەدانەوەی بەرپرسانی فەرمی و کۆسپ و



تەگەرەکانیتر، کۆتایی نایەت، بەڵکۆ پەیگیرانە درێژە بە کاری خۆی دەدات و ڕێگا چارە دەدۆزێتەوە.

راپۆرتی پەیگیرانە بەگشتی، سەبارەت بە تەواوی تەوەر و بابەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کارایی هەیە و لە دوو بواردا بێ وێنە، سەرەکی و بەتایبەت کاراترە:

یەکەم، چالاکی، یان گۆڕەپانی کاری ئەو بنکانەی لە شوێنە پەرت و دوورەکان یان دوور لە چاوەدێری خەڵکدا ئەنجام دەدرێن.

دووهەم، ئەو کەسانە یان ئەو بنکانەی کتوپڕ دەکەونە ناوەندی سەرنج و باسی گشتی، یان لە شوێنێکی نادیارەوە سەرهەڵدەدەن، یان ئەو کەسانەی ئەفسانە و دەنگۆ دەخەنە سەر زمانی خەڵک. ئەمانە کەسانێکن کە رەنگە هیچ پێشینەیەکیان نەبێت، بەڵام ئەگەر خاوەنی بن، داستان و بەسەرهاتێکی سەرنجراکێش و گرنگ لە ئاو دەردێت.

کۆمپانیا و بنکە ماڵییەکان (بەتایبەت ئەگەر لە چەشنی ئەوانە بن کە خێرا دەبنە خاوەنی سامانی زۆر. هەمیشە گۆڕەپانێکی بەرچاون بۆ لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانان. ئەگەر هەواڵنێر سەرنج بداتە ئەو بنکە ماڵییانەی کە بە تازەیی ناوبانگیان دەرکردووە، بێگومان دەسکەوتێکی شایان وەگیردەخات.

بنکەی ماڵی پێرامید لە رومانیا لە سەرەتاکانی دەیەی ٩٠دا، نموونەیەکی لەدەستچووی رۆژنامەکان و میدیاکانە، چونکە بێ ئەوەی سەرنجی هەواڵنێران و بیروڕای گشتی بۆ لای خۆی راکێشێت، توانی پارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵکی داماو کۆبکاتەوە.

نموونەیەکیتر داستانی "چارلز پۆنزی"یە کە حەزی دەکرد بە "سوڵتان پۆنزی" ناوی بەرن.

پتر لە ٤٠ هەزار ئەمریکایی باوەڕیان پێهێنا و هەرچی پارەیان هەبوو خستیانە ناو بنکە ماڵییەکەی، بەو هیوایەی کە پاش ٣ مانگ، یەک دۆلار دەبێتە دوو دۆلار و نیو. سەرەڕای ئاگادارکردنەوەی خەڵک لە لایەن پسپۆڕانی ئابوورییەوە کە ئەو بەڵێنییە لە توانای هیچ کەسدا نییە، لە ساڵی ١٩٢٠دا، "پۆنزی" توانی لە یەک رۆژدا ٢٠٠ هەزار دۆلار کۆبکاتەوە و لە

ماوەی ١٨ مانگدا ببێتە خاوەن ١٥ میلیون دۆلار. فێڵبازی "پۆنزی" لەسەر بنەمای جیاوازی نرخی پارە نێو نەتەوەییەکان بوو لە بازارەکانی جیهاندا. بنکە ماڵییەکەی، بە هۆی قەیرانی ماڵی لە ئەوروپا، دۆلاری ئەمریکی لە ئوروپا بە گرانتر دەفرۆشتەوە.

هێرشی خەڵک بۆ وەدەستهێنانی پارەی زۆرتر رووی لە زیاد بوون دەکرد، لە راستیشدا بە هۆی ئەو هێرشە بەربڵاوە، پۆنزی دەیتوانی قازانجی ٩٠ رۆژەی داخوازە کۆنەکان بداتەوە و هەر ئەوەش (دیارە بە پروپاگەندەیەکی یەکجار زۆر) هێرشی خەڵکی پتر دەکرد، بەڵام ئەو رەوتە تا کەی دەیتوانی درێژەی هەبێت و قازانجی ٢/٥ قاتی لە ماوەی ٩٠ رۆژدا لەگەڵ سەرمایەکە تا کەی دوادەکەوێت؟ سەرئەنجام هەواڵنێری رۆژنامەی "بۆستۆن پۆست" سەبارەت بە پێشینەی "سوڵتان پۆنزی"، دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد: پۆلیسی کەنەدا، "پۆنزی" باش دەناسی. ئەو، بە تاوانی دزی ماوەیەک کەوتبووە زیندانی کەنەدا. پاشان بۆ هەواڵنێر دەرکەوت کە لە ویلایەتی "ئاتلانتا"ش بە تاوانی قاچاخ، پۆنزی زیندانی کراوە. کۆمپانیای "پۆنزی" لێک بڵاو بوو و خۆشی بۆ ماوەی ٤ ساڵ کەوتە زیندان.

**کارزانی لە راپۆرتی پەیگیرانە دا**

هەر هەواڵنێرێک دەتوانێت بۆ نووسینی راپۆرتی پەیگیرانە تێکۆشێت، بەڵام بە مەرجێک لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ تەنگوچەڵەمەکان نەسڵەمێتەوە. بۆ نووسینی راپۆرتی پەیگیرانە کارزانییەکی تایبەتی پێویست نییە، تەنیا هێندێک تێبینی هەیە کە کار بۆ راپۆرتەوان ئاسانتر و ئاکامی بەرهەمەکەی باشتر و رێکوپێکتر دەکات.

**زانیاری لەسەر یاسا**

بۆ ئامادە کردنی راپۆرتی پەیگیرانە، زانیاری هەواڵنێر سەبارەت بە کۆسپەکان و هەروەها ئاسانکارییە یاساییەکان بۆ وەدەستهێنانی زانیاری، زۆر گرنگە. پێویستە هەواڵنێر زانیاری لەسەر تایبەتمەندییەکانی یاسای وڵاتی خۆی هەبێت و ئاستی یاسایی ئەو بەڵگەنامە و زانیارییانەی لەدوایان دەگەڕێت،لای



روون بن. هێندێک زانیاری و بەڵگەنامە لەباری یاساییەوە دەکەونە خانەی نهێنییەکانی وڵات و رۆژنامەوان بۆی نییە دەستی کەوێت و بڵاوی بکاتەوە. زۆربەی فەرمانگەکانی دەوڵەت رازی نابن بە بڵاوکردنەوەی زانیاری ئارشیفەکان و تەنانەت لە درکاندنی بوونی ئەو زانیارییانەش خۆدەپارێزن و دەیان کۆسپ لە سەر رێگای هەواڵنێران بۆ وەدەستهێنانی، دەرەخسێنن. زانیارییەکان لە لای کەسانی تایبەت و شوێنی نهێنی دەپارێزن.

هەواڵنێرێک لە بەریتانیا بەدەرفەت لە ناو راپۆرتێکی فەرمیدا هەستی بە هەبوونی لیستێکی نهێنی لە ئارشیڤەکاندا کرد. لیستی ناونیشانی زەوی‌وزاری تایبەتی کە ماوەیەکی دووروودرێژ بە لایەنە ساماندارەکان دەبەخشرا و بە پێی برگەیەکی یاسایی لە باجی دەوڵەتی پارێزرابوون. بەرپرسانی دەوڵەت(بە هۆی پێداگرتنیان لەسەر یاسایی‌بوونی ئەو بڕیارە) رازی نەبوون بە بڵاو کردنەوەی لیستەکە.

ئەو هەواڵنێرە کە بوونی لیستەکەی بۆ دەرکەوتبوو، هەوڵیدا بۆ وەدەستهێنانی و بڵاو کردنەوەی لە رێگای یاساییەوە. ماوەیەکی زۆری لە کاتی خۆی بۆ ئەو کێشەیە تەرخان کرد و لە ئاکامدا نەتەنیا سەبارەت بە کۆسپ و تەگەرەکانی وەدەست کەوتنی لیستەکە، راپۆرتێکی بڵاو کردەوە، بەڵکو راپۆرتێکی‌تری لەبارەی رێکەوتنی دەوڵەت لەگەل خاوەن موڵکەکان و بەخشینی تایبەتی لە باج، بۆ بیرورای گشتی بڵاوکردەوە. دیارە بڵاوکردنەوەی ئەو راپۆرتە بە بێ کۆشش و پەیگیری و دۆزینەوەی رێگا یاساییەکان، بەئەنجام نەدەگەیشت.

هێندێک لە وڵاتانی جیهان خاوەن یاسای زۆر توندوتیژن بۆ پاراستی زانیارییەکان، بەڵام لە زۆربەی وڵاتانیتر بە هۆی پشتگیری یاسایی لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان، دەرفەتی وەدەستهێنانیان هەیە و دەرگای ئارشیفخانەکانی بەڵگەنامە و زانیارییەکان بۆ رۆژنامەوانان و خەڵک ئاوەڵایە. بەڵام هێندێک لە خەڵک ئاگاداری ئەو بەڵگەنامانە نین و ژمارەیەکی کەمتریان، وەدەستی دێنن. لێرەدایە کە نەخشی رۆژنامەوان بۆ

وەدەستهێنانی ئەو زانیارییانە و ئاگاداركردنەوەی بیروڕای گشتی زۆر بەرجەستە دەبێتەوە.

بۆ نموونە: کارەساتە بڵاونەکراوەکانی وێستگە ناووکییەکان، بەکارهێنانی تیشکی X بۆ چارەسەری نەخۆشی شێرپەنجە کە هێندێک جار ٢٥ تا ٣٥ پلە، لە سنووری مەودادار تێدەپەڕێت(پاش ئەو راپۆرتە پلەی ئەو تیشکە تا رادەیەکی یەکجار زۆر کەمکراوە). یان کردەوەی بەرپرسانی پاراستنی ناوەندە تایبەتییە سەربازییەکان کە دەیان تاوانی ئاشکرانەکراویان لەدژی سیاسەتی بەرگری نیشتمان لێکەوتووەتەوە و بڵاونەکراونەتەوە، یان بەرهەمهێنانی ئەو داوودەرمانانەی کە لە ژنانی دووگیاندا بوونە هۆی زیانی هەمیشەیی و چارەنەکراو لە مێشکی منداڵانیاندا و ...

ڕۆژنامەیەک لە "لۆییزویل"ی کۆنتاکی، بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی فەرمی و دەوڵەتی، راپۆرتێکی لەبارەی کارپێکردنی منداڵان لە ناوەندەکانی بەخێوکردنی منداڵاندا بڵاوکردەوە کە بوو بە هۆی داخستنی ژمارەیەکی زۆر لەو ناوەندانە و سزادانی بەرپرسانی.

بڵاوبوونەوەی راپۆرت سەبارەت بە هەڵسوکەوتی سەربازانی ئەمریکی لە زیندانی "ئەبو غرێب"، داخستنی ئەو بەندیخانەیەی لێکەوتەوە.

### تەوەری راپۆرتی پەیگیرانە

تەوەری راپۆرتی پەیگیرانە لە ڕێگای جۆراجۆرەوە دەگاتە نووسینگەی ڕۆژنامە. لە پێوەندی یەکێک لە سەرچاوەکان، لە دیدارێکی بەهەڵکەوتدا، لە هەواڵێکی زۆر سەرەتایی یان لە ئاگادارییەکی چاپکراو کە دەکرێ زانیاری پتری لێدەسکەوێت، لە تێبینی راستەوخۆی هەواڵنێر، لە هەواڵێکی بەردەوام و گۆڕانکارییەکانی داهاتووی، لە وەڵامی بێ‌مانا و باوەڕپێنەکراوی کەس، بەرپرس یان ناوەندێک بە پرسیاری هەواڵنێر و یان لەو پرسیار و وەڵامانەی کە سەبارەت بە ڕووداوێک لە زەینی هەواڵنێردا سازدەبێت.

نموونەیەکی بەرچاو بۆ راپۆرتی پەیگیرانە ئەو بابەتەیە کە دواتر بە "واترگەیت" ناوبانگی دەرکرد. سەرەتای ڕووداوەکە لە مانگی ژوونی ساڵی



١٩٧٢دا و پاش کردەوەیەکی لە رادەی خۆیدا بچووکی نایاسایی لە نووسینگەی ناوەندی پارتی دیموکرات لە واشینگتۆنەوە دەستی پێکرد. کاتێک پاش دوو ساڵ ڕووداوەکە کۆتایی پێهات، بەهێزترین کەسایەتی سیاسی ئەمریکا، واتە "ریچارد نیکسۆن"، سەرکۆماری ئەمریکا، دەستی لەکار کێشاوە و دەیان کەسایەتی پایە بەرز لە ئاستە جۆراجۆرەکانی سیاسەتی ئەو وڵاتەش دووچاری هەمان چارەنووس بوون. نیکسۆن و هاوکارانی بە تاوانی "بەزاندنی سنووری موڵکی کەسانیتر" و دەیان تاوانیتر (تۆمارکردنی وتووێژە تەلەفۆنییەکان، خەرجکردنی پارەیەکی لەڕادە بەدەر و گرنگتر لە هەمووان، شاردنەوەی ئەو کردەوانە لە خەڵک) سزا دران، لە کۆتاییشدا خەڵکانێکی کەم بیریان لەوە کردەوە کە تەواوی ئەو ڕووداونە لە ئاکامی راپۆرتێکی پەیگیراندا ئاشکرا بوو.

"کارڵ برێنشتاین" و "باب وود وارد" دوو هەواڵنێری ڕۆژنامەی واشینگتۆن پۆست ئەو کارە گرنگەیان لە ئەستو گرتبوو. کاتێک راپۆرتەکەیان دەستپێکرد، ڕووداوەکە کێشەیەکی بچوک و لاوەکی بوو. ٥ کەس لە کاتی دامەزراندنی کەرەسەی "گوێڕاگرتن" لە بنکەی ناوەندی پارتی دیمۆکراتدا، دەستگیر دەکرێن. "باب وود وارد" لە سەردانی دادگای ئەو ٥ کەسە، بۆی دەرکەوت کە پارێزەرێکی بەناوبانگ پارێزەری تاونبارانی لە ئەستو گرتووە، واتە کێشەکە لای پارێزەرەکە زۆر گرنگتر بوو لەوەی دەبیندرا. پرسیار ئەوە بوو، بۆ ئەو پارێزەرە؟

"باب وود وارد" پاش هێندێک لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوت کە زۆربەی تاوانباران لە CIAدا خزمەتدەکەن و لە کاتی دەستگیر بوونیاندا برێکی بەرچاویان پارە لێگیراوە و لە ناو کەلوپەلەکانیاندا دەفتەرێکی تەلەفۆن وەدەستکەوتووە کە ژمارەکانی کۆشکی سپی تێدایە.

بە تێبینی لەسەر ئەو چەند زانیارییە کەم گرنگانە، بەڵام شایانی پەیگیری، دوو هەواڵنێر تێکۆشانێکی دوو ساڵەی بێ وچانیان دەسپێکرد و لە ئاکامدا سەرکەوتنیان وەدەستهێنا.

دوو هەواڵنێر، لە کاتی ئامادەکردنی راپۆرتەکە بە دەیان جار کەوتنە ژێر هەڕەشە و تەنانەت خاوەنی رۆژنامەکەش کەوتە دژایەتی کردنییان. بەڵام ئەوان دەستیان هەڵنەگرت و سەدان کیلۆمەتر رێگایان بڕی و هەزاران بەڵگەنامە و زانیاریان کۆکردەوە و لەگەڵ سەدان کەس، ئەگەر تەنانەت هێندێک زانیاریان هەبووایە، وتووێژیان کرد و پارەیەکی یەکجار زۆریان خەرجکرد.

"برێنشتاین" و "وود وارد" رووداوی ئەو راپۆرتە پەیگیرانەیان لە کتێبی "پیاوەکانی سەرکۆمار" لە چاپدا، هەروەها پاشان فیلمێکی لێسازکرا.

## دۆزینەوە و کۆکردنەوە

ئاکامی بەدواداچوونەکان، بە هەر شێوەیەک وەدەستهاتبێت، بەڵگەنامەن کە لە کۆتایی تێکۆشاندا، هەرگیز نابێت فڕێ درێن.

روون نییە کە رێژە، لیست، ئارشیڤ، دیسک و سی دی، وێنە، وتووێژ و دەستنووس و تۆمارکراوەکان و دەیان و سەدان بەڵگە و نووسراوەی بەکار هاتوو بۆ هەواڵنێر، پاش بەکار هێنانییان کەی دیسان پێویست دەبن. لەوانەیە هەفتەیەک، چەند مانگ یان چەند ساڵ پاش ئامادەکردنی راپۆرتێک، دیسان بۆ راپۆرتێکیتر پێویستمان بە هەمان زانیاری و بەڵگەنامە هەبێت. "برێنشتاین" و "وود وارد" لە کۆتایی راپۆرتەکەیاندا دوو گەنجەی پڕ لە بەڵگەنامە، نووسراوە و کەلوپەلیتریان لە نووسینگەی رۆژنامەدا جێهێشت.

## دەقی تەواوی وتووێژ بنووسە و بیپارێزە

لەوانەیە بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێک، چەند وتووێژێک پێویست بێت. هێندێک لەو وتووێژانە لە راپۆرتەکەدا ئاماژەیان پێدەکرێت و ئەوانیتر وەلا دەنرێن. کاری باش ئەوەیە کە تەواوی وتووێژی تۆمارکراو بە نووسراوە ئامادە بکرێت و وەک بۆ چاپ ئامادەی دەکەین رێکوپێکی بکەین. گرنگی ئەو کارە لەوەدایە کە لە پێداچوونەوەی وتووێژەکاندا، بەردەوام لایەنی تازە و هەستپێنەکراو دەدۆزرێتەوە. وەدەستهێنانی زانیاری لە بەڵگەنامەکان و



نووسراوە رێکوپێک کراوەکاندا و بەتایبەتی تایپکراو، خێراتر و ساکارترە. هەروەها بۆ کەڵک لێ وەرگرتنی وەک سەرچاوە گرنگی تایبەتی هەیە.

دیارە لە رۆژگاری کۆمپیوتەردا بەشێک لەم ئەرکە ئاسانتر دەبێتەوە. دانانی ژمارەی تایبەت بۆ هەواڵ و زانیارییەکان، تۆمارکردنیان لە کۆمپیوتەر و سیدی ناونیشاندار دا، یارمەتی دەدرێن بۆ رێک و پێکی لەکارەکاندا.

## پشتیوانی پیشەیی

پێویستە سەرنووسەر و بەرپرسانی رۆژنامە و میدیاکان، تەواوی دەزگاکەیان بۆ پشتیوانی و سەرکەوتنی ئەو پروژانەی بە شێوەی راپۆرتی پەیگیرانە ئەنجامدەدرێن، وەگەڕ بخەن. پێویستە بەرپرسان هەست بەوە بکەن کە هەواڵنێر ئەرکێکی دووروودرێژی لەسەر شانە، تەنانەت ئەگەر راپۆرتیشی لێنەکەوێتەوە. پەلەکردن بۆ بڵاوکردنەوەی ئاکامی پەیگیرییەکان، پێش گەیشتن بە تەواوی ئاکامەکان بە بیانووی نەبوونی پارە و کات، رەنگە هەواڵنێر تووشی گیروگرفت بکات و لە لایەکیترەوە رۆژنامەش لە وەدەست هێنانی راپۆرتێکی بێوێنە ناکام بکات. راپۆرت کاتێک شایانی چاپە کە هیچ کەموکوڕی نەمابێت.

لە سەرەتای دەستپێکردندا، پێویستە هەواڵنێر و بەرپرسانی راپۆرت روونیبکەنەوە، مەبەست زنجیرە راپۆرتە یان راپۆرتێکی تێروتەسەلە کە تەنیا پاش تەواوبوونی پەیگیری و لێکۆڵینەوەکان، چاپدەکرێت. بەهەرحاڵ، دەبێت کاتێک بۆ ئامادەکردنی راپۆرت دابین بکرێت.

رەوا نییە کە هەواڵنێر بۆ بەدواچوونەوەی سەرەتایی، داوای چەند مانگ کات بکات و پاشان نێوبەنێو کاتەکە بە هەفتە درێژ بکاتەوە. رەنگە درێژەدان بە ئامادەکردنی راپۆرت، ببێتە هۆی ئاشکرا بوونی تەوەرەی راپۆرتەکە و هەواڵنێرانیتر ئاگا بکات و بابەتەکە بقۆزنەوە.

## کارکردن بە نهێنی

لە كاتی ئامادەكردنی راپۆرتدا زۆر مەترسیدارە، هەواڵنێر خۆی ئاشكرا نەكات، مەگەر بۆ رۆژنامەوانە پڕ ئەزموونەكان یان بە كەڵك وەرگرتن لە راوێژكارە كاراكان نەبێت. ئامادەكردنی راپۆرت بەو شێوەیە(ئەگەر شایستە بێت) زۆر كات هەڵگرە و ئاشكرا نەكردنی پێناسە، رەنگە بۆ هەواڵنێر گیروگرفتێكی مەزن ساز بكات و هێندێكجار مەترسی گیانیشی لێدەكەوێتەوە. ئەو كارە وەك چوونە ناو بەرەی شەڕە بە پێناسەی ساختە. كەمترین زیانی ئەو كەمتەرخەمیە لەدەستدانی پێناسەی هەواڵنێرییە. تەنانەت رەنگە دەزگای راگەیاندنەكەش بەرپرسیارەتی لەئەستۆ نەگرێت. نهێنی راگرتنی پێناسە، هەم بۆ هەواڵنێر و هەم بۆ راپۆرتەكە جێگای مەترسییە. بۆ وەدەستهێنانی زانیاری هەمیشە رێوشوێنی باشتر هەیە.

لە پلەی یەكەمدا ئەوە بە فریوكاری دەژمێردرێت. بۆ نموونە ئەگەر راپۆرتەكە سەبارەت بە تاوانكارییەكان بێت، لایەنی تاوانكار دەتوانێت راپۆرتوانەكەش بە تاوانكار دابنێت.

دووهەم، ئەگەر راپۆرت لەبارەی دەستەی تیرۆریست و قاچاغچییەكان بێت، لەوانەیە هەواڵنێریش وەك هاوكاری ئەوان بژمێردرێت.

سێیەم، مەترسی گیانی هەیە. لەوانەیە هەواڵنێر لەبەر مەترسی گیانی، پێناسەی خۆی ئاشكرا نەكات، بەڵام پاش بڵاو بوونەوەی راپۆرتەكەش هەمیشە ئەگەری تۆڵەستاندنەوە هەیە. باشترین چارە ئاگادار كردنەوەی سەرنووسەر و بەرپرسانی رۆژنامەیە لەو مەتەرسیانە تا بزانن ئەو مەترسیە لە لایەن چ كەسانێكەوەیە.

هەڵەی مەترسیداری‌تر كاتێك روودەدات كە هەواڵنێر گومان لە كردەوەی ئاسایی بنكەیەكی ماڵی دەكات و وەك كڕیار یان فرۆشیار دەكەوێتە سەودا كردن لەگەڵ ئەو لایەنانە، سەرەڕای خێرا دەركەوتنی فێڵبازی هەواڵنێر بۆ لایەنە گومانلێكراوەكە بە هۆی ئەزموونی لەمێژینەیان، هەواڵنێر دەكەوێتە ناو بازنەیەكی نایاساییەوە كە بە پێی یاسا وەك تاوانكار مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت.

نموونەیەكی بەرچاو لەو بارەیەوە لە ساڵی ١٩٩٤دا روویدا، كاتێك دەنگۆی سەودا كردن بە "پلۆتۆنیۆم" بۆ چەكی ناووكی لە بازاڕی رەشی



ئاڵمانیا، بڵاوكرایەوە. دەگوترا كە ئەو كاڵایە لە رووسیاوە دێت، بەڵام هەرگیز كەس نەیتوانی ئەوە بسەلمێنێت. دەیان هەواڵنێر بە پێناسەی راست و ناڕاست و هێندێكیان بە ناوی كڕیار و هێندێك بە ناوی فرۆشیار، روویان كردە ئەو بازاڕە تا لە كەینوبەینی ئەو كێشەیە بكۆڵنەوە. لە ئاكامدا دەیان راپۆرتی پەیگیرانە ئامادە كرا كە لە كڕین و فرۆشتنی چەك دەدوان، بەڵام هیچ زانیارییەكی تێدا نەبوو و تەنیا بۆ فریودانی خەڵك و رۆژنامە و لە راستیشدا گەمەی ناو خۆیان بوو.

### پێداگری

لە هەر راپۆرتێكی پەیگیرانەدا، پێداگری و سووربوونی هەواڵنێر بۆ وەدەستهێنانی زانیاری، نەخشی سەرەكی و تایبەتی دەگێڕێت. لە نموونەی "واتر گەیت"دا بۆ وەدەستهێنانی بەڵگەیەك یان زانیارییەكی بچووك، "برێنشتاین" و "وود وارد" رۆژان و مانگان چاوەڕوانیان دەكرد، بەڵام لە پێداگری و سووربوون وازیان نەهێنا. ساتی دورودرێژ، دەیان كەسیان دەخستە ژێر چاوەدێرییەوە و دەیان رۆژ خەریكی راوێژ دەبوون لەگەڵ پارێزەران و پسپۆڕان رۆژانە دەیان پێوەندی تەلەفۆنیان دەكرد و بێ لێكۆڵینەوە وازیان لە بچووكترین بەڵگە نەدەهێنا.

لە ناو بەڵگەنامەكاندا لیستێكی ١٠٠ كەسیان وەدەستكەوت لەو كەسانەی كە كاتی هەڵبژاردنەكانی سەركۆماری بۆ "نیكسۆن" كاریان كردبوو و هێندێكیان گومانلێكراو بوون بە دەستێوەردانیان لەو هەڵبژارنانەدا. بە هۆی نەڕەخسانی دیدار لە شوێنی كاركردنییاندا، ناچار دەبوون لە رۆژانی پشووی كۆتایی هەفتەدا و لە رێگای تەلەفۆنەوە، لە ماڵەوە پێوەندییان پێوە بكەن. بێگومان هەواڵنێری كەم تاقەت و بێحەوسەلە بە یەكەم كۆسپ و "نە" و نابێت" و "رێگامان نادەن"، دەست هەڵدەگرێت و بەناتەواوی واز لە كارەكەی دێنێت. ئەو چەشنە وازهێنانە دوو كاردانەوەی لێدەكەوێتەوە: یەكەم، دەبێتە هۆی لەدەستدانی كات و بەفیڕۆدانی دەستكەوتەكان و دووهەم كە رەنگە لەوەش گرنگتر بێت، ئامادەكردنی راپۆرتێكە بێ ئاماژەكردن بە زانیاری و بەڵگەنامە

پێویستەکان کە وەدەستهێنانیان زۆرجار بۆ هەواڵنێر و رۆژنامە، کێشەی مەزنی لێدەکەوێتەوە.

### تازەکردنەوەی وتووێژەکان

تا کاتێک تێکۆشان بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێکی پەیگیرانە بەردەوامە، سەرچاوەیەکی بەکەڵکتر لەو کەسانەی پێشتر وتووێژیان لەگەڵ کراوە، نادۆزرێتەوە. زۆرجار کەسانێک کە لە تەوەری راپۆرتی پەیگیرانەدا وتووێژیان لەگەڵ کراوە، لایەنی تازە و نەگوترایان وەبیر دێتەوە یان لە ئاشکرا نەکردنی هێندێک زانیاری پەشیمان دەبنەوە یان سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی تازە لە رەوتی رووداوەکاندا، هێندێک زانیاری تازە وەدەست دێنن، بۆیە پێویست دەکات دیسان هەواڵنێر چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانە دووپات بکاتەوە و لە رێگای تەلەفۆنەوە پێوەندیان پێوە بکات، جاریوا هەیە رێژەی ئەو تەلەفۆنانە دەگاتە ١٠٠.

هەر کام لە "برێنشتاین" و "وود وارد"، لیستەیەکی ژمارە تەلەفۆنی دوورودرێژیان هەبوو و بە لانی کەم دوو جار لە هەفتەدا پێوەندییان پێوەدەکردن و تەنانەت ئەو پێوەندییە لەگەڵ هێندێک کەس، یەک ساڵ درێژەی دەکێشا.

### سەرچاوە بەراستی ئاگادارەکان

"وود وارد" لە ماوەی بەدواداچوونەوەی رووداوی "واتر گەیت"دا لەگەڵ بەرپرسێکی پایەبەرزی کابینەی "نیکسۆن" پێوەندی سازکردبوو و پرسیاری وردەکارییەکانی ئەو کردەوە نایاساییەی لێدەکرد، "وود وارد" لەو رێگایەوە توانی سەرەداوی زۆربەی کێشەکان بدۆزێتەوە. ئەو بەرپرسە، زانیارییەکی یەکجار زۆری سەبارەت بەو کێشەیە هەبوو و بەراستی بۆ روونکردنەوە و ئاشکراکردنی تاوانبارانی کێشەکە یارمەتی "وود وارد"ی دەدا.

بەڵام بۆ ئاشکرا نەبوونی خۆی وەک سەرچاوەی ئەو زانیارییانەی بڵاو دەبوونەوە و هەروەها مەترسی لەدەستدانی پلەوپایەکەی، سەرچاوەی تری



پێدەناساندن تا لەوانەوە زانیاری پێویست وەربگرن و بەمەرجێک هاوکاری لەگەڵ ئەو دوو هەواڵنێرە دەستپێکرد کە تەنیا ئاراستەی راستەقینەی لێکۆڵینەوەکە دیارییکات و لێدوانەکانی بە ئاماژەی کەسێکیتر بڵاو بێتەوە.

ئەو بەرپرسە، خۆی کات وساتی دیدارەکانی لەگەڵ "وود وارد" بەتەنیایی و لە پارکینگێکی ژێرزەوینی دیاریدەکرد. بەو جۆرە ئەو هاوکارییە بەردەوام بوو. دیارە "برێنشتاین" و "وود وارد"یش بەڵێنەکانیان بردە سەر.

ئەو بەرپرسە هەرگیز خۆی ئاشکرا نەکرد، بەرپرسێکی رۆژنامەی واشینگتۆن پۆست، بە "بنە دەنگ" ناوی دەبرد. "برێنشتاین" و "وود وارد" تا ئەمڕۆش ئەو نهێنییەیان ئاشکرا نەکردووە.

زۆربەی هەواڵنێرە تێکۆشەرەکان، سەرچاوەیەکی وەک "بنە دەنگ"یان هەیە. بە پێی یاسای زۆربەی وڵاتانی جیهان، میدیاکان لەسەریان نییە سەرچاوەی زانیارییەکانی خۆیان ئاشکرا بکەن.

مەرجی گرنگ و سەرەکی ئەو سەرچاوانە، ئاشکرا نەبوونیانە و پێویستە هەواڵنێر رەچاوی بکات و بە پێی تێبینییەکانیان کاربکات، هەڵبەت ئەوە بە مانای چوونە ژێر باری هەر مەرجێکیش نییە.

تەواوی رۆژنامەوانان پێویستییان بە سەرچاوەی ئاگادار هەیە و تەنانەت ئەو پێویستییە بۆ راپۆرتی پەیگیرانە سەرەکیترە. زانیاری سەرچاوە، ئەگەر لایەنە لاوەکییەکانی کێشەیەکیش بگرێتەوە، دیسان وەک یارمەتی دەژمێردرێت. کەسانێک وەک بەرپرسانی پۆلیسی هاتوچۆ، هەواڵگری، هەواڵنێری، یاسا ناسان و راوێژکاران و .. وەکو سەرچاوەی رۆژنامەوانی هەژمار دەکرێن.

کەسانی ئاگادار یا پەیوەندیدار (Contacts) کەسانی بەرپرسن کە رۆژنامەوانان لە تەوەری کاری هەواڵنێری و ئامادەکردنی راپۆرتەکانی رۆژانەیاندا پێوەندییان پێوەدەکەن و بە یەکەوە کار دەکەن و ئەو کەسانە بە سەرچاوەی گرنگی وەدەستهێنانی زانیاری بۆ هەواڵنێران دەژمێردرێن.

### کتێبخانەکانی کامپیوتری و ئینتێرنێتی

زۆربەی ئاگادارییەکان، بەڵگەنامەکان و بەشێکی یەکجار زۆر زانیاری، بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ئارشیڤ و بانکی زانیاری و کتێبخانەکانی کامپیوتەریدا دەپارێزرێت. بەربڵاوبوونەوەی ئەو پرۆسەیە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا هێدی هێدی دەبێتە هۆی پێکهاتنی راپۆرتوانی پەیگیرانەی کامپیوتری.

**مەترسییەکانی راپۆرتی پەیگیرانە**

لە زۆربەی وڵاتانی ئۆروپایی و ئامریکاییدا، بە شێوەیەکی ئاسایی مەترسییەک لەسەر هەواڵنێرانی راپۆرتی پەیگیرانە نییە، مەگەر هێندک کۆسپ و تەگەرەی لاوەکی نەبێت. بەڵام تەرخانکردنی کات و ساتی دوور ودرێژ بۆ دۆزینەوەی ژمارەیەک، بەڵگەیەک، یان سەرەتایەکی کێشەکە لەنێوان هەزاران ژمارە و بەڵگەنامە و کتێب و نووسراودا، تێپەڕ کردنی رۆژ و هێندکجار مانگ بۆ خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی یارمەتییەکی بەرچاویش نین بۆ روونکردنەوە، پێش ئەوەی دڵکێش بێت، گیان کێشە. وەلێ کێشەکە لە هێندێک لە وڵاتانیتر دژوارتر و تەنانەت مەترسیدارترە.

لە رووسیا، "دیمیتری خۆلۆدوڤ" هەواڵنێری رۆژنامەی "ماسکوڤسکایا کامسامۆڵێتس" راپۆرتێکی سەبارەت بە گەندەڵی لە ناو سوپا، ئامادە دەکرد. لە پاییزی ١٩٩٤دا، چەند بەرپرسێکی نەناسراو پێوەندی پێوە دەکەن و پێی رادەگەیەنن کە بەستەیەک زانیاری و بەڵگەنامە بە شەمەندەفەر بۆ رەوانەی دەکەن و ئەگەر دەخوازێ لە وێستگەی کازان لە مۆسکۆ دەتوانێت هەڵیبگرێت. "خۆلۆدوڤ" دەچێت بۆ ویستگە و بەستەکە وەردەگرێت و دەگەرێتەوە نووسینگەی رۆژنامە. بەستەکە دەکاتەوە و لەناکاو بۆمبێک دەتەقێتەوە و دەبێتە هۆی کوشتنی. نە ئەو بەرپرسانە و نە ئەو کەسانەی فەرمانی کوشتنیان دابوو و نە هۆی راستی ئەو تیرۆرە، هەرگیز ئاشکرا نەبوو.

خاتوو "جولیا پلوت نێکۆڤا"، راپۆرتنووسی راپۆرتی پەیگیرانەی رۆژنامەی "کاواک"ی مۆسکۆ، کت و پڕ لە ٢٤ ئاپریلی ١٩٩٢دا لە مۆسکۆ بێسەروشوێن دەبێت. پاش دوو رۆژ لاشەکەی لە دارستانێکی پەرتی ئەو شارە دۆزرایەوە لە حاڵێکدا کە پارە و خشڵەکەی دەست لێنەدرابوون. دواتر گوترا، بکوژەکەی



پێوەندی لەگەڵ باندێکی مافیایی هەبوو کە "جولیا" خەریکی ئامادە کردنی راپۆرتێک بوو لەسەریان.

لە هاوینی ساڵی ١٩٩٢ دا، "ئادۆلفو ئیسوزا ئورکیا" رۆژنامەوانی "پیرۆ"یی خەریکی ئامادە کردنی راپۆرتێکی پەیگیرانە بوو بۆ رۆژنامەی "ریپۆبلیکا"ی ئیتالیایی سەبارەت بە دابینکردن و بڵاوکردنەوەی مادەسڕکەرەکان. ئەو، لیستەیەکی لە تاوانباران وەدەستکەوت کە بە یارمەتی بەرپرسانی سوپا خەریکی قاچاغ بە مادە سڕکەرەکان بوون ئەو لە راپۆرتەکەیدا نووسیبووی: سوپا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریستان هەوڵ نادات، چونکە تیروریستەکان پێویستیان بە سەرچاوە داراییەکانی بازرگانیکردن بە مادەسڕکەرەکان هەیە. لە رۆژی ٢٧ ئاگوستی هەمان ساڵدا، تەرمی "ئورکیا" لە رووباری "هوالاگا" دۆزرایەوە کە شوێنی ئەشکەنجەی پێوە دیار بوو و لەت و پەت کرابوو.

لیستەی رۆژنامەوانانی کوژراو لە پێناو ئامادەکردنی راپۆرتی پەیگیرانە لە جیهان، تەنانەت لە چەند ساڵی رابردوودا، دەیان لاپەڕە دەگرێتەوە. بێگومان لەو وڵاتانەی تاوانکاران و رێکخراوە تیرۆریستییەکان بە شێوەیەکی بەربڵاو خۆیان داسەپاندووە، ئەو کوشتارانە زۆرترن و ئامادەکردنی راپۆرتی پەیگیرانەی جیدی، لەگەڵ مەترسی پتر رووبەڕوو دەبێتەوە.

## چەند تێبینییەک بۆ ڕێکوپێک کردنی راپۆرت

**• دەستپێکی باش، کۆتایی پەسەند**

بەرواڵەت، دەستپێکی باش و کۆتایی پەسند بۆ راپۆرتەهەواڵ یان بۆ راپۆرت نووسین کە بە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو ئامادە دەکرێت، شێوازێکی گونجاو نەبێت، بەڵام دەبێت بەئاشکرا بڵێین کە:

١- هێندێکجار بۆ راپۆرت نووسین، شێوازی هەرەمی بەرئاوەژوو کارا نییە و بەراستیش ناگونجێت.

٢- سەرەڕای ئەوەش، بە شێوازی هەرەمی بەئاوەژووش دەکرێت، دەستپێکی باش و کۆتایی پەسەند بەکار بێنین. واتە، لە سەرەتادا ناچارین لە لید وەک گرنگترین لایەنی راپۆرتەکە، کەڵک وەرگرین وەک دەسپێکی باش، و لە کۆتاییدا سەرنجی خوێنەر بۆ لایەنێکی دڵرفێن لە راپۆرتەکە راکێشین: کۆتایی پەسەند.

راپۆرتەوانی لێهاتوو بە پێی ئەزموونی خۆی و بەو شێوەیەی خوارووەوە، بە جوانی و ڕێکوپێکی "دەستپێکی باش و کۆتایی پەسەند" بۆ راپۆرت نووسین، بەکار دێنێت:

**• دووپات کردنەوەی بابەتی لید لە کۆتایی راپۆرتدا**

راپۆرتەوان بۆ وەبیر هێنانەوە، ئەو لایەنەی کە لە لید دا باسیدەکات، لە کۆتایی راپۆرتەکەدا دووپاتی دەکاتەوە.



وەک: هاوین وەرزی خۆ بەئاودادانە، هاوکاتیش وەرزی مەترسییەکانی ئاوە......

سەرەڕای ئەو مەترسیانە، ئایا کەس زاتی خۆبەئاو دادانی هەیە؟ (دێڕی کۆتایی راپۆرت)

**• پرسیار لە کۆتاییدا**

لە کۆتاییدا دەکرێ بەپرسیار، تەوەری راپۆرتەکە بۆ لایەنی نادیار و پێویست بە روونکردنەوە بکێشین. بۆ نموونە، راپۆرتی "رووخانی بینایەک"، بەو پرسیارە تەواو دەکەین:

...هیچکەس ئامادە نییە بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆ بگرێت. ئایا دەکرێ بڵێین کە لێقەوماوانی ئەو رووداوە خۆیان گوناهکارن؟

هەروەها بۆ تێکەڵاو کردنی خوێنەر لە تەوەری راپۆرتدا، لە کۆتاییدا دەکرێ ئەو پرسیارانەی ئاراستە بکەین:

ئێوەش لەگەڵ ئێمە هاوبیرن؟ ئەگەر ئێوە بوونایە، ئەو کارەتان نەدەکرد؟ ئێوە بکوژەکە دەبوورن؟ و ...

**• کوتایی چاوەڕوان نەکراو**

هێندێکجار راپۆرتەوان لە کۆتاییدا، ئاماژە بە لایەنی ناروون و سەرەکی یان پەیامێکی گورزدار یان ئاکامی سەرسوڕهێنەری راپۆرتەکەی دەکات. واتە لەو چەشنە راپۆرتانەدا، خوێنەر لە کۆتاییدا کلیلی راپۆرتەکە دەدۆزێتەوە.

بۆ نموونە راپۆرتێک لەسەر پشیلەیەکی بێدەست دەخوێنینەوە. پاش ئاماژە کردن بە شێوەی ژیانی ئەو گیانلەبەرە، سەرنجراکێشە ئەگەر لە کۆتایی راپۆرتەکەدا بزانین کێ ئەو پشیلەیە بەخێو دەکات:

..."سێ پێ"، بە هێمای خاوەنەکەی خۆ فرێدەداتە ناو ئۆتۆمبێلێکی سوور. هەمان ئۆتۆمبێل کە چوار مانگ پێش لەناکاو ئەو بەستەزمانەی کوتاندە قەدی دیواری شەقامەکە و پەلێکی قرتاند...

بەتایبەت ئەگەر "کۆتایی چاوەڕووان نەکراو" و دەسپێک، وێکبچن، کاردانەوەی راپۆرتەکە زۆرتر دەبێت.

هەر لەو نموونەیەدا، کۆتایی زۆر پەسەندتر دەبێت، ئەگەر لید بەو چەشنە بێت:

کاتێک پشیلە لە ئۆتۆمبیلە سوورەکە خۆی فڕێدەداتە سەر شۆستە، تازە دیار دەکەوێت کە ئەو بەستەزمانە پەلێکی نییە.

- **دوو یان چەند تەوەری هاوشان(پاڕالل)**

هێندێک لە راپۆرتەکان(وەک، راپۆرتی لێکۆڵینەوەکان، وەسفی، سەبارەت بە کەسایەتییەکان یان راپۆرتی شوێنەکان و راپۆرتی ئازاد) بە بەرجەستەکردنی دوو رەهەندی تەوەری راپۆرتەکە ئامادە دەکرێت. ئەو دوو رەهەندە، دوو لایەنی گرنگ و سەرنجراکێشی تەوەری راپۆرتەکەیە کە لە نێوان کۆی بابەتەکاندا هەڵدەبژێردرێت و لە سەرانسەری راپۆرتەکەدا بە کارزانی و رێکوپێکی بۆ خوێنەران شیدەکرێتەوە. لەوانەیە یەکیان لاوەکی، هەستیارانە و یان وەسفی و لایەنی دووهەم، سەرەکی بێت. بەهەرحاڵ، راپۆرتەوان لە گۆڕەپانی راپۆرتەکەدا ئەو دوو رەهەندە شانبەشانی یەکتر دەکاتەوە و لە کۆتاییشدا بەیەکەوەیان گرێدەداتەوە. بۆ نموونە، سەبارەت بە قەیرانی دەرمانە پێویستەکان و کەمبوونی لە بازاڕدا، راپۆرتێک ئامادە دەکەین. لە ناو زۆرێک لە دەسپێکەکان، ئەو دەسپێکەی خوارەوە هەڵدەبژێرین:

...لە نەخۆشخانەی تایبەت بە دڵی "..."، نەخۆشێکی تازە دوچاری وەستانی دڵ دەبێت و بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێت، بەرەنگاری لەگەڵ مەرگ دەکرد. پزیشک بۆ پێشگرتن لە مەترسی دەڵەمەبوونی خوێن کە لەپێشدا نەخۆشەکە دوچاری ببوو، داوای دەرمانی پێویستی دەکرد. چوار کەس لە خزمی نەخۆشەکە بۆ وەدەستهێنانی ئەو دەرمانە تایبەتە، بەدڵەڕاوکێ کەوتنە گەڕان لە ناو "بازاڕی رەشی" دەرمان. دەست و سەر و زگی نەخۆش دەیان لوولە و وایەر و ئامێری پێوەبوو. لە سەر سینگی سپی کاتژمێری هەڵواسراوی هۆدەکە، میلی بچووکی کاتژمێرەکە بە خێرایی دەخولایەوە...



راپۆڕتەوان، پاشان هاوشان لەگەڵ گەڕانی خزمەکانی نەخۆشەکە، باسی کەشوهەوای بازاڕی دەرمان دەکات. لێرەدا پێویستە تەواوی تایبەتمەندییە گرنگەکانی ئەو بازاڕە بخاتە بەرچاوی خوێنەر و...

...دکتۆر ئازاد، ماوەیەک پێشتر بە زیاد کردنی هێزی ئامێری تایبەت بە ترپەی دڵ، دواترین کۆششی خۆی بۆ رزگار کردنی نەخۆش بەکار هێنا. هاوسەری نەخۆشەکە چاوی لە سەر کاتژمێر هەڵنەدەگرت، بەڵام میلی بچووک نەیدەزانی ماندوویەتی چییەو بەردەوام دەخولایەوە. برازای نەخۆشەکە لە شوێنێک لە شەقامی ...، دەرمانەکەی وەدەست کەوت، وەلێ بۆ کڕینی، ٧٥ دۆلاری پێنەبوو. ئێستاش بە مۆتۆرسکیلە شەقوشڕەکەی بەرەو شوێنێکیتر بەڕێوەیە...

لە کۆتایی راپۆڕتەکەدا و پاش باسێکی زیندوو و تەواو، راپۆڕتەوان رەهەندە هاوشانەکان کۆدەکاتەوە:

...هاوسەری نەخۆشەکە، چاو لە دەرگای شووشەیی بەشی نەشتەرگەری هەڵناگرێت. کاتژمێر تەنانەت بۆ دەمێکیش پشووی نەدەدا. دڵی وەستاو و ماندووی نەخۆش دەگاتە کۆتایی رێگای خۆی. ئێستاش چوار مرۆڤی دڵنیگەران و ماندوو لە گەڕانی گۆشەوکەناری شار، بەرەو خەستەخانە بەڕێوەن. لە یەکێک لە لوولەکاندا خوێنی سوور پێشی بە ئاوە بێڕەنگەکەی ناوی گرتووە و بۆ سەرەوە رەپاڵی دەدات. پزیشک سەری رادەوەشێنێ و دیسان چاوێک لە سەر سینگی سپی کاتژمێرە گەورەکەی هۆدەکە دەکات. چوار کەسەکە لە رێگا دووروودرێژەکەیان گەڕانەوە و...

لەو راپۆڕتەدا راپۆڕتەوان، سێ تەوەر یان پێکهاتەی جیاواز، بەڵام پێوەندیدار بەیەکتر (نەخۆشێک کە لەگەڵ مەرگ رووبەڕووە، کات کە بەخێرایی تێپەڕ دەبێت و قەیرانی دەرمان لە بازاڕدا) بەیەکەوە گەشە پێدەدات.

# تایبەتمەندییەکانی ڕاپۆڕتەوان و ڕاپۆرتی پەسەند

**ڕاپۆڕتەوان کێیە؟**

بە لە پێشچاو گرتنی ئەو ڕاستییە کە ڕاپۆرت و وتووێژ، زیندووترین و لە هەمان کاتدا دژوارترین کاری میدیاییە، پێویستە ڕاپۆڕتەوانیش خاوەنی وەها تایبەتمەندی و لێهاتوویی بێت کە ئەندامانیتری دەستەی نووسەران خاوەنی نەبن. کەوا بوو، پیشەی ڕاپۆڕتەوانی پێویستی بە هێندێک بنەما هەیە کە لێرەدا باسی دەکەین:

**١- هەستی میدیایی**

ڕۆژنامەوان تەنیا هەستیارتر نییە لە مرۆڤی دیکە بەڵکو کونجکاوتریشە. سەرنجراکێشە کە مامۆستایان و پسپۆڕانی بواری ئامرازەکانی پێوەندی گشتی، بۆ مرۆڤێ ڕۆژنامەوان سێ مەرجی: فێربوون، ئەزموون و هەستیاری (واتە، هێزی بۆنکردن بە مانای هەستیار بوون لە وەرگرتن) دەستنیشان دەکەن و خێراش ئاماژە دەکەن بە دابین بوونی دوو لایەنی یەکەم بە شێوەیەکی ئاسایی، بەمەرجێک مرۆڤەکە خاوەنی لایەنی سێهەم بێت. واتە هەواڵنێری داهێنەر، بواری فێربوون و ئەزموون، خۆی بۆ خۆی دابینی دەکات. واتە ڕاپۆڕتەوان خاوەن هەستی بەهێزی وەرگرتنە و هەمیشە ئامادەیە. هەستی وەرگرتنی(بۆن کردنی!) ڕۆژنامەوان بەو مانایەیە کە ئەو وەک هەموو کەسیتر دیاردەکان دەبینێت و هەستی پێدەکات، بەڵام زەینی دۆزەرەوەی ئەو، داوای بینین و دەرکی زۆرتری لێدەکات.



هەر پێنج هەستی هەواڵنێر لە هەر کاتێکدا و بەتەواوی ئاگاداری دەوروبەری خۆیانن. بیستنی سرتەیەک لە ناو پاسدا، بۆن کردنی هەوایەکی نائاسایی لە شەقامدا، بینینی دیمەنێکی تازە و ... ئەو ڕادەکێشێت بۆلای ڕووداوێکی تازە و ڕاپۆرتێکی نوێ. ئەو دەنگ و بۆن و دیمەنە هەموو کەس هەستی پێدەکات، بەڵام هەواڵنێر، بەهێزتر و کاراتر وەریدەگرێت و تا وەڵامی پێویستی بۆ نەدۆزێتەوە، ئارام ناگرێت.

**٢- خێرایی دەرک کردن**

ئەگەرچی خێرایی دەرککردن بەشێکە لە هەستیاریی، بەڵام کاردانەوەی دەرککردن لە خانەی پاش هەستیاری جێگادەگرێت. هێزی وەرگرتن(هەستیاری) کاتێک کارایی دەبێت کە ئەو هەستە ئێمە بەرەو دەرکی بابەتێک یان دیاردەیەک ڕێنوێنی بکات. گرنگتر لە بینینی هێندێک ماسی مردوو لە ڕووبارێکدا، گەیشتنە بەو ئاکامەی کە لە سەر ڕێگای ڕووبارەکە هۆکارێک هەیە بۆ مردنی ماسییەکان.

خێرایی دەرککردن بریتییە لە یەکسانی و یەکگرتنەوەی هەستەکان لەگەڵ زانیاری و ئاگادارییە پێشووکان لە زەینی مرۆڤدا.

**٣- توانای دەرککردن**

توانای دەرککردن لەگەڵ خێرایی دەرککردن، جیاوازیان هەیە. لە ژیانی ئاساییدا زۆر کەس باشتر لە کەسانیتر دەبینن، دەبیسن و هەستیارترن. دیارە کەسانێک بە هۆی کار و پیشەیان دەبێت توانای دەرکی بەرزتریان هەبێت. وەک، وتەبێژان، مامۆستایان، هونەرمەندان و ڕۆژنامەوانان.

توانای دەرککردن بریتییە لە سوود وەرگرتن لە پێکهاتە جۆراجۆرەکانی بەردەست، بۆ گواستنەوەی ئەو لایەنەی دەمانهەوێت بە کەسانیتری ڕابگەیەنین.

**٤- پێنووسی ڕەوان**

سەبارەت بە جیاوازی نێوان ڕۆژنامەوانی و ئەدەب و ئەدەبیات، پێشتر باسمانکرد. ئەگەرچی کەرەسەی هەردووکیان، پێنووس، کاغەز و وشەیە، بەڵام نووسەری "بەشێک لە ئەدەبیاتە و "ڕۆژنامەوانی"، چەمکێکی زانستە

کۆمەڵایەتییەکانە، بەو حاڵە، ئایا دەکرێ بڵێین کە راپۆرتەوان خۆ بپارێزێ لە ناسک کارییەکانی ئەدەبیات؟ دیارە وەڵامی ئەو پرسیارە نەرێنییە، بەڵام بەو تێبینییە، کە ئەوە کاری سەرەکی رۆژنامەوان نییە.

رۆژنامەوان یان راپۆرتەوان پێویستە بێ‌کێشە و بەروونی ناوەڕۆک و چۆنیەتی پەیامە شاراوەکانی ناو راپۆرتەکانی بۆ خوێنەر یان بینەر بگوازێتەوە. هێندێک لە مامۆستایانی رۆژنامەوانی ئەوەش تێپەڕ دەکەن و دەڵێن، نووسراوە میدیاییەکان بەگشتی، نابێت خۆ لە جوانکارییەکانی ئەدەبیات بدزنەوە، چونکە رۆژنامەوان بۆ گواستنەوەی پەیام، بێجگە لە وشە و دێڕ، ئامرازێکی‌تری لە هەنبانەدا نییە و پێویستە ئەو چەکە، زانایانە و داهێنەرانە بەکار بێنێت. بەتایبەتی لە راپۆرتی وەسفی و خەیاڵیدا، کە چارەنووسی راپۆرتەکە پێوەندی بە نووسینی جوان و ناسکەوە هەیە. دیارە دەبێت ئەو بۆچوونە بە هێندێک گومانەوە سەیر بکەین، چونکە هەموو راپۆرتەکان(لەوانە راپۆرتە زانستی و لێکۆڵینەوەییەکان) بوار و بنەمای وەسف و هەستیان پێوە دیار نییە. بەکورتی، لە نووسینی راپۆرتدا، هونەری رۆژنامەوانی لە هەڵبژاردنی شێواز و رێزمانی گونجاو لەگەڵ بابەت و تەوەری راپۆرتەکاندا خۆپێشاندەدات.

سەبارەت بە جیاوازی نێوان رۆژنامەوانی و ئەدەب و ئەدەبیات، پێشتر باسمانکرد. ئەگەرچی کەرەسەی هەردوو، پێنووس، کاغەز و وشەیە، بەڵام "نووسەری" بەشێک لە ئەدەبیاتە و "رۆژنامەوانی"، چەمکێکی زانستە کۆمەڵایەتییەکانە. بەو حاڵە، ئایا دەکرێ بڵێین کە راپۆرتەوان خۆ بپارێزێ لە ناسک کارییەکانی ئەدەبیات؟ دیارە وەڵامی ئەو پرسیارە نەرێنییە، بەڵام بەو تێبینیە، کە ئەوە کاری سەرەکی رۆژنامەوان نییە.

بۆ نموونە:

لە بەرە بەیانییەکی پاییزدا، دایکێکی داماو و نەدار، کۆرپەی ساوای خۆی لە پەنا دیوارێکی شاردا فڕێدەدات. ئەو بابەتە بە چەند شێوە دەنووسرێت؟

* ئەمڕۆ بەیانی، کۆرپەیەکی ساوا لە پەنا دیواری ماڵێک لە ... دۆزرایەوە.



* دایکێکی نیازمەند، کۆرپەی ساوای خۆی لە پەنا دیواری ماڵێک لە شەقامی ...فڕێدەدات و ون دەبێت.

* دیسان کۆرپەیەکی ساوا کە دایکێکی دڵڕەق لە پەنا دیواری ماڵێک فڕێی دابوو، لە ...دۆزرایەوە.

* دایکە بۆ دوایین جار چاو دەبڕێتە ناو چاوی کۆرپە ساواکەی. خەیاڵی پاشەڕۆژێکی رەش و دژوار، چۆن خۆی هەیبوو و هەیەتی و دەیبێت، بە مێشکیدا دێت و لە بڕیارەکەی سوورتر دەبێت. ماچەگوڵێکی نەرم لە روومەتی کۆرپەکەی دەچێنێت. خوناوی گۆشەی چاوی دەستڕێتەوە و ئیتر لە پەنا دیوار جێیدێڵێت. لە سەر پێچی کۆڵانێکدا ئاوڕێک دەداتەوە تا بۆ دوایین جار چاوێک بە پاژی جەستەی خۆی بخشێنێت...

* کێ ئەو کۆرپە بێتاوانەی لە پەنای دیواری ماڵێک لە ...فڕێداوە؟

کامیان باشترە؟ دیارە ئەو هەڵبژاردنە پێوەندی بە پێکهاتەکانی‌تری راپۆرتەکە، درێژی و شێوازی نووسینی راپۆرتەوانەکەوە هەیە.

# راپۆرت و تایبەتمەندییەکانی

## راپۆرت چۆن دەنووسرێت؟

هەواڵ، راپۆرتێکە لە راستییەکان کە خاوەنداری یەک یان چەند بەهایێکی هەواڵی دەکات و رەنگە لەژێر کاردانەوەی هۆکارە ناوەکی و دەرەکییە رێکخراوەییەکاندا پێکهاتبێت.

ئەگەرچی ئەوە بە دواین و رێکوپێکترین پێناسەی هەواڵ دەژمێردرێت، بەلام لە هەمان کاتدا، کەموکورییەکی گرنگی هەیە. لەو پێناسەیەدا نەخش و جێگای هەواڵنێر دیاری نەکراوە. لەو پێناسەیەدا وا دەردەکەوێت کە گۆیا هەواڵ لە لایەن دەزگایەکەوە ئامادە دەکرێت کە نە توانای ئەوی هەیە و نە رەوایە لە پرۆسەی ئامادە کردن و رێکوپێککردنیدا، کاردانەوەی هەبێت. لە پێناسەی کۆنی هەواڵدا کە دەڵێت: هەواڵ راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی راستییە سەرنجراکێشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و گواستنەوەی بیروڕای گشتییە، دیسان بە شێوەیەکی شایستە شوێنێک بۆ هەواڵنێر دابین نەکراوە. لە حاڵێکدا هەواڵ، وتووێژ و راپۆرت لە لایەن رۆژنامەوان و هەواڵنێرەوە وەک مرۆڤ(واتە، کۆمەڵێک لایەنی فرە ئاڵۆزی بیر و هزر و هەستی بگۆڕ) ئامادە و رێکوپێک دەکرێت، کەوابوو، بەرهەمی کردەوەی رۆژنامەوانە کە بێگومان کاردانەوەی تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی ئەو مرۆڤەی پێوە دیار دەبێت.

بە لەپێشچاو گرتنی ئەو تێبینیە، پێناسەی هەواڵ بریتییە لە:



هەواڵ، روانگە یان لێکدانەوەیەکی ئۆبژکتیڤە لە راستییەکان و خاوەنداری یەک یان چەند بەهای هەواڵی دەکات و رەنگە لەژێر کاردانەوەی هۆکارە ناوەکی و دەرەکییە رێکخراوەییەکاندا پێکهاتبێت.

دیارە راپۆرت (یان وتووێژ) شێوازێکە لە هەواڵ و نووسراو(لەو میدیایانەی پشت بە نووسین دەبەستن)، بەناچاری پێناسەی هەواڵ، راپۆرتیش دەگرێتەوە.

کەوابوو، پێناسەی راپۆرت بریتییە لە:

راپۆرت، روانگە یان لێکدانەوەی هەواڵنێرە لە پانتایی نێوان دوو لایەنی پێوەندی، بۆ وەدەستهێنانی راستییەک کە خاوەنی یەک یان چەند بەهای هەواڵی بێت، ئەو روانگەیە کە لەژێر کاردانەوەی تایبەتمەندییەکانی دوولایەنەی پانتایی پێوەندی دایە، رەنگە کاردانەوەی هۆکارەکانی دەرەکی و ناوەکی رێکخراوەییشی پێوە دیار بێت.

بە پێی ئەو پێناسەیە، تایبەتمەندییەکانی راپۆرت بریتییە لە:

* راپۆرت دەبێت ئۆبژکتیڤ بێت، واتە دوور بێت لە خەیاڵ و داهێنەری نووسەرانە کە راپۆرت لە رەسەنایەتی و ئۆبژکتیڤ بوونی پێویست دوور دەکاتەوە، مەگەر لە راپۆرتی وەسفیدا.

* راپۆرت، لێکدانەوە و روانگەی هەواڵنێرە سەبارەت بە رووداوێک، گۆڕانێک، راستییەک یان کەسێک، و دوو لایەنی هەیە. یەکەم، راپۆرتەوانە، کە بەپێی پێکهاتە خۆماڵییەکانی کەسایەتی (وەک، رادەی خوێندەواری، رابردوو، ئارەزووەکانی، ئەزموونی و...) ئەو رووداو، گۆڕان، راستی یان کەسەی، لێکدەداتەوە. کەوابوو هەر راپۆرتێک لێکدانەوەیەکی تایبەت دەبێت.

دووهەم، ئەو لێکدانەوە و روانگەیە(وەک لە خوارەوە باسی دەکەین) ناتوانێت رێوشوێنەکانی هەواڵ نووسین و راپۆرتەوانی لەپێشچاو نەگرێت.

* راپۆرت، روانگەیەکە لە پانتایی دوولایەنی پێوەندیدا. یەک سەری هەواڵنێرە کە کۆتاییەکەی دەگاتە میدیاکەی و سەرێکیتری، رووداو، گۆڕان،راستی یان کەسێکە کە هەواڵنێر راپۆرتی لەبارەوە ئامادە دەکات.

* راپۆرتیش وەک هەواڵ، دەبێت هەڵگری یەک یان چەند بەهایێکی هەواڵی بێت. راپۆرتێک کە خاوەنی بەهای بەربڵاویی، ناوبانگ، سەرسوڕمان، ڕێژە و ژمارە، کارەساتەکان و... نەبێت، دڵڕفێن نییە و سەرنجی خوێنەران راناکێشێت. لەپێشچاو گرتنی ئەو تایبەتمەندییە، راپۆرت لە کاردانەوەی راستەوخۆی راپۆرتەوان دەپارێزێت. کۆی دوو لایەنی ئۆبژکتیڤ بوون و خاوەنداری بەها یان بەها هەواڵییەکان راپۆرت لە پشتبەستنی یەک لایەنە بە زەوق و شێوازی راپۆرتەوان دەپارێزێت. تەنانەت بە کۆکردنەوەی هەموو ئەو مەرجانە، دیسان هەواڵنێر وەک پاڵاوگەیەکی زیندوو و خاوەن بیروڕا، لە سەر ئاکامی راپۆرتەکە کاردانەوەی بێ ئەملاوئەولای دەبێت.

*هۆکارە دەرەکی و ناوەکییەکان، لەسەر چۆنیەتی راپۆرت کاردانەوەیان هەیە. هۆکارە ناوەکییەکان بریتین لە کۆی زەوق و بیروباوەڕی راپۆرتەوان، شێواز و رێبازی دەزگای میدیا و ویست و داخوازییەکانی بەرپرسانی میدیاکە. داخوازییەکانی خوێنەران(بیسەران و بینەران) هۆکارە دەرەکییەکان پێکدینێت. سەرەڕای چوارچێوەی ئەو پێناسەیە، راپۆرت(وتوویژیشی لەگەڵ بێت) وەک یەکێک لە هونەرە گرنگەکانی کاری رۆژنامەوانی هەڵسەنگێندراوە کە بۆ زیندوو راگرتنی دەزگا میدیاییەکان، نەخشێکی زۆر گرنگی هەیە. میدیا و چاپەمەنییەکان بێ راپۆرت و وتوویژ دەبێتە کۆمەڵێک وتار و بیروبۆچوون و نووسراوەیتر کە بە هۆی نەبوونی پێوەندییان لەگەڵ بنەما ئۆبژکتیڤیەکانی کۆمەڵگا، کاردانەوەیەکی بێ رۆح و بێ ئاکامیان لە میدیاکاندا لێدەکەوێتەوە.

**گرنگی راپۆرت**

راپۆرت لە هەر چەشن و بە هەر قەوارە و لە هەریەک لە بوارەکانی میدیاییدا، پتر و پێشتر لە هەر تایبەتمەندییەکیتر، خاوەن روانگەیەکی داستانی و چیرۆکییە. واتە وەک چیرۆکێکی کورتە، بەو جیاوازییە کە پێکهاتە و رووداو و کەسایەتییەکانی، بەتەواوی لە راستییەکانی ژیانەوە هەڵقوڵاون. بەڵام لایەنەکانی راستی و ئۆبژکتیڤ بوون، تەنیا تایبەتمەندی راپۆرت پێکناهێنێت، بەڵکو راپۆرت پێویستە، یان راگۆزی زانیاری بێت(کە خوێنەر بە



وەدەستهێنانی هەست بە پتر زانین بکات) یان نائاسایی و چاوەڕوان نەکراو بێت(کە ئەگەر خوێنەر لێی بێ خەبەرما، هەست بە لەدەستدانی شتێک بکات) یان ببێتە هۆی سەرگەرمی(کە خوێنەر بە هەستەوە تا کۆتایی لەگەڵی بێت)، یان تەنانەت هەست بزوێن و هەستیارانە بێت، واتە لایەن و دیمەنێکی مرۆڤایەتی لە خوێنەردا وەجوش بێنێت و ببێتە هۆکاری پەیدا بوونی بۆچوونە هەستیارەکان لە خوێنەردا.

خوێنەر(بینەر، بیسەر) پەیمانێکی نەنووسراوەی لەگەڵ رۆژنامەوان هەیە. ناوەڕۆکی ئەو پەیمانە دەڵێت:

من(خوێنەر،...) متمانە بە تۆ(رۆژنامەوان) دەکەم. بەو هۆیە کە خوێنەر(بیسەر، بینەر)ی میدیای تۆم. لە لایەن منەوە، لەو کۆمەڵگایەی کە هەموومان خاوەنداری دەکەین، بگەڕێ، بەڕاستی و دەسپاکییەوە، بەوردبینی و بەخێرایی، دیاردەکان بۆمن روون بکەوە.

بە پێی ئەو پەیمانە، رۆژنامەوان لە لایەن خوێنەر(بیسەر، بینەر)ەوە نوێنەرایەتی هەیە تا لە لایەن ئەوەوە و لە روانگەی ئەوەوە، لە ناو کۆمەڵگادا بگەڕێ و سەرنجراکێشترین لایەنەکان بۆ ئەو ئامادە بکات. ئەوە بە مانای هەڵگرتنی متمانەیەکی مەزنە کە تەنیا باری بەرپرسایەتی رۆژنامەوان سەنگینتر دەکات. بەردەوامی ئەو متمانەیە، پێوەندی بە کردەوەی رۆژنامەوانەوە هەیە. بە هۆی ئەو مەودا بەرفراوانەی کە راپۆرت بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ هەواڵدا هەیەتی (مەودای زۆرتر بۆ روونکردنەوە و لێکۆڵینەوەی زانیارییەکان، گۆڕانکارییەکان، ئامارەکان و وەسفەکان)،راپۆرت دەتوانێت پێوەندی نێوان رۆژنامەوان و خوێنەر(بیسەر، بینەر) خۆماڵیتر، هەستیارانەتر و نزیکتر بکات. کەوابوو، لەو رێگایەوە گۆڕەپانێکی مەزن بۆ دامەزراندنی پێوەندی لە نێوان رۆژنامەوان و میدیا لەگەڵ خوێنەر(بیسەر، بینەر)ەوە پێکدێت. پەرەپێدان و مانادارتر کردنی ئەو پێوەندییە، یەکێک لە کردەوەکانی راپۆرت پێکدێنێت. کاتێک بواری ئەو پێوەندی و متمانەیە ئامادە بێت، ئەو کات میدیا دەتوانێت و دەبێت دیاردە و زانیارییەکانی داهێنەرانە و بەکەڵک بۆ خوێنەرانی خۆی ئامادە بکات. لە کۆمەڵگایەکدا کە نیازمەندی

کارە، نیازمەندی پەرەپێدانی بەرهەمهێنانە، نیازمەندی پێشگرتنە لە گەندەڵیی، نیازمەندی دابینکردنی بنەما سەرەکییە سیاسییەکانە، نیازمەندی دابینکردنی پاکی ژینگەیە و ....، راپۆرتەوان لە ڕێگای ئامادە و بڵاوکردنەوەی راپۆرتی بیرلێکراوەوە، دەتوانێت بۆ دابینکردنی ئەو نیازمەندییانە تێبکۆشێت. هەر لێرەدا پێویستە ئاشکرای بکەین کە میدیاکان خۆبەخۆ و بەتەنیایی، بێ ئیرادەی گشتی و نەتەوایەتی هەرگیز ناتوانن بە ئاکامیان بگەن.

وەک ئاماژەی پێکرا، لایەنی گرنگی راپۆرت، روانگە و شێوازە، و هۆکاری پێکهێنانی گۆڕەپانی پێوەندیەکانی (بەتایبەت متمانەی) نێوان خوێنەر(بیسەر، بینەر) و میدیایە. متمانەیەکی ئاوا (ئەگەر پێکهات) بایخدارترین سامانی راپۆرتەوان و میدیایە لە ژیانی پیشەییاندا.

ئەو گۆڕەپانە لە کۆمەڵگایەکی پێشڕەودا، چارەساز و یەکجار پێکهێنەرە.

ئەگەر وای دابنێین کە کۆمەڵی رۆژنامەوانان وەک زنجیرە دەمارە هەستیارەکان، تەواوی کەموکووڕیە، دەسکەوتە، لادەرییە، دەسپاکییە، کۆششە، تەمەڵییە و ئەرکەکانی کۆمەڵگا و دەوروبەری بخاتە ژێر چاوەدێری و میدیاکان رەنگدانەوەی ئەو کێشانە بن و لە لایەکیترەوە، دەسەڵاتی سیاسی وڵات، گرنگی بدات بە بیروڕای گشتی و وەڵامدەر بێت، ئیتر کێ زاتی کەمتەرخەمی، گەندەڵی و ستەمکاری دەبێت؟

لەو کۆمەڵگایانەی کە دەسەڵاتی سیاسی و فەرمانبەری لە سەر بنەمای دیموکراسی واتە، رەسەنایەتی هەڵبژاردن و مافی دەنگدان داڕێژراوە، کۆمەڵانی خەڵک بە وردبینییەوە چاوەدێری کردەوەی هەڵبژاردراوەکانی خۆیان دەکەن و بە دیتنی یەکەم کەموکوڕی لە کارەکانیاندا، ئیتر دەنگیان پێنادەن. لەو کۆمەڵگایانەدا گرنگی میدیاکان زۆرترە و شوێنەواریان بەرچاوترە.

لەو کۆمەڵگایانەی بەرەو پەرەسەندن هەنگاو هەڵدێنن، نەخش و ئەرکی رۆژنامەوان بۆ دابینکردنی نیازمەندییەکان، پێداویستییەکان و چاوەڕوانییەکانی خوێنەرانیان، ئاستەمترە و هەستان بۆ گۆڕانکارییەکان



دژوارتر. خوێنەران لەو کۆمەڵگایانەدا، چاوەڕوانی و پێداویستی بەربڵاوتر و زۆرتریان لە میدیاکان هەیە.

بەتایبەت کاتێک رۆژنامەوانی لە پێناو پەرەسەندن لە ئارادا بێت، راپۆرتەوان شوێنێکی هەستیار و تایبەت دەگرێتەوە. راپۆرتنووس لەو گۆڕەپانەدا پێویستە لە جێگای بەرجەستەکردنی هەست و سەرگەرم کردنی خەڵک، رووبکاتە کێشە گرنگە کۆمەڵایەتییەکانی وەک: کار، بەرهەم، پاراستنی یاسا، پەروەردە و زانست کاری، تەندروستی و..

راپۆرتەوان بە ئاشکراکردنی دیاردە و کێشە تازەکان بۆ خوێنەران، رۆژانە دەرگای تازە لەبەرامبەر کۆمەڵگادا دەکاتەوە. هەروەها ئەو پرۆسەیە بە مانای دەوڵەمەندتر کردنی کولتووری راگەیاندنە، واتە لەگەڵ هێنانە ئارای چەمکە تازەکان، زمان و کولتوورێکی نوێتر ئاراستەی کۆمەڵگا دەکات.

"دێوید رێندال"، رۆژنامەوانی ئینگلتەرای دەڵێت: "سەرنجدان بە کۆی راپۆرتەکان و لیستەی بابەتی میدیاکان لە هەر کۆمەڵگایەکدا، بە روونی ئاراستەی فکری و سەرقاڵییەکانی ئەو کۆمەڵگایە پێشاندەدات."

سەبارەت بە هەواڵ، ناتوانین ئەو باوەڕەمان هەبێت، چونکو هەواڵ خۆدەخزێنێتە ناو کۆمەڵگاوە، بەڵام راپۆرت، لە لایەن راپۆرتەوان و میدیاوە ئامادە دەکرێت. بە پێی ئەزموون و پێوانەکان، راپۆرت نووسین وەک رەوانترین شێوازی پێوەندی میدیایی ناسراوە.

**تایبەتمەندییەکانی راپۆرت**

راپۆرت نووسین یەکێکە لە گرنگترین و دڵڕفێنترین کردەوەکانی کاری رۆژنامەوانیی.

راپۆرت و وتوویژ بەگوێرەی تەوەرەکەی، کە ژیانی خەڵک، کەسایەتییەکان، دیاردەکان، رووداوەکان و .. دەگرێتەخۆ، زیندووترین و پڕخوێنەرترین بابەتی رۆژنامە پێکدێنێت. بە پێی پێناسەی راپۆرت، میدیا لە سەر بنەمای ئەزموون و لێکۆڵینەوە، بابەتی وتوویژ و راپۆرتەکانی بەپێی سەرنجراکێشی خوێنەرانی و هەروەها بەها هەواڵییە دیاریکراوەکانی خۆی، هەڵدەبژێرێت، واتە لەرێگای وتوویژ و راپۆرت، لە گەڵ خوێنەرانی خۆیدا

گفتوگو دەکات. کەوابوو، راپۆرتەوان لە تەواوی کاتی ئامادەکردنی وتوویژ و راپۆرتدا، دەبێت بەردەوام هەست بە بوونی خوێنەر لە کەنار یان لە بەرامبەر خۆیدا بکات.

بۆ نزیککردنەوەی راپۆرت لە مەبەستەکانی پێوەندی و راگەیاندن، پێویستە ئەو تێبینییانە لەپێشچاو بگرین:

- **بەها هەواڵییەکان لە راپۆرتدا**

بەها هەواڵییەکان تەنیا بۆ ئامادەکردنی هەواڵ نییە، بەڵکو لە وتوویژ و راپۆرتدا پێویستە لەپێشچاوبگیرێت. ئەگەر بزانین کە بە گشتی بەها هەواڵییەکان لە نووسراوە چاپەمەنییەکاندا لە سەر بنەمای داخوازییەکانی خوێنەر(بیسەر، بینەر)ەوە، دابینکراوە، ئەو کات باشتر لە مانای ئەو لایەنە تێدەگەین. بەهایێکی وەک "ناوبانگ"، دەگەڕێتەوە بۆ بەناوبانگ بوونی کەسایەتییەک لە ناو خوێنەردا، یان بەهای "بەربڵاوی" پێوەندی بە بەرفراوانی کۆی مرۆڤەکان لە ناو خوێنەرانیدا هەیە. لە سەر ئەو بنەمایە، بۆ هەڵبژاردنی تەوەری راپۆرت، پێویستە لە سەرەتاوە بیر لە بەها هەواڵییە شاراوەکان بکەینەوە. بۆ نموونە، کەسێک کە هەموو رۆژێک تەواوی رۆژنامەکان دەکرێت، بە گشتی دیاردەیەکی سەرنجڕاکێشە، بەڵام بۆ دانیشتووانی کۆڵان یان بۆ ئەندامانی بنەماڵەکەی. ئێستا ئەگەر ئەو کەسە بەر لە ٢٥ ساڵ، هەموو رۆژنامە لەچاپدراوەکانی بە رێکوپێکی و لە پانایی تەواوی ماڵەکەی کۆکردبێتەوە، ئەو کەسە بەهایێکی پتر بۆ سەرنجڕاکێشیّ وەدەستدەهێنێت. دواتر ئەگەر بزانین کە بە هۆی نەمانی شوێن لە ماڵدا، هاوسەرەکەی لێی جیابووەتەوە و منداڵەکانی ماڵیان جێهێشتووە و هەروەها هەر هەواڵ یان بابەتێکی پێویست لە رۆژنامەکاندا، دەتوانێت خێرا بدۆزێتەوە، هەروەها ئەو کەسە تا ئێستا بە سوود وەرگرتن لەو رۆژنامانە چوار کتێبی نووسیوە و سەرئەنجام ئەگەر بزانین کە بە هۆی "شۆرتی کارەبا" ماڵەکەی ئاگری تێبەربووە، ئەو راپۆرتە زۆرتر سەرنجڕاکێش دەبێت. ئەو لایەنانەی سەبارەت



بەو کەسە ئاماژەی پێکرا، هەر کامیان بەهاکانی هەواڵی ئەو راپۆرتە بە پێی قوناغەکانی، پێکدێنن.

- **پوختەکردنی شایستە**

باشترین و سەرنجڕاکێشترین بابەتەکان ئەگەر بەشێوەیەکی ناشایست و لاواز پوختە بکرێن، راپۆرتێکی بێتاموبۆنی لێدەکەوێتەوە. پێچەوانەی ئەو بۆچوونە، هەمیشە راست نییە. پوختەکردنی راپۆرت نابێت لەگەڵ لەپێشچاو گرتنی پێکهاتەکانی وەک، زانیاری و رێژە، زاراوەی دارشتن یان رێکۆپێککردنی راپۆرت، بەهەڵە وەربگرین. پوختەکردن لە راستیدا، روانگە و بۆچوون و چۆنیەتی پێشکەشکردنی پێکهاتەکانی راپۆرتە.

ئەگەرچی راپۆرتەوان بە زەوقی خۆی چۆنیەتی پوختەکردنی راپۆرت هەڵدەبژێرێت، بەڵام، ئەو هەڵبژاردنە پێوەندی بە زەوقەوە نییە، بەڵکو لە پوختەکردنیشدا تەنانەت دەکرێ و دەبێ پانتایی هەمان بەها هەواڵییەکان لەپێشچاو بگرین.

بۆ نموونە، لە راپۆرت سەبارەت بە تەمەنی هاوسەر هەڵبژاردندا، هێندێک پێکهاتە و دیاردە لەبەردەست راپۆرتەواندا دەردەکەوێت. پێداویستی بە سامانی فرە، ژیانی لۆکس، ئارەزوی ژیانی سەربەخۆ، ترس لە سەرکەوتوونەبوون و کۆسپ و لەمپەرەکانی دابونەریتی و .... لەو پێکهاتانەیە. ئێستا پێویستە راپۆرتەوان کامە لەوانە زۆرتر بخاتە ژێر سەرنج و لێکۆڵینەوە؟

- **یەکگرتوویی بابەت**

زۆر گرنگە کە لە راپۆرت سەبارەت بە یەک بابەتی تایبەت، راپۆرتنووس لە سەرەتاوە تا کۆتایی راپۆرتەکە، بەو بابەتە وەفادار بمێنێتەوە. ئەو بۆچوونە بە مانای هەڵبژاردنی بێ چەندوچوونی بابەتی لاوەکی و کەم پانتا نییە، بەڵکو بەو مانایەیە کە لە پرۆسەی ئامادەکردنی راپۆرتدا، پێویستە بابەتەکان چوارچێوەی دیاریکراو و کورتیان هەبێت. راپۆرت هەرچی کورتتر بێت، راپۆرتەوان بۆ پوختەکردنی تەوەر و لێکۆڵینەوەی رەهەندە جۆراجۆرەکانی، سەرکەوتووتر دەبێت. تەنانەت لەو رۆژگارەدا، خوێنەر،

بینەر و بیسەر کەمتر کات و حەوسەلەی خۆیان بۆ راپۆرتی دووردرێژی میدیا دیداری و بیسیاری و نووسیارییەکان تەرخاندەکەن.

- **نزیکایەتی لەگەڵ زەینی خوێنەر(بینەر، بیسەر)**

پێشتر باسمانکرد کە پێویستە ئاراستەی راپۆرت لەسەر ئەو بنەما بەهاییە هەواڵیانە دابمەزرێت کە داکۆکی لە ویست و داخوازییەکانی خوێنەر(بینەر، بیسەر) دەکات. سەرەڕای ئەو لایەنە گرنگە، راپۆرتێک باش و شایستەیە کە تەوەری بابەتەکەی نزیک بێت لە زەینی خوێنەر، واتە لە ئاستی کاروباری رۆژانە و دڵنیگەرانییەکانی هەر خوێنەرێکدا بێت. ئەو مەبەستە لە راپۆرتەکانی سەبارەت بە بۆنەکان، باشتر دابین دەبێت. بۆ نموونە، راپۆرت سەبارەت بە رۆژانی پشوو، راپۆرت سەبارەت بە ناونووسین لە خوێندگاکاندا، راپۆرت سەبارەت بە رۆژی پێشمەرگە و ..

بە پێچەوانەوە، راپۆرت سەبارەت بە گیروگرفتی ئامێرە کارەباییەکانی ماڵ، راپۆرت لە تابلۆی دوکانەکانی شاری هەولێر یان گیروگرفتی فێربوونی زمانی یونانی و... ئەگەرچی لەوانەیە لە ئامادەکردنیدا لێهاتوویی بەکار هاتبێت، بەڵام بە هۆی سەرنجراکێش نەبوون بۆ زۆربەی توێژەکانی خەڵک، خوێنەرێکی زۆر وەدەست ناهێنێت. مەگەر هەمان راپۆرت لە روانگەیەکی تایبەتی ئامادە کرابێت. بۆ نموونە، ئەگەر گیروگرفتی ئامێرە کارەباییەکان بەهۆی نەبوون و برانی بەردەوامی کارەبا و یان گیروگرفتی فێربوونی زمانی یونانی لەگەڵ زۆربوونی هاتوچۆ لە نێوان یونان و کوردستاندا، لێکبدرێتەوە.

- **بەها نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتییەکان**

رۆژنامەوان بەپێی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کۆمەڵانی بەرفراوانی خەڵک و بەهۆی نەخشی کاریگەری لە کولتووری کۆمەڵگادا، پێویستە و ناچارە چاوەدێر و داکۆکیکەری بەها و دابونەریتە پێشکەوتوو و کۆمەڵایەتییەکان بێت.

لە هەلومەرجی ئاڵۆز و دژواری سیاسی و کۆمەڵایەتییدا، پێویستە رۆژنامەوان وەک پێشەنگ، ئەرکی ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک سەبارەت بە چارەنووسی گشتی و نەتەوایەتی لەئەستۆ بگرێت. رۆژنامەوان وەک چاو و گوێی کۆمەڵگا پێویستە سەبارەت بە گەندەڵی، کەموکوڕی و



پێداویستییەکان، رەخنەکانی لەپێناو بەرژەوەندی نەتەوایەتیدا ئاراستەی خوێنەر(بینەر، بیسەر) بکات.

- **پانتایی دڵڕفێنی**

ئەگەر ئێمە بە زەوقێکی مامناوەندییەوە گوێ لە بابەتێکی رادیۆ بگرین، سەیری دیمەنێک لە تەلەڤیزیون بکەین، وتارێک لە رۆژنامە بخوێنینەوە، یان فیلمێک تەماشا بکەین، مێشکی ئێمە رادە و پلەیەکی دیاریکراوی بۆ وەرگرتنی بابەتەکان هەیە، واتە پانتایی دڵڕفێنی هەر بابەتێکی میدیایی بۆ تاکەکان، جیاوازە. سنووری ئەو پانتاییە لە هەر مرۆڤێکدا پێوەندی بە رادەی خوێندەواری و پەروەردەیی و کۆمەڵگا و.. هەیە. هەروەها، ئامرازەکانی وەک کتێب، رادیۆ، تەلەڤیزیۆن، گۆڤار، کاسێتی مۆسیقا و ...کە هۆکاری دڵڕفێنی زۆرتر دەکات، بۆ مرۆڤەکان جۆراوجۆرن. کەوابوو، ئێمە لە دەوروبەری خۆماندا لە گەڵ کەسانێک رووبەڕوو دەبینەوە کە کاتێکی دووردرێژ گوێ بۆ مۆسیقا رادەگرن یان کتێب دەخوێننەوە یان ...، کە دەبێتە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە و دەڵێین: چ حەوسەلەیەکیان هەیە! دیارە پلەی زەوق و پانتایی دڵڕفێنی و سەرنجراکێشی بۆ تاکە جیاوازەکان بە پێی ئامرازە جۆراوجۆرەکان، جیاوازی هەیە. بۆیە پسپۆڕانی ئامرازە گشتییەکانی پێوەندی کردن، پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، پانتایی و سنوورێکی دیاریکراویان لەو بارەوە بۆ خەڵکێکی مامناوەندی و بەپێی ئامرازە جۆراوجۆرەکان، دۆزیوەتەوە. بۆ نموونە دەڵێن کە گوێ و دەمارە هەستیارەکانی تایبەت بۆ جیاکردنەوەی دەنگەکان، ناوەندی تۆمارکردنی پەیامەکان و ناوەندی سازکەری پێوەندی هەر پەیامێک لەگەڵ گشت زانیارییەکانی پێشوو لە مێشکی مرۆڤدا، تەنیا بە ماوەی ٥ خولەک بە شێوەیەکی کارا کاردەکات. پاش ئەو ماوەیە، گوێ دەبیسێت بەڵام مێشک توانای رێکۆپێککردنی پەیامە گەیشتووەکانی نامێنێت. ئەو پانتاییە بۆ تەلەڤیزیون ١٢ خولەک، بۆ چاپەمەنییەکان ٢٢ دێڕ و بۆ مۆسیقا ١٧ خولەکە. پاشان زەین بە هۆی ماندووبوونەوە هەستوەری لەدەستدەدات و مێشک لەدوای لایەنیتری سەرنجراکێش دەگەڕێت. بۆیە کاتێک لە بەرامبەر رادیۆ،

کتێب، تەلەڤیزیۆن و... دا دانیشتووین، دەبیسین، دەخوێنینەوە، دەبینیین و دەبیسین، بەڵام زەین پەڕوازەی شوێنێکیترە و وەک ئەوەیە کە هیچمان نەبیستووە، نەبینیوە و نەخوێندوتەوە. لە بەرامبەر ئەو دیاردەیەدا، چارە چییە؟ پێویستە بابەتی کورت و پوختی سەرنجراکێش ئامادە بکەین بۆ دیتن، بیستن و خوێندنەوە. پسپۆران بە تایبەت لە ژیانی ئەو سەردەمەدا، پێشنیاری کورتی و پوختی دەکەن، ئەگەر پەیام، نووسراوە، و فیلمێک، دوورودرێژ بێت، پێشنیاری دابەشکردنی بۆ پاژی بچووکتر و بە پانتایی دڵرفێنی جیاوازتر بۆ هەر یەک لە بەشەکانی ئەو بابەتانە دەکەن. بۆ نموونە ئەو دیاردەیە لە سینەمادا بە ناوی "ریتم" ، لە کتێبدا بە ناوی "فۆرم"، لە مۆسیقادا بە ناوی "میلۆدی" یان "نەوا" و لە چاپەمەنییەکاندا بە ناوی "پاراگراو" یان رستەی پەیتاپەیتا بەڵام هەڵگری ناوەرۆکی تازە، لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت. لە چاپەمەنی و رۆژنامەوانیدا، پانتایی دڵرفێنی بریتییە لە سنوورێک لە سەرنج، حەوسەلە و وەرگرتنی بابەت یان راپۆرت، لە لایەن خوێنەرەوە. یەکێک لە تایبەتمەندییە هەرە گرنگەکانی نووسراوەیەکی رۆژنامەوانی و لەوانە، راپۆرت، لەپێشچاو گرتنی ئەو پانتاییەیە بە سوودی خوێنەر. دابەشکردنی هۆشمەندانەی پێکهاتەکان(فاکتەرەکان) لە سەرتاسەری راپۆرتەکەدا، راکێشانی بەردەوامی سەرنجی خوێنەران بۆ راپۆرت لە رێگای پێشکەشکردنی رەهەندە تازەکان، بەکارهێنانی گوورزی هەستەوەریی (دراماییی) و کەڵک وەرگرتن لە وشە و رستە سەرنجراکێشەکان، هێندێک لەو شێوازانە پێکدێنێت.

راپۆرتێک پەسەندە کە خوێنەر سەرەڕای درێژبوونی بیخوێنێتەوە، تەوەرەکانی دەرک بکات و کاردانەوەی چاوەڕوان لێکراوی نووسەرەکەی لەسەردابنێت. ئەو هونەرە لە رێگای راهێنانی بەردەوام و نووسینی هەرچی زۆرتری راپۆرت پێکدێت. نووسینی راپۆرتی دوورودرێژ کە هەڵگری شێوازێکی یەک ناواخن و پەیامی درێژە، کارێکی بێهوودەیە و تەنیا ئاکامی، بەفیرۆدانی کاغەز و بەهەرز دانی توانا و داهێنەریی راپۆرتەوانە.



**پێداویستییەکانی راپۆرتێکی پەسەند**

لە سەرەوە ئاماژەمان بە پێوانەکانی راپۆرتی پەسەند و شایانی چاپ کرد، لێرەدا بە مەبەستی کۆکردنەوەی ئاکامەکان، سەرەکیترین تایبەتمەندییەکانی راپۆرتێکی پەسەند و رەوا بۆ خوێندنەوە، دەخەینە بەرچاو:

١- بەر لەهەر شتێک، پێویستە راپۆرت شایستەی خوێندنەوە بێت. سەرەڕای سەرنجراکێشی و گرنگبوون و دڵرفێنی تەوەر. دابینکردن و لەپێشچاوگرتنی بەهاکانی هەواڵی بۆ ئەو مەبەستە یارمەتیدەرە.

٢- پێویستە شێوازی نووسینی راپۆرت رازاوە و دڵگیر بێت. لەپێشچاوگرتنی رەسەنایەتی لە راپۆرت نووسیندا، یەکێک لە ئەرکە هەرەسەرەکییەکانە لەو کارەدا. بابەتێک کە هەڵگری بەهای هەواڵی بەرچاویش نییە، بەڵام بە هۆی نووسینی بەشێوازێکی جوان و رەسەن، دەبێتە راپۆرتێکی شایستەی خوێندنەوە. کۆی دوو لایەنی، شایستەی خوێندنەوەبوون و شێوازی نووسینی رەسەن، راپۆرت تەواوتر دەکات.

٣- رەوان و یەکپارچە بێت. لێرەدا زۆرتر مەبەست لەپێشچاوگرتنی پێکهاتە تەکنیکییەکان و ژێرخانی راپۆرتە. لید یان سەرەتایەکی تەواو، مانشێتی سەرنجراکێش، بڵاوکردنەوەی کێشەکان لە سەرانسەری پەیکەری راپۆرتدا، دەسپێک و کۆتایی گونجاو، جێکردنەوەی وتووێژی پێویست، بۆچوونی بەنرخ، زانیاری پێویست و ... لەپێشچاوگرتنی هەماهەنگ و یەکپارچەی تێکڕای ئەو پێکهاتە بنەڕەتیانە، دەبێتە هۆی پێکهاتنی راپۆرتیکی شایستە. دیارە راپۆرتێک پەسەندە کە هەماهەنگی و رێکوپێکییەکی مەنتقی لە سەرانسەریدا رەچاو کرابێت. بەڵام راپۆرتێک کە بە گورز و هەیەجانەوە دەسپێبکات و لە ناوەڕاستدا کورت بێنێت، دووچاری کەموکووڕییە.

٤- قەوارەیەکی گونجاوی هەبێت. لە کۆنەوە گوتوویانە "کورت و پوخت". دیارە درێژدادڕی بێهوودە و کورت نووسینی ناتەواو، هەردووکیان رەوا نین. لە راپۆرت نووسیندا، هێندێکجار بە هۆی گرنگ نەبوون، دووپات بوونەوە، پێکهێنانی گیروگرفت، یان بە هۆی بێ مانا بوون، تەوەری بابەتێک کورت دەکرێتەوە، یان هێندک بابەتی تەڕوتازە پێویستییان بە روونکردنەوە

و نووسینی زۆرتر هەیە، هەڵبژاردنی گونجاوی یەکێک لەو دوو لایەنە، پێوەندی بە رۆژنامەوانەوە هەیە، هەڵبەت ئەوەش لە ڕێگای راهێنان و ئەزموونەوە پێکدێت.

٥- لەپێشچاوگرتنی یاساکان. زۆرجار راپۆرتێک خاوەنی تەواوی ئەو پێداویستییە باسکراوانەیە، بەڵام بەهۆی یاسا وریێساکانی وڵاتەکە بۆ چاپکردن گونجاو نییە. پێویستە راپۆڕتەوان ئاگاداری لایەنە یاساییەکانی بڵاوکردنەوە و راگەیاندن بێت، وەک یاسای رۆژنامەوانی و راگەیاندن و یاسا پەیوەندیدارەکانی دیکە.

٦- زەوق، ویست و نیازەکانی خوێنەر(بیسەر، بینەر) لە راپۆرتدا دابینکرابێت. کاردانەوەی بەرژەوەندییەکانی کەسایەتی یان حیزبایەتی لە راپۆرتدا، دزێوترین و ناحەزترین لایەنی راپۆرت پێکدێنێت. پێویستە ئاگاداربین کە روانگەی میدیاکان (و چاپەمەنی وەک یەکێک لەوان) رووبەڕووی تەواوی خەڵکە و سامانێکی تێکڕایی کۆمەڵگایە، ئەگەرچی موڵکی تاکە کەسێک یان هێندێک لایەنە. خوێنەر(بینەر، بیسەر)ی میدیایەک ئەگەر هەڵوێستی بێلایەنانەی لێوەرنەگرێت، متمانەت پێناکات. بە فەرمانی ویژدان و ئەخلاقی پیشەیی، میدیاکان نابێت بکرێتە گۆڕەپانی گێرەوکێشە تاکە کەسییەکان یان گرووپی و حیزبایەتی. پێشتر باسی بێلایەنی کرا کە بە هۆی تێپەڕبوونی هەواڵ و راپۆرت لە بێژینگ و پالاوگەی مرۆڤەوە(هەواڵنێر و راپۆڕتەوان)، لەکردەوەدا هەرگیز بێلایەنییەکی رەها نییە، بەڵام لە پیشەی رۆژنامەوانیدا، رەچاونەکردنی هەستەوەری کەسایەتی و بەرزڕاگرتنی بەرژەوەندی خوێنەر(بینەر، بیسەر) بەسەر بۆچوون و زەوق و مەیلی تاکەکەسیدا، ئەرکی پێویست و سەرەکی ئەو پیشەیە پێکدێنێت.

## مانشێت لە راپۆرتدا

لە بەشی هەواڵدا سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی مانشێت لە هەواڵدا گوتمان کە مانشێت دەبێت روونکەرەوەی تەوەری هەواڵ بێت تا خوێنەر بە زەوقەوە بیخوێنێتەوە، هەروەها رێکوپێک و ئاهەنگدار و خاوەن زەبر و بەهێز بێت.

هەروەها گوترا کە پێویستە مانشێتی هەواڵ کورت بێت و وشەی تێدا دووپات نەبووبێتەوە و لە بەکار هێنانی دەستەواژە نامۆکان پارێزرابێت.

مانشێتی راپۆرتیش کەم تا کورت هەر بەو شێوەیە ئامادە دەکرێت. بەڵام بە هۆی جیاوازی لە نێوان ناوەڕۆک و روانگەی پەیامی هەواڵ و راپۆرت، ناچار بۆ ئامادەکردنی مانشێتی راپۆرت پێویستە هێندێک تێبینی لەپێشچاو بگرین:

١- "کورتی و پوختی" دوو تایبەتمەندی گرنگ و حاشا لێنەکراوی مانشێتی هەواڵ پێکدێنن. بەڵام لە راپۆرتدا لایەنی "سەرنجڕاکێشی" دەبێتە تایبەتمەندی سێهەم. کەوابوو مانشێتی راپۆرت بە شێوەیەکی ئاسایی درێژ دەبێتەوە، بەڵام ئەوە نابێ ببێتە هۆی دەست لێهەڵگرتنی.

٢- جوانی و رێکوپێکی: پێویستە مانشێتی راپۆرت جوان و رێکوپێک بێت. تەنانەت هێندێک رۆژنامەوان لە مانشێتی راپۆرتدا سەرنج دەدەنە وەزن و قافییە و جووڵەی وشەکان. گرنگ ئەوەیە کە مانشێت لەگەڵ کەشوهەوا، تەوەر، شێوازی نووسین و چەشنی راپۆرت بگونجێت، کەوابوو جوانی بەتەنیایی ئەو مەبەستە دابین ناکات.



٣- گەیاندنی ناوەڕۆک: مانشێتی راپۆرت دەبێت ناوەڕۆکی بابەتەکە بگەیەنێت. دیارە هێندێک وشە ناتوانن وێنەی تەواوی راپۆرتەکە بن، بەڵام دەتوانن پەیام و ناوەڕۆکی راپۆرت لە مانشێتدا بوەشێنن. بەهەرحاڵ، پێویستە (مانشێت) ئاوێنەی تەوەری راپۆرتەکە بێت.

٤- کاردانەوەی هەبێت: پێویستە مانشێت، خوێنەر بخاتە ژێر رکێفی خۆی. کەوابوو، دەبێت کەڵک لە وشە و دەستەواژەی کارا وەربگرین. بەکار هێنانی رستە و واژەی نوێ و رازاوە و دڵگیر، ئەو مەبەستە دابین دەکەن.

ئەوە چوار راسپاردەی پێویست بوون (دیارە بە گوێرەی بابەت و تەوەری راپۆرت) بۆ نووسینی مانشێت، بەڵام بە مەرجێک کە نەبنە هۆی قوربانی کردنی پەیام و بانگەوازی راپۆرتەکە. واتە لەپێشچاوگرتنی کورتی، جوانی، گەیاندن و کاردانەوە، نەبێتە هۆی پێکهێنانی مانشێتێک کە بەزەقی لە بنەما و ناوەڕۆکی راپۆرتەکە دووربێتەوە. بەمانایەکی‌تر، مانشێت، پەیام و رستەیەک هەڵنەگرێت (هەرچەند جوان و رازاوە و کارا) کە هیچ پێوەندیکی بە ناوەڕۆکی راپۆرتەوە نەبێت.

رێنوێنییەکانی دیکە سەبارەت بە مانشێتی هەواڵ، بۆ مانشێتی راپۆرتیش گونجاون و پێویستە رەچاویان بکەین. لەوانە، مانشێت ناوەڕۆکدار و مانادار بێت، پرسیاری و نەرێنی نەبێت و ....بەڵام هێندێک جار دەکرێ ئەوانە لەپێشچاو نەگرین. پێویستە دووپاتی بکەینەوە، مانشێت دەروازەیەکە کە خوێنەر هاندەدات بۆ خوێندنەوەی راپۆرت و نارەوا بەکار هێنانی، راپۆرتی هەرەباش و رازاوە لەپێشچاو دەخات.

# پێکهێنەرەکانی راپۆرت

پێشتر باسمانکرد کە راپۆرت نووسین یەکێک لە ئەرکە هەرە دژوارەکانی رۆژنامەوانییە، کەوابوو راپۆرت، ئەگەر بەشێوازێکی رێکوپێک و شایستە و رازاوە ئامادە بکرێت، یەکێک لە بابەتە هەرە گرنگەکانی میدیایی پێکدێنێت.

لە رۆژنامەوانی هاوچەرخدا کاتێک هەواڵ و زانیارییەکان لەڕادە بەدەر و بەخێرایی سەرسورهێنەر گشت جیهان دەگرنەوە و مرۆڤەکان تینووی وەرگرتنی زانیاری تازەن، راپۆرتی شایستە، دەتوانێت وەلامدەرەوەی چاوەڕوانییە بەربڵاوەکان بێتەوە.

لێرەدا ئاماژە بە دابەشکردنی بەشەکانی راپۆرت دەکەین. دیارە شێوازی دابەشکردن و ئامادەکردنی راپۆرت دەتوانێت چەشنی جۆراجۆر لەخۆ بگرێت، بەلام ئەوەی فرە گرنگە و پێویستە بە وردی لەپێشچاو بگیرێت، پێکهێنەرەکانی یەک راپۆرتە کە لە تەواوی راپۆرتەکان و لە گشت تەوەرە گونجاوەکاندا بۆ راپۆرتدا، گرنگی هاوتایان نییە، واتە پێکهێنەرەکانی راپۆرت بە گوێرەی تەوەری راپۆرت، گرنگی جیاوازیان دەبێت.

رەنگە لە هێندێک لە راپۆرتەکاندا بەشی لێکۆڵینەوە، لە هێندێکیتر وتووێژ و لەوانی تردا بەشی بۆچوون گرنگی تایبەتی و سەرەکیان هەبێت. هەڵبژاردنی سەرەکیبوون و گرنگایەتی ئەو بەشە، پێوەندی بە توانا و ئەزموونی راپۆڕتەوانەوە هەیە. ئەگەرچی بۆ رێکوپێک کردن و رێکخستنی بەشەکانی یەک راپۆرت، شێوازی جیاواز هەیە، بەلام بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێکی گونجاو و شایستەی خوێندنەوە، پێویستە هێندێک رێوشوێن لەبەرچاو بگیرێت. راپۆرت



کاتێک سەرنجی خوێنەر(بینەر، بیسەر) رادەکێشێت کە گشت بەشەکانی بە شێوەیەکی هەماهەنگ لەگەڵ یەکتر ئامادە کرابێت.

**بەشە هەرە گرنگەکانی راپۆرت کە دەبنە هۆی شایستەبوونی، بریتیین لە:**

- **هەڵبژاردنی تەوەر**

لە نێوان گشت ئەو لایەنانەی دەیبینین، دەیبیسین و دەیخوێنینەوە، راپۆڕتەوان پێویستە کامەیان بکاتە تەوەری راپۆرتەکەی خۆی؟ لە کوێڕا بزانین تەوەری هەڵبژاردراو پەسندە و دەبێتە جێگای سەرنجی خوێنەر؟

لە وانەکانی هەواڵ نووسین و وتووێژدا، هەروەها لەو بەشەشدا، بەردەوام جەخت خراوەتە سەر گرنگی بەها هەواڵییەکان، سەرنجدانی ورد و بەگوێرەی ئەزموونەوە بەو بەهایانە، راپۆڕتەوان بۆ ئامادە کردنی راپۆرتێکی شایستە رێنوێنی دەکات.

پرسێکی گرنگ کە زۆرجار هەواڵنێر و راپۆڕتەوانە کەمئەزموونەکان دووچاری دەبن، بەهەڵەگرتنی زەوق و مەیل و دڵمەشخوولیەکانی خوێنەرە. واتە زۆرجار دیتراوە کە راپۆڕتەوان زۆر بەتین و هێز و چاوەڕوانی پێشوازیەکی مەزن لە لایەن خوێنەرەوە، راپۆرتێک ئامادە دەکات، بەلام ئاکام و رەنگدانەوەی چاوەڕوانکراوی لێناکەویتەوە. بە پێچەوانەوە، زۆرجار تەوەرێکی ئاسایی لە ژیانی رۆژانە، بە هۆی لەپێشچاوگرتنی بەهاکانی هەواڵی پێشوازییێکی شایانی لێکراوە.

پرسێکی گرنگیتر ئەوەیە کە راپۆڕتەوان هێندێکجار بە هەڵە دەچێت و بە لاسایی کردنەوەی راپۆرتە کۆنە سەرکەوتووەکان دیسان کار لەسەر ئەو تەوەرە کۆنانە دەکاتەوە، بەلام ئەو کردەوانە بە هۆی لاسایکردنەوەی نەشیاوانە، کەمتر سەرکەوتنیان وەدەستهێناوە.

- **لێکۆڵینەوە**

پێش هەر کارێکی پێوەندیدار بە ئامادەکردنی راپۆرت، پێویستە راپۆڕتەوان بە گوێرەی تەوەری راپۆرتەکەی، لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدات.

ئەو لێکۆڵینەوەیە بە تایبەت بۆ راپۆرتی زانستی، راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی یان لەبارەی شوێنەکان و تەنانەت بۆ راپۆرتی بۆنەکان، زۆر گرنگە و پێویستی بە وردبوونەوە هەیە. بۆ راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتی، راپۆرتەوان پێویستی بە کۆمەڵێک زانیاری لەبارەی تایبەتمەندییە گرنگەکانی کەسایەتییەکە هەیە کە لەپێشدا دەبێت زانیاری لەسەریان هەبێت. وەک تەمەن، رادەی خوێندەواری، بەرهەمەکانی، بیروبۆچوونەکانی، پێشینەی تێکۆشانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی و ... کە راپۆرتەکە رازاوەتر دەکات. ئەو پێداویستییانە بۆ راپۆرتی زانستی زۆرتر و گرنگترن. راپۆرت سەبارەت بە گەشەکردنی رێژەی دانیشتووانی گوندەکان، ئەگەر زانیاری وەک رێژەی گوندەکان، هەڵسەنگاندنی رادەی دانیشتوانی شار و گوند، رادەی گەشەسەندنی دانشتیوانی وڵات و هتدی، تێدا نەبێت، دیارە کەموکوڕی دەبێت.

بەڵام بەکارهێنانی زانیارییەکان لە شوێنی پێویستی راپۆرتەکەدا گرنگترە لە کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانە. ئەگەر لێکۆڵینەوەکان و بەدواداچوونەوەکان لە ناو راپۆرتەکەدا ئاماژەی پێنەکرێت و تەنیا بۆ گەشەکردنی زانیاری راپۆرتنووس بێت، هیچ سودێکی بۆ خوێنەر نابێت. هەروەها ئاماژەکردن بە تەواوی زانیارییەکان لە سەرەتا، کۆتایی و یان تەنیا لە بەشێکی راپۆرتەکەدا و بڵاو نەبوونەوەی لە سەرانسەریدا، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی سەرنجراکێشی راپۆرتەکە.

- **وتووێژ**

زۆر کەم راپۆرت هەن کە پێویستییان بە وتووێژ نەبێت، تەنانەت راپۆرتی وەسفی و یەکێک لە چەشنەکانی، واتە راپۆرتی خەیاڵی، باشترە بە وتووێژەوە ئامادە بکرێت.

چەند لایەنی گرنگی وتووێژ لە راپۆرتدا:

**أ- لایەنی بەڵگەیی و دیکۆمێنتاڵی دەدات بە راپۆرت.**

بۆ راپۆرتەکان، وتووێژ لەگەڵ کەسانێک ئەنجامدەدرێت کە زانیاریی زۆرتریان لەسەر تەوەری راپۆرتەکە هەیە، یان خۆیان ئاگادارن و لایەنێکی



رووداوەکە بوونە، یان خۆیان تەوەری راپۆرتەکە پێکدێنن. بۆیە وتووێژ، راپۆرت دیکۆمێنتاڵ دەکات.

**ب- گێڕانەوە لە زمانی کەسێکیترەوە.**

ئەگەر خوێنەر هەست بەوە بکات کە راپۆرتنووس تەنیا زانیاری و بۆچوونەکانی خۆی لە راپۆرتدا دەگێڕیتەوە، رەنگە پرسیار بکات، مەگەر ئەو راپۆرتنووسە چەندە لەمن زۆرتر دەزانێت؟ بەڵام وتووێژ لە راپۆرتدا خۆبەخۆ لە زەینی خوێنەردا رەنگدانەوەی ئەرێنی دەبێت و ئەو باوەڕە بە خوێنەر دەدات کە ئەو زانیاری و بۆچوونانە لە لایەن کەسانێکی ئاگا و پسپۆڕی تەوەرەکە ئامادەکراوە، کەوابوو دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەیەکی نەرێنی راپۆرت، لە بابەت و گفتوگۆیەکی تەنیا دوولایەنە لە نێوان راپۆرتنووس و خوێنەرەوە.

**پ- هەمەچەشنی**

راپۆرت بێ ئاماژەکردن بە وتەی کەسانیتر و بێ لێدوانی کەسانی ئاگادار لە رووداو یان تەوەرەکە، دەبێتە بابەتێکی یەکلاکەرەوە و بێزاری هێنەر.

**ت- خۆپاراستن لە وەڵامدەرێتی.**

زۆرجار لە رێگای لێدوانی کەسانیتر و وتووێژەوە، راپۆرتنووس ئەگەری وەڵامدەرێتی بابەت و تەوەری ئاماژە پێکراو لە راپۆرتدا، لەسەر خۆی هەڵدەگرێت، چونکە راپۆرتنووس تەنیا وتەکان و لێدوانەکان دەگوێزێتەوە. هەڵبەت ئەو خۆپاراستنە لایەنێکی لاوەکی کێشەی رۆژنامەوانییە. لەهەرحاڵدا و هەمیشە، لایەنی بەرپرس بۆ راستی و ناراستی راپۆرت، تەنیا و تەنیا راپۆرتنووسە. جیاوازی وتار لەگەڵ وتووێژ لە بەرپرسیارێتی و وەڵامداریەتیی دایە.

# دارِشتن و ڕێکوپێک کردنی راپۆرت

لە ناو سێ قۆناغی ڕێکوپێک کردنی راپۆرت، واتە لێکۆڵینەوە، ئامادەکردن و نووسین، نووسین وەک قۆناغی کۆتایی، بە هۆی ڕەنگدانەوەی ئاکام و ئەنجامی کار، بەشی هەرە گرنگی راپۆرت نووسین پێکدێنێت. بۆ دارِشتن و ڕێکوپێک کردنی راپۆرت، لێکگرێدان و هەماهەنگکردنی سێ بەشی راپۆرت(لێکۆڵینەوە، وتوویژ، بۆچوون و هەڵسەنگاندنی لایەنە بینراوەکان)، واتە نووسینی راپۆرت، لایەنی سەرەکی دەژمێردرێت.

شێوازی دارِشتنی راپۆرت، پێوەندی بە چەشن ، ئامانج و کردەوەی راپۆرتەوە هەیە، بەڵام وەک ئاماژەی پێکرا، بریتییە لە لێکگرێدان و سازدانی پێوەندی لە نێوان کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە، وتوویژ و بۆچوون و هەڵسەنگانی بیروڕاکان. بۆیە شێوازی نووسین(زمان و زاراوەی نووسین) و دارِشتنی پەیکەر و تەنەی راپۆرت بە گوێرەی تەوەر و چەشنی راپۆرت دیار دەکرێت. پێشنیاری ڕێوشوێن و نموونەیەکی نەگۆڕ و هەمیشەیی بۆ دارِشتن و ڕێکوپێک کردنی راپۆرت، نەتەنیا دژوارە، بەڵکو نەگونجاوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت ئاماژە بە هێندێک بنەمای سەرەکی بۆ دارِشتنی راپۆرت بکەین:

- **پێداچوونەوە**

پێش نووسینی دەقی کۆتایی راپۆرت، پێویستە پێداچوونەوەیەک بەسەر سێ بەشی سەرەکی راپۆرتدا ئەنجام بدەین و بەلایەنی کەم لایەنە



گرنگەکان دووبارە بنووسینەوە، پاشان بە لەپێشچاوگرتنی راستییەکان(فاکتەکان) بۆ قۆناغی دواتر تێپەڕبین. ڕۆژنامەوانانی بەئەزموون پێویستییان بە نووسینی ئەو لایەنە سەرەکییانە نییە، بەڵکو لە زەینی خۆیاندا پەروەردە و ئامادەی دەکەن.

- **لێکگرێدان**

لە ناو دەیان پرس و کێشەی ئامادەکراو بۆ راپۆرت، تەواویان گرنگی هاوشانیان نییە. هەروەها کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە، وتوویژ و بۆچۆن و هەڵسەنگاندنی بینراوەکان، نە شایانی گێڕانەوەن و نە گشتیان بۆ خوێنەر(بینەر، بیسەر) سوودیان هەیە. راپۆرتەوان لەو قۆناغەدا دەبێت لایەن و پرسە گرنگ و سەرنجڕاکێشەکان لێک جیا بکاتەوە و بە سازکردنی پێوەندی لە نێوانیاندا لێکیان گرێبدات.

- **هەڵبژاردنی شێوازی نووسین**

راپۆرتەوان پاش پێداچوونەوە و لێکگرێدان، شێوازی نووسینی راپۆرت هەڵدەبژێرێت. دیارە گشت راپۆرتەکان و تەوەرە جۆراجۆرەکان ناکرێت و نابێت بە یەک شێواز بنووسرێن. پێویستە بۆ هەر راپۆرتێک، شێوازێکی نووسینی جیاواز هەڵبژێرین.

شێوازی نووسینی راپۆرتی وەسفی دەبێت لەگەڵ راپۆرتی لێکۆڵینەوە و راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان و راپۆرتی بۆنەکان، جیاوازیان هەبێت. تەنانەت بۆ یەک چەشن راپۆرت بەڵام بە تەوەری جیاوازەوە، ناتوانیین شێوازێکی نەگۆڕ هەڵبژێرین. بۆ نموونە لە راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکاندا، راپۆرت سەبارەت بە پاڵەوانێکی بەتەمەن وراپۆرت سەبارەت بە هەڵبەستوانێک، بە یەک شێواز نانووسرێت. شێوازی نووسین لە راستیدا پۆشاکێکە لەبەر باڵای راپۆرت بۆ ڕازانەوەی و لەهەمان کاتدا بۆ جیا کردنەوەی لە نووسراوەکانیتر.

- **شێوەی نووسین**

شێوەی نووسین، کۆتایی کاری دارِشتن و ڕێکوپێک کردنی راپۆرتە. لەوانەیە گشت قۆناغەکانی دارِشتنی راپۆرت بە شێوەیەکی شایستە ئەنجام

بدەین، بەڵام لە قۆناغی نووسیندا (شێوەی نووسین) ئاکامی زەحمەتەکان بەتەواوی لەدەست بچێت. ناتوانین راپۆرتێکی رێکۆپێک و شایستی خوێندنەوە بدۆزینەوە کە بە شێوەیەکی ناشیانە نووسرابێت.

لێرەدا ئاماژە بە شێوەکانی جیاوازی نووسین بۆ راپۆرتە جۆراجۆرەکان دەکەین:

راپۆرتی لێکۆڵینەوە: بەشێوەی سەنگین و زانستیانە و هەڵگری هۆ و هۆکارەکان.

راپۆرتی بۆنەکان: بەشێوەی سەنگین لەگەڵ هێندێک وەسف.

راپۆرت لەسەر بنەمای وتووێژ: بەشێوەی جیدی و هەڵگری کاردانەوە لەگەڵ هێندێک وەسف.

راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان: بەشێوەی وەسفی لەگەڵ هێندێک لێکۆڵینەوە و هۆ و هۆکارەکان.

راپۆرتەهەواڵ: بەشێوەی جیدی، بێ وەسف، بە لێکۆڵینەوە.

راپۆرتی وەسفی: بەشێوەی وەسفی و شاعیرانە، هەڵگری کاردانەوە، ئازاد لە هۆوهۆکارەکان.

راپۆرتی ئازاد و راپۆرتی گاڵتاوی: بەشێوەی وەسفی و پەخشان و هەڵگری دەستەواژە رازاوەکان.

هەڵبەت ئەوە وەک پێشنیارێکە بۆ هەڵسەنگاندن، دەنا دەکرێ راپۆرت سەبارەت بە کەسایەتییەکان بەشێوەی کەڵک وەرگرتن لە لێکۆڵینەوە و هۆ و هۆکارەکان بنووسرێت، یان راپۆرتی بۆنەکان بە شێوەی شاعیرانە و زۆر ناسک.

# وتووێژ و تایبەتمەندییەکانی

**وتووێژ** (Interview) **چییە؟**

وتووێژ پرسیار و وەڵامێکە لە نێوان دوو یا چەند کەسدا کە بە مەبەستی گەیاندن و گواستنەوەی پەیامێکی خاوەن هەواڵ یان خاوەن تەوەرێکی میدیاییتر، ئەنجامدەدرێت و کاردانەوەی ناوەکی و دەرەکی ڕێکخراوەیی پێوەدیارە.

پایەکانی وتووێژ:

١- وتووێژکار(هەواڵنێر)
٢- وێژەر
٣- تەوەر
٤- ئاکام
٥- میدیا و دەزگای ڕاگەیاندن
٦- خوێنەر(بیسەر، بینەر)

**بۆچی وتووێژ دەکەین؟**

١- بۆ هەواڵگری(وەدەستهێنانی هەواڵ).
٢- ناسینی وێژەر (تایبەتی - تێکڕایی).
٣- ناساندنی ڕووداو یان کەسێک بە خوێنەر(بیسەر، بینەر).
٤- ڕوونکردنەوەی ئاڵۆزی و نادیاری.



٥- بنیاتنانی پێوەندی لە نێوان خەڵک و وێژەر.
٦- گەورەکردنەوە و بەرجەستەکردنی تەوەرێک یان هەواڵێک.
٧- بچووککردنی تەوەرێک یان کەسایەتییەک.
٨- دۆزینەوە یان سازکردنی خوێنەر(بینەر، بیسەر).
٩- پێکهێنانی کەشوهەوا و کانگایەکی تایبەت و ڕەوتدان بە بیروڕای گشتی.
١٠- پشتبەست و دیکۆمێنتکردنی هەواڵەکان.
١١- ناساندنی وێژەر.
١٢- دابینکردنی ئاسایشی نەتەوەیی.

بەهەر چەشنێک بێت، مەبەست و ئاکامی سەرەکی وتووێژ خوێنەرە(بینەرە، بیسەرە) نە بێژەر.

**تایبەتمەندییەکانی وتووێژکار**(Interviewer):

١- کەسێک کە خاوەن شەمی میدیاییە.
٢- خاوەن زەوق و هزری نووسینە و داهێنەرە.
٣- کونجکاو و وێژەوانە.
٤- توانای ڕاهاتن و تێکەڵاوی لەگەڵ چینە جۆراجۆرەکانی خەڵکی هەیە.
٥- خێرایە لە فامکردن، بەتوانایە لە بیرکردنەوە و بڕیاردان.
٦- لەسەرەخۆ و هێدییە، (مرۆڤی بزۆز و ناهێدی ناتوانێت ببێتە ڕۆژنامەوان).
٧- خاوەن زانیاری و زانستە و هۆشیار و ئاگایە.
٨- پەیوەستە بە بنەما سەرەکییەکانی ئەخلاقی پیشەیی.
٩- چالاک و چاونەترسە.
١٠- لووتبەرز و فڕناخ نییە و زیادەبێژی ناکات.
١١- دەمارگیر نییە.
١٢- زەین و هۆشی باشە.
١٣- زانایە لە لێدوان و لێکدانەوەی باشە.

**تایبەتمەندییەکانی وێژەر**(Interviewee):

١- وێژەر کەسێکە کە هەوڵدەدات وتووێژەکە بەسودی خۆی تەواو بکات.

٢- خاوەن زانیاری پێویستە سەبارەت بە تەوەری وتووێژەکە، یان وا دەنوێنێت.

٣- خۆبچووککردنەوەی لا پەسەند نییە و بەهیچ چەشنێک رێگا نادات زانیارییەکانی لەسەر تەوەری وتووێژەکە کەم هەڵسەنگێندرێن.

٤- وێژەر ئەگەر بکەوێتە هەلومەرجێکی لاواز و هەستبکات کە لە رووی ناچارییەوە زانیاری دەدرکێنێت، لەبەرامبەر پرسیارەکاندا بەربەرەکانی دەکات و هەوڵی گۆڕینی رەوتی وتووێژەکە دەدات.

**قۆناغەکانی وتووێژ:**

١- دابینکردنی تەوەر.

٢- لێکۆڵینەوە و کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە تەوەرەکە.

٣- ناسینی پلەوپایەی یاسایی و کۆمەڵایەتی و ناسینی لایەنەکانی کەسایەتی وێژەر.

٤- ئامادەکردن و داڕشتنی پرسیارەکان.

٥- دیاریکردنی کاتی وتووێژ لەگەڵ وێژەر.

**تەوەرەکانی وتووێژ:**

١- وەدستهێنانی هەواڵ لەو ناوەند و لایەنانە کە بە سەرچاوەی هەواڵ دەژمێردرێن.

٢- کۆکردنەوەی زانیاری پێویست بۆ رووداو یان هەواڵێک کە پێشتر رووی داوە.

٣- کەس یان کەسانێک کە ناساندنیان بۆ خوێنەر(بینەر، بیسەر) سوودمەندە.

**رێگاکانی وەدەستهێنانی تەوەری وتووێژ:**

١- ئارشیڤخانەی فەرمانگە و دۆسیەکانیان.

٢- هاوکاری لەگەڵ تۆڕەکانی راگەیاندن و پێوەندییەکان.



٣- ئارشیڤی رۆژنامە و کەسەکان.

٤- وەدەستهێنانی زانیاری و بۆچوونەکانی پسپۆڕان و هاوکاران(خۆ ئامادە نەکردن بۆ وتووێژ بەمانای دانی جڵەوی وتووێژ بە وێژەرە)

**لێکدانەوەی ئامانجی وتووێژ**

پێش پرسیارکردن لە سەرچاوە و یان وێژەر، پێویستە رۆژنامەوان ئامانجی سەرەکی و گشتی بۆ وەرگرتنی زانیاری لە وێژەر، لێکبداتەوە.

وتووێژکار پێش ئاراستەکردنی پرسیارەکان، پێویستە رەهەندێکی گشتی بۆ بەکارهێنانی وتووێژ لە هەواڵ یان راپۆرتدا، دابڕێژێت و ئاگادار بێت کە زانیارییەکانی وەدەستهاتوو لەو گفتوگۆیەدا، لە کام شوێنی هەواڵەکان یان راپۆرتەکەیدا جێگا دەکاتەوە. هەروەها لەرەوتی وتووێژیشدا، بەردەوام بیرۆکەی بەکارهێنانی زانیارییەکانی وتووێژەکە لە بەرهەمی رەچاوکراویدا هەڵبسەنگێنێت و بەگوێرەی ئەو لێدوان و زانیارییە تازانەی دێتە ئاراوە، بیربکاتەوە لەو گۆڕانەی بەسەر نووسراوەکەیدا دێت. گرنگتر و گونجاوتر ئەوەیە کە هەواڵنێر لەپێشدا یان لەکاتی وتووێژدا، راستەوخۆ بیر لەو کەموکووری و پێداویستیانەی گوزارشەکەی بکاتەوە کە لەسایەی ئەو وتووێژەدا، پێویستیان بە راست بوونەوە هەیە.

**گفتوگۆ وتووێژ نییە**

گفتوگۆ دەتوانێت سەبارەت بە یەک یان چەند بابەتێک بێت و تەنانەت لە درێژەدا، تەوەری خۆی ون بکات. بەڵام وتووێژ یەک تەوری هەیە لەگەڵ ئامانجێکی روون و دیاریکراو.

گفتوگۆ پێویستی بە میدیا و خوێنەر(بیسەر، بینەر) نییە، بەڵام وتووێژ بە پێچەوانەوە، بۆ میدیا و بۆ خوێنەر(بینەر، بیسەر) رێکدەخرێت.

**بەدواداچوونی بەربڵاو و پێویست، پێش ئەنجامدانی وتووێژ**

رۆژنامەوان نابێت بترسێت لەوەی خۆی بێ ئاگا پیشانبدات ( بێئاگا پیشاندان لەگەڵ بێئاگا بوون جیاوازە)، بەڵام رەوا نییە شانازی بە بێئاگایی خۆی بکات. پێش وتووێژ لەگەڵ هەر کەس یان کەسانێک، باشترە

رۆژنامەوان سەبارەت بە هەر لایەنێکی پێوەندار بە وێژەر و تەوەری وتوویژەکە، بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بکات. ئەو کارە سەرەڕای تایبەتمەندییە ئاماژە پێکراوەکانی پێشوو، دەبێتە هۆی پێشگرتن لە بێئاگایی و خافڵبوونی رۆژنامەوان کە ئەوەش بەهەڵە چوون و ونکردنی ئامانجەی وتوویژی لێدەکەویتەوە.

**تایبەتمەندییەکانی پرسیار لە وتوویژدا:**

١- پێویستە پرسیار بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، وێژەر لە ئامانجی وتوویژ نزیک بکاتەوە، واتە پرسیار رووی لە ئامانج بێت.

٢- پێویستە پرسیار روون و ئاشکرا بێت.

٣- پلەوپایەی وێژەر لەپێشچاو گیرابێت.

٤- هەڵگری پێشکەشکاری(پێهەڵگوتن) و نازناو زەق نەبێت.

٥- پرسیار نابێت بە شیوەی پرسکاری(دادوەرانە) یان وەک گفتوگۆیەکی خۆمانە بێت.

٦- پێویستە پرسیارەکان خاوەن نەریتێکی رێکوپێک بن.

٧- پرسیار بە شێوەیەک داڕێژرابێت کە وەڵامەکەی یەک وشە نەبێت. (بەڵێ یان نەخێر)

٨- پرسیار نابێت چەند لایەنە بێت، چونکە لەوانەیە وێژەر سەرنج بداتە تەنیا یەک لایەن و بەشەکانیتر لەبیر بکات.

٩- پرسیار دەبێت پێشاندەری کارزانی و لێهاتوویی رۆژنامەوان، سەبارەت بە تەوەری وتوویژەکە بێت.

١٠- پرسیار بە شێوەیەک داڕێژرابێت کە وێژەر ناچار بکات وەڵامێکی روون و ئاشکرا بداتەوە.

**جۆری پرسیار لە وتوویژدا**

جۆری پرسیار پێوەندی بە ئامانجی وتوویژەوە هەیە:

١- ئەگەر ئامانجی وتوویژ گشتیی بێت، پرسیارەکانیش گشتی دەبن. (پرسیاری گشتی)



٢- ئەگەر مەبەست وەدەستهێنانی زانیاری وردە، پێویستە پرسیارەکانیش ورد بن. (پرسیاری ورد)

**تایبەتمەندییەکانی پرسیاری گشتی:**

١- وەڵامەکان گشتی دەبن.

٢- ماوەی وتوویژ دوورودرێژ دەبێت.

٣- وتوویژ لە ناوەندێکی گەرم و خۆمانەدا بەڕێوەدەچێت، چونکە وێژەر ناچار نابێت وەڵامی پرسیاری تایبەت بداتەوە.

٤- وەڵامی گشتی بۆ پرسیارە گشتییەکان، رەنگە کۆمەڵێک زانیاری لێبکەویتەوە و لەوانەیە پرسی گرنگی تێدا بێت.

٥- هەڵسووڕاندنی وتوویژ دەکەویتە دەست وێژەر.

**تایبەتمەندییەکانی پرسیاری ورد:**

١- وەڵامەکان تەنیا روونکەرەوەی پرس و پاژەکانن.

٢- وەڵامەکان رێژەیەکی کەمتر لە زانیاری روون دەکاتەوە.

٣- کاتی وتوویژ بە گشتی کورتە.

٤- وتوویژ لە ناوەندێکی ساردوسڕدا بەڕێوەدەچێت.

٥- هەڵسووڕاندنی وتوویژ لە دەست رۆژنامەواندایە.

**لە هەر وتوویژێکدا دوو چەشنە پرسیار دێنە ئاراوە:**

١- پرسیاری دیاریکراو،

٢- پرسیار لە درێژەی وەڵامەکاندا،

پرسیاری دیاریکراو، بریتییە لەو پرسیارانەی لەپێش وتوویژدا ئامادەکراون، بەڵام رەنگە لە درێژەی وتوویژدا گۆڕانیان بەسەردا بێت.

پرسیار لە درێژەی وەڵامەکاندا، بریتییە لەو پرسیارانەی کە بەگوێرەی وەڵامی وێژەر یان بە هۆی کەشوهەوای وتوویژ، ئاراستەی وێژەر دەکرێن.

تێبینی: زۆرجار "پرسیار لە درێژەی وەڵامەکاندا"، گرنگتر دەبن لە پرسیاری دیاریکراو.

**ئەو هۆیانەی لە دارشتنی پرسیارەکاندا کاردانەوەیان هەیە:**

١- کارزانی و لێهاتوویی وتووێژکار سەبارەت بە تەوەری وتووێژ.
٢- ناسینی پێشتری ویژەر لە لایەن وتووێژکارەوە.
٣- ئامانجی وتووێژ.
٤- کات و سات و شوێنی وتووێژ.
٥- کەسایەتی ویژەر(دارشتنی پرسیار بە گوێرەی کەس یان کەسانی تایبەت)
٦- ئەزموونی وتووێژکار.
٧- چەشنی وتووێژ: بەربڵاو، ئازاد ...
٨- شێوەی وتووێژ: بە نووسراوە، بە تەلەفۆن، دیداری.

باشترین شێوە بۆ بەرەنگاری لەگەڵ وەڵامنەدانەوەی ویژەر، دووپاتکردنەوەی پرسیارە بە شێوازیتر و لە درێژەی وتووێژدا، یان ئاماژەکردن بە لێدوانی پسپۆران سەبارەت بەو کێشەیە، یان ئاماژەکردن بە وەڵامی کەسانیترە بەو پرسیارە.

ئەگەر وتووێژکار پێش وتووێژ مەودای لێکۆڵینەوەی نەبێت، بۆ دارشتنی پرسیارەکان کەڵک وەرگرتن لە بەهاکانی هەواڵی "کێ، لەکوێ، کەی، چی،بۆچی، چۆن" دەتوانێت یارمەتیدەر بێت.

هەروەها کەڵک وەرگرتن لە فۆرمۆڵی "ڕێسراو" بۆ هێندێک وتووێژ کە مەودای لێکۆڵینەوە نییە، کاریگەرە، بەتایبەت بۆ وتووێژ سەبارەت بە کێشە ئابوورییەکان و پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە.

فۆرمۆڵی "ڕێسراو": کاتی دەسپێک و ئەنجامی پرۆژە، رەهەندەکان، کۆسپەکان، ئامانجەکان و گوژمەی(بودجەی) پێویست.

**چەند فێڵبازییەک لە وتووێژدا:**

١- کلیلی هەر وتووێژێک "بۆچییە". هەوڵبدەن لە هەر شوێنێک بۆ پرسیارەکەتان وەڵامتان بۆ نەدۆزرایەوە، هەروەها بۆ شکاندنی بێدەنگی لەناوەندی وتووێژدا، لەو وشەیە کەڵک وەربگرن.



٢- پرسیارەکان لە پرس و کێشە هەرە گرنگەکانەوە دەستپێبکەن و بە لایەنە کەمگرنگەکان کۆتایی پێبێنن. ئەگەرچی ڕێزپەڕ(ئیستسنا) هەیە.

٣- دەستپێکی وتووێژ نابێت هەستی دژبەرایەتی لێبکەوێتەوە.

٤- هەر کاتێک نەکرا وەڵامی پرسیارەکانتان لەناو ئەو وەڵامانەی دەدرێنەوە بدۆزنەوە یان وەڵامی پرسیارێک لاتان روون نەبوو، یان هۆشیاریتان لە رەوتی وتووێژ وتووێژەکە لەدەست دا!!، دەتوانن کەڵک لە پرسیاری، "تکایە رونتری بکەنەوە"، وەربگرن.

٥- بەڕێوەبردن و هەڵسووڕاندنی وتووێژ لە لایەن وتووێژکارەوە، لایەنی هەرە گرنگی وتووێژێکی سەرکەوتوە.

**بۆ وتووێژێکی سەرکەوتوو، پێویستە ئەو تێبینیانە لەپێشچاو بگرن:**

ئا) رێگانەدان بە "بێدەنگی".
ب) سەرنجدان بە لێدوانی ویژەر و رێکوپێکبوونی لێدوانەکانی خۆتان.
پ) پێداگری و سوربوون بە شێوەیەکی ڕێزدارانە بۆ گەیشتن بە وەڵام.
ت) پاشەکشەنەکردن لەبەرامبەر وەڵام نەدانەوەی ویژەر.
ج) تورەنەکردنی ویژەر، چونکە شکستهێنانی وتووێژی لێدەکەوێتەوە، ئەگەرچی هێندێکجار کەڵک وەرگرتنی زیرەکانە لەو شێوەیە، پێویستە.

**خاڵە لاوازەکانی ویژەر و وتووێژکار**

ئا) لاوازییەکانی ویژەر:
١- ملنەدان بۆ بەشداری لە وتووێژدا.
٢- لاوازبوون و خەمساردی ویژەر لە کارگێڕی و کردەوە پیشەییەکانیدا.
٣- نەبوونی متمانە بە وتووێژکار.
٤- نەدرکاندنی بیروبۆچوون بە هۆی لەدەستدانی پلەوپایە یان بە هۆی بەرژەوەندییە تاکەکەسی یان گشتییە سیاسی و ناسیاسییەکان.
٥- نەبوونی یاسای تایبەت کە بەگوێرەی ئەو، ویژەر ناچار بکرێت زانیاری ببەخشێت.

ب) لاوازییەکانی وتووێژکار:

١- زاڵنەبوون بە سەر تەوەری وتووێژدا.

٢- ونکردنی ئامانجی وتووێژ کە لادان لە تەوەری سەرەکی لێدەکەوێتەوە.

٣- نەناسینی ویژەر پێش وتووێژ.

٤- هەست بە بچووکی کردن و خۆ بەکەم زانین.

٥- کەم ئەزموونی وتووێژکار.

٦- ئەگەر وتووێژکار خاوەنی داهێنەری، خێرایی تێگەیشتن و هۆشیاری و زیرەکی نەبێت.

٧- ترسی لەدەستدانی پیشە.

**تایبەتمەندییەکانی وتووێژێکی رێکوپێک:**

١- پرسیار و وەڵامی نائاسایی.

٢- پرسیاری چاوەڕوان نەکراو و پێشبینی نەکراو.

٣- یەکبەدووکردن و تێکهەڵچوونی بابەتیانە(هەڵبەت نە لێکدان!) لە نێوان دوو لایەندا.

٤- هاوسەنگی و هەماهەنگی پرسیار و وەڵامەکان.

٥- درێژخایەن نەبوونی بێهودە و بێکەڵک.

٦- روونکردنەوەی لایەنی ئاڵۆزی پرسیارەکان.

٧- هەڵبژاردنی "لید"ی گونجاو و بەگورز.

**وتووێژ، ئەو زانیاریانە لەخۆ دەگرێت:**

١- زانیاری لە لایەن وێژەرەوە کە پێوەندی راستەوخۆی بە پرسیارەوە هەیە.

٢- کۆمەڵێک زانیاری کە وێژەر هەڵیدەرێژێت و رەنگدانەوەیەکی ئەرێنی هەیە و لەسەر ئەو بنەمایە هێندێک هەواڵی تازەتر وەدەستدێت.

٣- هێندیک زانیاری کە بەهۆی سەرنجدان و وردبونەوەی وتووێژکار لە کار و ژیان و دەوروبەری وێژەرەوە دەستی دەکەوێت.

## چەشنەکانی وتووێژ و تایبەتمەندییەکانییان

جۆرەکانی وتووێژ بە گوێرەی شێوەی ئەنجامدانیان بریتیین لە:

١- وتووێژی ڕووبەڕوو(چ بۆ ڕۆژنامەکان، چ بۆ ڕادیۆ و تەلەفزیون)

٢- وتووێژی نووسراوە(لە ڕێگای فاکس یان ئەنتەرنێتەوە)

٣- وتووێژ لە ڕێگای تەلەفۆنەوە(چ بۆ ڕۆژنامەکان، چ بۆ ڕادیۆ)

وتووێژی ڕووبەڕوو و چەشنەکانی

١- یەک کەس لەگەڵ یەک کەس

٢- یەک کەس لەگەڵ چەند کەس

٣- چەند کەس لەگەڵ یەک کەس

٤- چەند کەس لەگەڵ چەند کەس

پێویستە وتووێژکار تەوەری وتووێژەکەی لێکدابێتەوە و بەتەواوی لەسەر بابەتەکە و کەسایەتی وێژەرەکە زاڵبێت.

**تایبەتمەندییەکانی وتووێژی تەلەفزیۆنی:**

١- شێوازی دەنگ و وێنە گرنگی تایبەتی هەیە.

٢- ئارامی و لەسەرەخۆبوون لە کاتی ئاڕاستەکردنی پرسیارەکاندا.

٣- گونجکاویی و پەیگیریی.

٤- دابینکردنی بێدەنگی و پرسیارکردن لە گشت بەشداربووان.



٥- بەکارهێنانی گونجاوی جوولەی سەر و دەست و ڕووخسار لەگەڵ شێوازی لێدوان و هەماهەنگبوونیان لەگەڵ لایەنی بابەتەکان.

٦- ڕوانگەی گونجاوی کامێرا، لێزانینی دەرهێنەری تەلەفزیۆنی، جلوبەرگ و ڕازاندنەوە، لایەنە گرنگەکانی‌تر پێکدێنن.

**تایبەتمەندییەکانی وتووێژی ڕادیۆیی:**

١- دەبێت پرسیارەکان ڕوون و ئاشکرا بن.

٢- کورت و پوخت بن.

٣- دەنگ پاک و زوڵاڵ بێت و هاتوهەرای تێکەڵ نەبێت.

٤- پەیڤ و لێدوانەکان نابێت ئاڵۆز و دابڕاو بن.

٥- ئاهەنگ و نەوای پەیڤ و لێدوانەکان لەگەڵ تەوەری وتووێژدا هەماهەنگ بێت.

**وتووێژی نووسراو:**

چەشنێک وتووێژە کە بە بێ‌ئامادەبوونی وێژەر، بەڕێوە دەچێت(بە هۆی نەبوونی کات بۆ وتووێژ یان ئامادەنەبوونی وێژەر). ئەو چەشنە وتووێژە بە شێوەیەکی گشتی تەوەری هەواڵ ناگرێتەوە و زۆرتر بابەتە ناسیاسییەکان و ناگرنگەکان دەگرێتەوە و لە دەمەقاڵە و تێکهەڵچوون بێبەش دەبێت، چونکە تەنیا وەڵامی پرسیارە لەپێش‌ئامادەکراوەکان دەگرێتەوە. زۆرتر بۆ وتووێژی زانستی و هتد لەو شێوەیە کەڵک وەردەگیرێت. تەنیا لایەنی پەسەندی ئەو شێوەیە، حاشانەکردن و بەرپەرچنەدانەوەی وێژەرە لە لێدوانەکانی.

**کەماسییەکانی وتووێژی نووسراو:**

١- بەفێڕۆچوونی کات بە هۆی درەنگ وەڵام دانەوەی وێژەر.

٢- ئاڵۆزی لە وەڵامەکاندا.

٣- ئەگەری وەڵام نەدانەوەی هەندێک لە پرسیارەکان.

٤- دەرفەتی گۆڕینی ناوەڕۆک و ئامانجی هێندێک لە پرسیارەکان لە لایەن وێژەرەوە.

٥- نەبوونی دەرفەت بۆ پرسیار کردن لەسەر وەڵامەکان.

٦- وێژەر، وتووێژ دەکات بە گۆڕەپانی پروپاگاندەی خۆی.

٧- هەڵسووڕاندنی وتووێژ دەکەوێتە دەست وێژەرەوە.

٨- ناچارین تەواوی وەڵامەکان بڵاو بکەینەوە.

**وتووێژی رووبەڕوو:**

باشترین شێوەی وتووێژە، دەرفەت بۆ ئاڕاستە کردنی هەر چەشنە پرسیارێک هەیە، لەوانە، پرسیار لەسەر وەڵامەکان. هەڵسووڕاندنی وتووێژ لەدەست وتووێژکار دایە.

**وتووێژی تەلەفۆنی(وتووێژی خێرا):**

ئەو وتووێژە زۆرتر لە کاتی تەنگانە و لەبەر دەست نەبوونی وێژەر، پێکدێت و خاوەن تایبەتمەندی نوێیەرانەیە.

ئامادەبوونی وتووێژکار و وێژەر و تێگەیشتنیان سەبارەت بە تەوەری وتووێژەکە گرنگە. وردبوونەوە و خێرایی وتووێژکار بۆ ئاڕاستە کردنی پرسیار لەناو وەڵامەکاندا، لایەنی زۆر گرنگی وتووێژی تەلەفۆنی پێکدێنێت. متمانەی دوولایەنە، مەرجی سەرەکی ئەو شێوە وتووێژەیە. لەو شێوە وتووێژەدا، وتووێژکار کەمتر توانا و هێزی خۆی بەکار دێنێت، چونکە ناتوانێت کەشوهەوای شوێنی وتووێژ و هەستی وێژەر هەڵسەنگێنێت، و هەڵسووڕاندنی وتووێژ لە لایەن وتووێژکارەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەزموون و زانایی وتووێژکار لەباری زمانەوانی و لێدوانەوە. هەروەها دەرفەتی پرسیاری زۆر نییە و دەمەقاڵە و تێکهەڵچوونی کەمتر لێدەکەوێتەوە.

**هێندێک لە شێوەکانیتری وتووێژ:**

١- وتووێژ بۆ هەواڵ.

٢- وەتووێژی قووڵ یان بنەڕەتی.

٣- وتووێژی بەربڵاو.



٤- وتووێژی ئازاد.

٥- وتووێژی ئاڕاستە دارێژراو.

٦- مێزگرد.

٧- وتووێژ - راپرسی.

٨- بیرورا گۆڕینەوە.

٩- وتووێژ لەگەڵ شاهیدی رووداودا.

١٠- وتووێژی دیکۆمینتاڵی مێژوویی.

١١- هەڵسەنگاندنی بۆچوونە جیاوازەکان.

١٢- رووبەڕووکردنەوەی دژبەرەکان.

**وتووێژ بۆ هەواڵ:**

ئامانجی، وەدەستهێنانی زانیارییە لە وێژەر سەبارەت بە چەندوچۆن و لێکدانەوەی رووداوێک یان تەوەرێک بە گوێرەی ئەو راستیانەی لەبەر دەست دان. (دەتوانرێت ئەو زانیاریانە زانیاری سەرەتایی یان پاڵاوتوو یان بیروبۆچوونی پسپۆڕان، بەرپرسان و چاودێران بن).

**وتووێژی قووڵ یان بنەڕەتی:**

بۆ دووبارە هەڵسەنگاندنی کەسایەتییەک یان پەردەلادان لەسەر رازوڕەمزەکانی هێندێک لایەنی پێوەندیدار بەو کەسایەتییە پێکدێت. لەو وتووێژەدا، وتووێژکار دەست دەداتە پشکنینی راستەوخۆی کونوقوژبنەکانی بیرورا و بۆچوونەکانی تاکەکەسی، یان پرسێکی پێوەندیدار بەو کەسەوە. ناسینی چرۆپڕی پرسەکە و یان کەسایەتییەکە، پێداویستی گرنگ و سەرەکی ئەو شێوە وتووێژە پێکدێنێت.

**وتووێژی بەربڵاو:**

بە پێچەوانەی وتووێژی قووڵ یان بنەڕەتییە. لە وتووێژی قووڵدا، مەبەست لێکدانەوەی چۆنیەتی و هەڵسەنگاندنی بارستاییە، بەڵام لە وتووێژی بەربڵاودا، مەبەست زۆرتر چەندایەتییە و پرسیارەکان پتر لە روانگەیەکی ئاساییەوە دەڕواننە بابەتی وتووێژەکە(لە یەک یان دوو تەوەردا).

**وتووێژی ئازاد:**

تەوەری وتووێژ لە لایەن وتووێژکار و وێژەرەوە دیاری نەکراوە. وەک وتووێژی تایبەت لەگەڵ هونەرمەندان و وەرزشوانان. کات بۆ بڵاوکردنەوە و ئەنجامدانی وتووێژی ئازاد سنووردار نییە و تەوەری جۆربەجۆر و کورتی پرسیار و وەڵامەکان، تایبەتمەندی ئەو شێوە وتووێژە پێکدێنێت.

**وتووێژی ئاراستە دارێژراو:**

لەو چەشنە وتووێژانەدا، تەوەرێکی دیاریکراو لەپێشدا و بە رێککەوتن لە نێوان وتووێژکار و وێژەر ئامادە دەکرێت و هیچ بابەتێک لە دەرەوەی ئەو رێکەوتنە نایەتە ئاراوە. وتووێژی دارێژراو، بەگشتی لەباری کاتەوە، سنووردارە.

**مێزگرد:**

چەشنێک وتووێژی رووبەڕووە و وتووێژکار سەبارەت بە یەک یان چەند تەوەرێکی تایبەت لەگەڵ چەند لایەن کە لەسەر تەوەر یان تەوەرەکان بەگشتی بۆچوونی هاوتا و یەکسانیان هەیە، ئەنجامی دەدات.

**وتووێژ - راپرسی:**

چەشنێک وتووێژە کە بە شێوەی ئاراستەکردنی یەک پرسیار لە چەند کەس یان چەند پرسی پێوەندیدار بە تەوەرێکی تایبەت، بەڕێوە دەچێت. گرنگی و سەرنجڕاکێشی ئەو شێوەیە لە رێکوپێککردن و شێوازی بەڕێوەبردنی وتوێژەکە دایە.

**بیرورا گۆڕینەوە:**

چەشنێک وتووێژی رووبەڕووە و وتووێژکار بابەتێک ئاراستەی چەند کەس دەکات کە بۆچوونی جیاوازیان هەیە. وتووێژکار بە ئامادەیی و زانستەوە، تەوەری بابەتەکە شیدەکاتەوە و وتووێژەکە بەڕێوە دەبات.

**وتووێژ لەگەڵ شاهیدی رووداودا:**

ئەو وتووێژە بۆ راپۆرتە هەواڵ یان خودی هەواڵ ئامادە دەکرێت و فرە لایەن و سەرنجڕاکێشە. ئامانجی، پشت راستکردنەوەی رووداوەکان و



پێشاندانی لایەنی جۆربەجۆری راستییەکانە و لەگەڵ شاهیدەکانی پرسێک یان رووداوە رۆژانەکان ئەنجامدەدرێت و دەتوانێت وتووێژێکی قووڵ، بەربڵاو و بنەڕەتی بێت.

**کۆنفرانسی چاپەمەنی (وتووێژی گشتی):**

لە وتووێژی گشتیدا کە بە کۆنفرانسی چاپەمەنی ناسراوە(چەندکەس لەگەڵ یەککەس، یان چەندکەس لەگەڵ چەندکەس)، وتووێژکار رووبەڕووی هێندێک پرسی جیاواز لە وتووێژەکانیتر دەبێتەوە. تایبەتمەندی هەرە گرنگی ئەو شێوە وتووێژە بریتییە لە نەخشی بەرتەسکی هەر وتووێژکارێک بە هۆی کردەوەی وتووێژکارانیتر، واتە کاردانەوەی هەر وتووێژکارێک پەیڕەوی هەڵسوکەوتی وتووێژکارانیتر دەبێت. دیارە رادەی ئەو پەیڕەوییە رەها نییە و پێوەندی بە هۆکارەکانیترەوە هەیە. بۆ نموونە هێندێک وێژەر زۆرتر گرنگی بەو میدیایانە دەدەن کە پشت بە بیستن و بینین دەبەستن و پتر بڵاوبوونەوەی دەنگ و رەنگ لایان پەسەندە و لەسەر ئەو باوەڕەن کە رادەی بیسەران و بینەران زۆرترە لە رێژەی خوێنەری چاپەمەنییەکان.

تایبەتمەندییەکی دیکەی وتووێژی گشتی بریتییە لە بەرتەسکبوونی کاردانەوەی پێوەندی دوولایەنە، کە سەرچاوەکانی بریتیین لە:

یەکەم، بەربڵاویی تەوەری بابەتەکان، بە هۆی بەشداری ژمارەیەکی زۆر لە وتووێژکاران لە وتووێژدا کە رەنگە هێندێک لەو تەوەرانە لە پێشدا لێکۆڵینەوەشی لەسەر نەکرابێت.

دووهەم، مەودای پرسیار و وەڵامێکی زۆر بۆ وتووێژکار نییە. پێوەندی دوولایەنە لاوازە و وتووێژکار مەودای دەسناکەوێت بەردەوام کاردانەوەی هەبێت لەسەر لایەنی بەرامبەر، واتە لەسەر وێژەر.

رێکوپێک کردنی گوزارش سەبارەت بە کۆنفرانسی چاپەمەنی دژوارترە لە وتووێژی تایبەت. یاداشتەکان بەربڵاوترن و هێندێک لەوانە لەکاتی داڕشتن، کەموکوڕیان دەبێت، واتە کۆمەڵێک زانیاری ئاڵۆز وەدەستدێت کە پێویستیان بە ریکۆپێککردن و یەکخستن دەبێت.

# تەکنیکەکانی وتووێژ

## پرسیار

دارشتنی پرسیار بۆ بەکارهێنانی لە هەواڵ و گوزارشی میدیاییدا، کارزانییەکی زۆری پێویستە. لەوانەیە وتووێژ وەک شێوەیەک لە گفتوگۆ هەڵسەنگێنین، بەڵام لە راستیدا گفتوگۆیەکی ئاسایی نییە. هێندێکجار بۆ پتر بیستنی وێژەر و سەرگەرمکردنە و هێندێکجار ئاکامی گوێ هەڵخستنە و زۆرجاریش پێویستی بە ئامادەکاری هەیە. بەهەرحاڵ، لە میدیاکاندا "پرسیار" یەک ئامانجی سەرەکی هەیە: کۆکردنەوەی زانیاری.

وتووێژ چ رووبەڕوو یان چ بە تەلەفۆن بێت، دەقێکی ئامادە و بەردەست نییە کە وەدەست رۆژنامەوان بکەوێت، بەڵکو پێویستە رۆژنامەوان هەمیشە چاوەڕوانی وەڵامی نائاسایی بێت و بە شێوەیەکی خێرا لێکدانەوەی وەڵامەکان بکات و سەبارەت بە پرسە گرنگەکانی ناو وەڵامەکان ئامادەی پرسیارکردن بێت. ئامانجی ئەو پرسیارانە، یان دۆزینەوەی لایەنە شاراوەکانە، یان بۆ تێگەیشتنی زۆرتری رۆژنامەوانە، بەڵام هەرچۆنێک بێت، کەرەسەی پێشاندانی لووتبەرزی رۆژنامەوان نییە و ئامرازێک نییە بۆ خستنە ژێر رکێفی وێژەر و بۆ شانازیکردنی وتووێژکار بە رادەی زانستی خۆی.

زۆربەی وتووێژەکان ساکار و ئاشکران. بەڵام لە دوو کاتدا وتووێژ کێشەساز دەبێت:

یەکەم، کەسانێک لەبەرامبەر پرسیاردا زۆر کەللەڕەقی دەکەن و لێدوانیان رێکوپێک نییە.

دووهەم، ئەو کەسانەی بەویست وەڵام نادەنەوە و دژبەرایەتی دەکەن.



دواتر ئەو دوو کێشەیە زۆرتر روون دەکەینەوە.

**هێندێک لە پرسە سەرکییەکانی وتووێژ:**

- **دیاریکردنی ئامانجی وتووێژ، پێش دەسپێکی وتووێژ**

رۆژنامەوان پێش ئاراستەکردنی پرسیار لە سەرچاوە یان وێژەر، ئامانجی سەرەکی لە وەرگرتنی زانیاری لە وێژەر، هەڵدەسەنگێنێت و چوارچێوەیەکی گشتی بۆ بەکارهێنانی وتووێژەکەی لە هەواڵ یان لە گوزارشدا ئامادە دەکات تا بزانێت زانیارییەکانی بەرهەمی وتووێژەکە لە کام شوێنی هەواڵەکان یا گوزارشەکەیدا جێگادەکاتەوە و ئەو زانیارییە تازانە چ گۆڕانێک لە نووسراوەکەیدا پێکدێنێت. هەروەها زۆرگرنگە پێش ئەنجامدانی وتووێژ، رۆژنامەوان بیر لە کەمایەسی و پێداویستییەکانی خۆی بۆ ئامادەکردنی گوزارشەکەی بکاتەوە و تەنانەت ئەوانە یادداشت بکات. ئەو کارە دەبێتە هۆی دارشتنی پرسیاری بەکەڵک و سوودمەند و وتووێژکار بێنیاز دەکات لە دووبارە پێداچوونەوەی مەبەستی وتووێژەکە، لە کاتێکدا پێویستە وتووێژی دووبارە لەگەڵ هەمان وێژەر یان لەسەر هەمان تەوەر بێت.

- **لێکۆڵینەوەی بەربڵاو پێش ئەنجامدانی وتووێژ**

رۆژنامەوان نابێت بترسێت لەوەی خۆی بێ ئاگا پێشانبدات (بێئاگا پێشاندان لەگەڵ بێئاگا بوون جیاوازە)، بەڵام رەوا نییە شانازی بە بێئاگایی خۆی بکات. پێش وتووێژ لەگەڵ هەر کەس یان کەسانێک، باشترە رۆژنامەوان سەبارەت بە هەر لایەنێکی پەیوەندیدار بە وێژەر و تەوەری وتووێژەکە، بەدوا داچوون و لێکۆڵینەوە بکات. ئەو کارە سەرەڕای تایبەتمەندییە ئاماژە پێکراوەکانی پێشوو، دەبێتە هۆی پێشگرتن لە بێئاگایی و خافڵبوونی رۆژنامەوان کە ئەوەش بەهەڵە چوون و ونکردنی ئامانجی وتووێژی لێدەکەوێتەوە.

- **پرسیاری ساکار و سادە، پەسەندترە**

لە تێکۆشانی رۆژنامەوانیدا بە دەگمەن هەڵدەکەوێت کە پرسیاری ئاڵۆز و ناڕوون، سەرکەوتنی بۆ رۆژنامەوان وەدەسهێنابێت. دارشتنی پرسیاری ئاڵۆز، تەنیا پێشاندەری بێ ئەزموونی هەواڵنێرە و پتر نیشانەی

خۆبەزۆرزانینە تا وەدەسهێنانی ئاکامی باشتر. پرسیاری هەرە باش بە "کێ؟ چی؟ لەکوێ؟ چۆن؟ کەی؟ بۆچی؟"(ئەمەش پرسیار و پێکهێنەری سەرەکی هەواڵ) دەسپێدەکات. ئەگەر هەواڵنێر بە روونی، وەڵامی ئەو پرسیارانە وەربگرێتەوە، دەتوانێت دڵنیا بێت کە بنەما سەرەکییەکانی هەواڵ، گوزارش یان زانیاری پێویستی بۆ ئامادەکردنی بابەتەکەی خۆی دابینکردووە.

لە گوزارش سەبارەت بە رووداوەکان، سەرقاڵی و ئەرکی سەرەکی رۆژنامەوان دووبارە دارشتنەوە و ساخکردنەوەی رووداوەکانە بەو شێوە مێژووییەی کە روویانداوە. دۆزینەوەی شاهید و کەسانی ئاگادار لە رووداوەکان، یارمەتیدەرێکی هەرە گرنگی زیندووکردنەوەی رووداوەکان لە سەرەتاوە تا کوتایی رووداوەکە، پێکدێنێت. تەنانەت سەبارەت بە پێش رووداوەکانیش دەکرێ لەو کەسانە زانیاری وەدەستبێنین و ساتێرەکانی رووداوەکان بە پرسیاری هەنگاوبەهەنگاو دووبارە زیندووکەینەوە. لێرەدایە کە بۆ ئەو مەبەستە، پرسیاری "پاشان چ روویدا؟" یارمەتی هەواڵنێر دەدات. لەو شێوازە بۆ گوزارشی کارەساتەکان کەڵک وەردەگرین. سەرئەنجام هەواڵنێر بەگوێرەی وتووێژ و زانیارییە وەدەستهاتووەکان، دەتوانێت بەوردی دیمەنی رووداوەکان لە زەینی خۆیدا وێنا بکات. ئەگەر ئەو کارە بۆ رۆژنامەوان دژوار بێت، مانای وایە ناروونی و ئاڵۆزی لە هێندێک خاڵی رووداوەکاندا هەیە.

- **هێدیکردنەوەی وێژەر**

هێندێکجار بۆ ئامادەکردنی هەواڵ یان گوزارش سەبارەت بە کارەساتەکان، پێویستە لەگەڵ کەسانێک کە لەنزیکەوە و راستەوخۆ بینەری رووداوەکان بوون، وتووێژ ئەنجام بدرێت. هێندێک لەو کەسانە بەهۆی کارەساتەکە دوچاری زیان دەبن و لەوپەڕی پەرۆشی و ئازاردا ناتوانن زانیاری تەواو بەکەڵک بدرکێنن، کەوابوو پێویستە هەواڵنێر بەهانای ئەو کەسانەوە بچێت، هاودەردیان لەگەڵ بکات و لەپرسیارکردنی خێرا خۆبپارێزێت و پاش هێدی کردنەوەیان، بەئاسپایی وەڵامی پرسیارەکانی



وەربگرێت. پێویستە بەگوێرەی ئەو پرسیارانە رووداوەکە وەک فیلمێکی ئارام لە زەین و بیری شاهیدەکان دەرکێشێت تا بتوانێت رووداو و کارەساتەکە دووبارە لە زەینی خۆیدا پەروەردە و زیندوو بکاتەوە. ئەو پرسیارانە لەوانەیە سەبارەت بە رەنگ، بۆن، کات، چۆنیەتی و یان لێدوانە پەیوەندیدارەکان بە رووداوەکە بن. دیارە کۆی ئەو پرسانەیە کە وێنەی رووداو و کارەساتەکە دووبارە زیندوو دەکەنەوە. پرسیار سەبارەت بە شوێنی راوەستانی ئەو کەسانە، جلوبەرگ و وتەکانی زیان لێکەوتووەکان و تەنانەت کەش و هەوا لە کاتی کارەساتەکە و ... یارمەتیدەری دووبارە پێداچوونەوە و وێناکردنی رووداوەکە دەبێت.

- **وردبوونەوە لە ناو و پلەوپایەکان**

پێویستە هەواڵنێر زۆر بەوردی ئاگادار بێت لە ناو و پاشناو، تەمەن، پلەوپایە و پیشەی وێژەر و ئەو کەسانەی لە هەواڵ یان گوزارشدا ئاماژەیان پێدەکات یان بۆ بابەتەکەی پێویستی پێیان هەیە. لە سەرچاوەکانیش داوا بکات بەروونی ناوی خۆی و کەسانی ئاماژەپێکراو، ئاشکرای بکات و تەنانەت بینووسێت. لەوانەیە هەواڵنێر ئەو کارە بە نەخوێندەواری خۆی لە لای سەرچاوە هەڵسەنگێنێت، بەڵام ئەگەر هەواڵنێر ناوەکانی بە هەڵە نووسی و بە هەمان شێوە لەچاپ درا، ئەو کاتە، خوێنەران و چاوەدێران گومانیان لە نەخوێندەواری هەواڵنێر نامێنێت!

- **کۆکردنەوەی ژمارەی تەلەفۆن**

رۆژنامەوان پاش ماوەیەک کار کردن هێدی‌هێدی بە هۆی پیشەکەی، پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵک دەگرێت و بۆ وتووێژ یان وەرگرتنی زانیاری، هێندێک ژمارە تەلەفۆن کۆدەکاتەوە. زۆر گرنگە ئەو ژمارە تەلەفۆنانە بە شێوەیەکی رێکوپێک لەبەر دەستدا بن و بەردەوام تازە بکرێنەوە. هەروەها گرنگە تەواوی ژمارە تەلەفۆنەکانی ئەو کەسانە(وەک: ماڵێ، شوێنی کار، مۆبایل و ...) لەبەر دەست بن، تەنانەت ژمارەی فاکس و ناونیشانی ماڵپەر و ئیمەیل.

بۆ وڵاتانی دەرەوە پێویستە سەرنج بدەنە پێش‌ژمارەی وڵات و شارەکان.

● **کۆکردنەوەی زانیاریی هەمەلایەنە**

هێندێکجار هەواڵنێر بۆ وتوویژ تەنیا دەستی بە یەک سەرچاوەی سەرەکی(پێوەندار یان ئاگادار لە هەواڵ و رووداوەکە) دەگات. کەوابوو، پێویستە زانیاری هەمەلایەنە لەو کەسە وەربگرێت و گشت پرسیارە پێویستەکان ئاراستەی بکات. دەنا دەرفەتی وێناکردنی رووداوەکە لەدەست دەدات. زۆر نموونە لەو هەواڵ یان گوزارشانە هەیە کە چاپ نەکردنی باشترە لەوەی بە کەم و کورییەوە ئامادە بکرێت، چونکە پاشان گیروگرفت سازدەکەن.

رۆژنامەوان هەرچەندە خاوەن ئەزموونیش بێت تا کاتێک بەکردەوە دەست نەکات بە ئامادەکردنی هەواڵ یان گوزارش، هەست بە کەم و کورییەکانی ناکات.

● **مەترسی هەستکردن بە نەزانین**

زۆرجار هەڵدەکەوێت کە لەگەڵ کەسێک سەرقاڵی وتوویژ و گوێڕاگرتنین و بەردەوامیش بەنیشانەی ئەرێنی و پەسندکردنی لێدوانی وێژەر، سەر دەلەقێنین، بەڵام لەراستیدا ئاگاداری ناوەڕۆکی لێدوانەکان نین. لە کاتی وەهادا ترسمان لەوە هەیە کە ئەگەر داوا لە وێژەر بکەین تا زۆرتر پرسەکە روون بکاتەوە، وێژەر ئێمە بە نەزان هەڵسەنگێنێت. پاشان کاتێک هەواڵنێر سەرقاڵی ئامادەکردنی بابەتەکەی دەبێت، ئەوکات بۆی دەردەکەوێت کە لە تەواو یان بەشێکی لێدوانەکانی وێژەر، واتە لەو پرسانەی کە لە کاتی وتوویژدا سەری بۆ دەلەقاند، هەر تێنەگەیشتووە.

هەواڵنێر بە هیچ شێوەیەک نابێت لە پرسیارکردن سەبارەت بە پرسە سەرەکییەکان بسڵەمێتەوە و یان لە پرسیارکردن دوچاری شەرمەزاری بێت. لایەنەکانی وتوویژ تا ئەو رادەیە بێ ئەخلاق نین کە بە هۆی نەزانینی هەواڵنێر، گاڵتەی پێبکەن. جا ئەگەر گاڵتەش بکەن، چ دەقەومێت؟ کێ نەزان ترە؟ ئەو کەسەی کە نازانێ و دەپرسێ، یان ئەوەی نازانێ و وادەنوێنێت کە دەزانێ؟ ئەگەر هەواڵنێر ئاگاداری کێشە و پرسێک نییە، رەوا نییە کەسانیتر هەڵخەڵەتێنێت و خۆی ئاگادار پێشانبدات، بەڵکو باشترە پرسیار بکات.



زۆربەی زۆری سەرچاوە ئاگادارەکان و پسپۆڕان بە دڵنیایەوە زانیارییەکانی خۆیان بۆ هەواڵنێر یان هەر کەسێک گوێگریان بێت، ئاشکرای دەکەن، چونکە گوێگرێکی بەزەوقی زانیارییەکانیان دۆزیوەتەوە.

● **روونکردنەوەی گومانەکان**

ئەگەر هەواڵنێر پرسیارێکی ئاراستە کردووە و وەڵامەکەی لا روون نییە یان تەوەری گوزارشەکەی زۆر ئاڵۆزە، باشترە سەبارەت بە لێدوانەی وێژەر، هەڵسەنگاندنی خۆی ئەگەر کەموکوڕیشی تێدابێت بە وێژەر رابگەیێنێت. نابێت بترسین لەو پرسیارە: "رێگام بدەن بزانم تەوەرەکەم باش فام کردووە...؟" یان: "رێگام بدەن رووداوەکە دووپات بکەمەوە بەو شێوەیەی فامم کردووە." هەروەها: "ئەگەر بەو شێوەیە بنووسم...تەوەرەکەم باش گێڕاوەتەوە؟"

ئەوەیە شێوازی کاری رۆژنامەوانی و ئەگەر رەچاوبکرێت هیچ کەس هەواڵنێر بە نەزانی تاوانبار ناکات. تەنانەت ئەگەر واش بیر بکەنەوە، بەکارهێنانی ئەو شێوازە پەسەندترە لە مەترسییەکانی ئامادەکردنی گوزارش یان هەواڵێکی بێ بنەما و پڕ لە هەڵە.

● **وەدەستهێنانی زانیاری، نەوەک رەنگدانەوەی بیرو بۆچوونەکان**

هەواڵنێر بۆ وەدەرخستنی زانیاری و پرسەکان، وتوویژ دەکات. پێویستە مەبەستی هەر پرسیارێک دابینکردنی زانیاری و پرسە سەرکییەکان بێت و خۆ بپارێزین لە پرسیار سەبارەت بە بۆچوونی وێژەر و رەنگدانەوەی رووداوەکە یان تەوەری وتوویژەکە لە زەینی وێژەردا. بەدەگمەن رەنگدانەوەکان سەرنجراکێش دەبن، تەنانەت زۆرجار دەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی پرسە سەرەکی و پێویستەکان. دژایەتی سیاسەتوانێکی پاوانخواز لەگەڵ چاکسازی ئازادیخوازانە، هەواڵ نییە. تەنیا کاتێک ئەو هەڵوێستە بۆ خوێندنەوە دەبێت کە تەوەری گوزارشێک سەبارەت بە بیروبۆچوونەکان پێکبێنێت.

لە وتوویژە هەواڵییەکاندا، خۆماندووکردن بە هەڵسەنگاندنی بیروباوەڕی کەسایەتییەکان سەبارەت بە رووداوەکان، لە سەرنجراکێشی هەواڵ و

گوزارش کەم دەکاتەوە، بەتایبەت ئەگەر ببێتە کۆسپی ڕێگای وەدەستهێنانی زانیاری و پرسە سەرەکییەکانی هەواڵ یان گوزارش.

● **پرسیارە باوەکان**

"هەستی ئێوە چییە؟"، ئاراستە کردنی ئەو پرسیارە لە کەسێک کە لە ڕووداوێکی دڵتەزێن ڕزگاربووە، پرسیارێکی زۆر باو و کلێشەییە و بەگشتی، وەڵامەکەی دیارە. ڕەنگە وەڵام نەدانەوەی پرسیارەکانی‌تر، یەکێک لە پاشکۆ ناڕەواکانی ئەو پرسیارە بێت. دایکێک کە تەنیا زارۆکی خۆی لە ڕووداوی کەوتنی فڕۆکەیەک لەدەست داوە، چۆن وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە؟: "هەست بە لەرزینی تەواوی لەشم دەکەم؟"

وەڵامی پرسیارە باو و کلێشەییەکان، هیچ پرسێک بۆ خوێنەر(بیسەر، بینەر) ڕوون ناکەنەوە، تەنانەت کەسێک کە خەڵاتی هەرە مەزنی لاتاری بردۆتەوە، ئەگەر لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا بڵێ: "لە بردنەوەی ئەو پارە زۆرە خافڵگیر بووم"، چ بۆ خوێنەر ڕوون دەکاتەوە؟

شایانی سەرنجە کە پرسیاری باو و کلێشەیی، جیاوازی هەیە لەگەڵ داڕشتنی پرسیاری ڕاستەوخۆ و ڕوون کە پێشتر باسمانکرد. ئەو پرسیارانە، بنەڕەتی و سەرەکین و ئەم پرسیارانە، زۆر دووپات دەبنەوە و کلێشەیی و لاساکەرەوەن.

● **گاڵتە و نوکتە**

بەکارهێنانی نوکتە و بۆچوونی گاڵتاوی، هەمیشە یارمەتی تازەیی و زیندووبوونی بابەت و نووسراوەکان دەدەن. پێویستە هەواڵنێر لە لابەلای گوزارش و هەواڵدا، کەڵک لەو نوکتانە وەربگرێت بە مەرجێک، بەڕاستی نوکتە بن و لە هەواڵ و گوزارشدا وەک پینەیەکی ناڕێک و نالەبار نەکەوێتە پێشچاو. هەروەها بەکارهێنانی نوکتە و لێدوانی گاڵتاوی کەسانی‌تر، پێویستە بە شێوازی سروشتی خۆی و لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێبکرێت، نەکو هەواڵنێر قاچ لەسەر قاچ دانێت و پرسیار لە بەرامبەرەکەی بکات: "تکایە بەسەرهات یان نوکتە هەرە شیرین و گاڵتاوییەکانی تا ئێستا بەسەرت هاتووە، بیگێڕەوە." دڵنیا بن کە هیچ لایەنێکی سەرنجڕاکێش نابیسن! بەجێگای



ئەو شێوازە، باشترە هەواڵنێر ڕێگا بداتە وێژەر تا سەبارەت بە ژیان، کردەوە و هەڵسوکەوتی خۆی، بە شێوەیەکی سروشتی و لە شوێنی خۆیدا، نوکتە گاڵتاوییەکان ئاشکرا بکات. بۆ نموونە، هەواڵنێر لەگەڵ خزمەتگوزارانی کۆمپانیایەکی فڕۆکەوانی سەبارەت بە دەسبەکار بوونی هێڵێکی تازەی ئاسمانی بە مەبەستی ئاگاداربوون سەبارەت بە هەڵسوکەوتی موسافیران و میواندارانی فڕۆکە لە یەکەم گەشتدا، وتووێژ دەکات. پرسیار لە فڕۆکەوانەکە "تکایە سەبارەت بە هەڵسوکەوتی گاڵتاوی موسافیران هێندێک بدوێ"، شێوەیەکی هەرە ناپەسەندە بۆ وەرگرتنی زانیاری لەو بارەیەوە. لە جێگای ئەو پرسیارە، دەکرێ ئاراستەی وتووێژەکە بە شێوەیەکی سروشتی بگوێزینەوە سەر "چاوەڕوانی نائاسایی موسافیران"، "ترسی هێندێک کەس لە فڕین"، "باروبنە نائاساییەکانی کە موسافیران لەگەڵ خۆیان دەیهێننە ناو فڕۆکە"، "سکاڵا لە خواردەمەنییەکان"، هەڵسوکەوتی منداڵان"، "داخوازییە سەیروسەمەرەکانی موسافیران" و هتد، دڵنیا بن کە میواندارەکان، بیرەوەری زۆر بەنرخ و گاڵتاوییان بۆ گێڕانەوە پێدەبێت.

● **دەستەواژە تایبەتەکان**

پێویستە هەواڵنێر لە وێژەر سەبارەت بە پرسە ناڕوون و ئاڵۆزەکان، داوای ڕوونکردنەوە بکات. بەڵام هێندێک لەو ڕوونکردنەوانە بریتین لە لایەنێک دەستەواژە و وشە کە تەنیا بۆ پسپۆڕەکانی ئەو بوارە مانای هەیە و مرۆڤی ئاسایی بە دروستی لێی تێناگات. هەرکام لە بوارەکانی پیشەسازی، خزمەتگوزاری و ... خاوەن دەستەواژەی تایبەت و تەکنیکی خۆیانن و لە هەر بوارێکدا مانای جیاوازیان هەیە.

بۆ نموونە، لە بواری سەربازیدا وشەی "پشتیوانی ئاسمانی" بۆ هێرشی ئاسمانی، واتە بۆ بۆمباران بەکار دێت. لە ڕۆژانی کۆتایی شەڕی ڤیەتنام، وتەبێژی سوپای ئامریکا، سەرهەنگ "دێڤید ئاپفر" لە کۆنفرانسێکی چاپەمەنییەدا کە پاش هێرشێکی ئاسمانی سوپای ئامریکا پێکهات، گوتی: "میدیاکان بەردەوام باسی بۆمباران دەکەن، ئەوە بۆمباران نییە، بەڵکو پشتیوانی ئاسمانییە".

لە ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٧٩دا، پاش کارەساتێک کە بە "تری مایل ئایلەند" ناوبانگی دەرکرد، ئەگەری مەترسی بڵاوبوونەوەی تیشکی ناووکی لە ناوەندە ناووکییەکاندا بوو بە هەواڵێکی گرنگ. بە گوێرەی لێدوانی بەرپرسان، "بڵاوبوونەوەیەکی نائاسایی" لە ناوەندێکی ناووکیدا روویدابوو کە پێوەندی هەبوو بە "جیابوونەوەی گەردیلەکانی وزە" و بە "ئۆکسید بوون"ی لەسەرەخۆ، و ئەگەری ئالوودەبوونی دانیشتووانی بە پلۆتۆنیۆم لێدەکەوتەوە. ئەو لێدوانە تەکنیکییە بە واتەیەکی ئاسایی یانی: "رووداوێک لە وزەگەیەکی ناووکی روویداوە کە بۆتە هۆی تەقینەوەیەک لە ناو ناوەندی بەرهەمهێنانی وزە و ئاگرێکی مەزنی لێکەوتووتەوە و ئالوودەبوونی ژینگە بە پۆلۆتۆنیۆمی بەدواوە بوو." واتە، دەستەواژە تەکنیکییەکان، داپۆشانێکە بۆ فام نەکردنی هەمەلایەنە و راستییەکانی ئەو رووداوە، بەڵام کاتێک مانای وشەکان روون دەکەینەوە ئەوکات ناوەرۆکی کارەساتەکە ئاشکرا دەبێت.

- **سەرنجدان لە لێدوانەکان**

هێندێکجار لە کاتی وتووێژ و بەهۆی ئامادەکردن یان گەڕان بەدوای پرسیاری داهاتوودا، هەواڵنێر سەرنجی لێدوانەکانی وێژەر نادات، هەروەها تۆمارکردن یان نووسینی لێدوانەکان، سەرنجی هەواڵنێر لە لایەنە گرنگەکانی وەڵامی وێژەر دوور دەخاتەوە، ئەوە لەدەستدانێکی مەزنە و لەوانەیە دووپات کردنەوەی ئەو هەڵانە هیچ کاتێک گونجاو نەبن، بەتایبەت ئەگەر وێژەر تەنیا شاهیدی رووداوەکە یان تەوەرەکە بێت، یان پرسێکی زۆر گرنگ و نائاسایی باسبکات.

- **پێداچوونەوە بەسەر وەڵامەکاندا**

پێویستە هەواڵنێر پاش تەواوبوونی وتووێژ، پێداچوونەوەیەک بەسەر دەقی وتووێژ و یادداشتەکانی خۆیدا بکاتەوە تا دڵنیا بێت کە پرسە سەرەکییەکان و زانیارییە گرنگەکان لەبیرنەکراون و ئایا ئەو لایەنانەی کە لەپێشدا گوماناوی بوون، راستکراونەتەوە یان نا. ئەو کارە سەرەڕای دڵنیایی هەواڵنێر لە دروستی شێوازی بەڕێوەبردنی وتووێژەکە، دوو دەستکەوتی‌تریشی هەیە، یەکەم، هەواڵنێر ئاگادار دەبێتەوە لەو پرس و لایەنە



ناروون و ئاڵۆزانەی کە لەبیرکراون باسیان بکات و پێویستیان بە روونکردنەوە هەیە. کەوابوو دەبێت بۆ روونکردنەوەی ئەو پرسانە دیسان لەگەڵ شاهید و سەرچاوەکان، وتووێژ بکاتەوە و یان لە سەرچاوەی تازە بگەڕێت. دووهەم، ئەگەر زانیاری و وتووێژەکان کەموکوڕیان هەیە، دەکرێ بۆ کۆکردنەوەی زانیاری تازە و روونکردنەوەی پتر، لە رێگای سەرچاوەکان و وێژەرەکانەوە، ناونیشانی کەسانی ئاگادار وەربگرێت.

- **بەڵێندان بە وێژەرەکان**

تەنیا سەرنووسەر سەبارەت بە قەوارە و چۆنیەتی و کاتی چاپکردنی وتووێژ یان بابەتەکانی رۆژنامە، بڕیار دەدات. زۆرجار پاش تەواوبوونی وتووێژ، وێژەر پرسیاری کاتی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە هەواڵنێر دەکات، لێرەدا هەواڵنێر بۆی نییە وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، بەڵکو پێویستە روونی بکاتەوە کە ئەو، تەنیا یەک هەواڵنێرە و کەسێکی‌تر بڕیاری ئەو ئەرکانە دەدات، تەنانەت دەتوانێت ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنی سەرنووسەر بدات بە وێژەر بۆ وەرگرتنی زانیاری زۆرتر سەبارەت بەو پرسانە.

- **ئاماژەکردن بە ناو و پێناسەی وێژەر**

ئاشکرا نەکردنی ناو و پێناسەی سەرچاوە و وێژەر، یەکێکە لە لایەنە دژوارەکانی کاری رۆژنامەوانی. زۆر وێژەر و سەرچاوە ئامادە نین، ناو و پێناسەیان ئاشکرا بکرێت. دژوارییەکە لێرەدایە کە هەواڵنێر ناچارە متمانە بەو کەسانە بکات، چونکە مەترسی لەدەستدانی زانیاری بۆ گوزارش و بابەتەکەی لێدەکەوێتەوە. لەو هەلومەرجەدا دوو تێبینی دێتە گۆڕێ:

یەکەم، پێویستە زۆر بەدەگمەن وشەی "سەرچاوەی نەناسراو" بەکار بێنین. بەڵام ئەگەر ناچار بین لە بەکارهێنانی زانیاری سەرچاوەی ئاوا، باشترە لە کۆتایی بابەتەکە و پاش زانیاری سەرچاوە ناسراوەکان، ئاماژە بە زانیاری "سەرچاوەی نەناسراو" بکەین.

دووهەم، وەک رێنموونی بۆ هەواڵنێران، هەمیشە چوارچێوەی هاوکاری لەگەڵ "سەرچاوەی نەناسراو" روون بکەنەوە تا پاشان دوچاری گیروگرفت و کێشە نەبن. پێویستە روون بێتەوە، ئایا مەبەستی "سەرچاوەی نەناسراو" لە

ئاشکراکردنی هێندێک زانیاری، تەنیا یارمەتیدانی هەواڵنێرە بۆ بەدواچوونە و کۆکردنەوە و تەواو کردنی پرس و کێشەکەیە؟ یان، تەنیا بۆ زانیاری هەواڵنێرە و پێویستە ئەو پرسە بەتەواوی نهێنی بمێنێتەوە؟ لێرەدایە کە دەبێت روون بێتەوە، ئایا دەکرێت ئەو زانیاریانە بە بێ ئاماژەکردن بە ناوی سەرچاوەکەی بڵاوبکرێنەوە؟ رۆژنامەوان بە شێوەیەکی ئاسایی، ئاگاداری ئەو مەرج و چوارچێوانە نییە. ئەگەر سەرچاوە لە کاتی وتووێژدا داوایکرد "ئاماژە بە ناوی من مەکە"، پێویستە هەواڵنێر سنوور و چوارچێوەی ئەو کردەوە نهێنییە روون بکاتەوە.

لێرەدا کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە هەواڵنێر نابێت ساکارانە تەسلیمی ئاماژەنەکردن بە ناوی سەرچاوە بێت. پێویستە بۆ سەرچاوە روون بکرێتەوە کە گرنگی گوزارش و هەواڵ و ئاشکرا کردنی کێشەکان لە روون بوونی سەرچاوە دایە. بەڵام ئەگەر سەرچاوە سووربوو لەسەر نهێنی مانەوە، هەواڵنێر نابێت کۆتایی بە وتووێژەکە بێنێت، بەڵکو پێویستە بە لەپێشچاوگرتنی تەواوی لایەنە پسپۆرییەکانی خۆی، درێژە بە گفتوگۆ بدات. لە کۆتایی وتووێژدا دەکرێت لەگەڵ سەرچاوە سەبارەت بە ئاماژەدان بە ناوی، پێکبێن. بەهەرحاڵ، بۆ رازیکردنی سەرچاوە لە ئاماژەدان بە ناوی، پێویستە لە هەموو رێوشوێنەکان کەڵک وەربگیرێت.

لە وتووێژدا نابێت جڵەوی وێژەر ئاواڵە بکرێت تا هەرچی پێخۆشە بدوێت و لە کۆتاییدا بڵێت، "ئەرێ پێمخۆشە ئەو لێدوانانەی من لای خۆمان بمێنێتەوە و ئاماژە بە ناوی من مەکە." ناوی سەرچاوە تەنیا کاتێک نهێنی دەمێنێتەوە کە لە پێشدا هەواڵنێر و سەرچاوە لەسەری پێکهاتبن. بەڵام ئیتر هەڵەیەکی یەکجار گەورەیە، ئەگەر سەرەڕای ئەو پێکهاتنە، ئاماژە بە ناوی سەرچاوە بکرێت. تەنانەت ئاشکراکردنی ناوی سەرچاوە بۆ سەرنووسەر، دەستەی نووسەران و هاوکارانیش هەڵەیە.

یەکێک لە کەموکوڕییەکانی ئاشکرا نەکردنی سەرچاوە، کەڵکوەرگرتنی بەرپرسانی سیاسی و راوێژکارەکانیانە بۆ مەبەستە سیاسییەکانی خۆیان، بۆ



نموونە ئەو رووداوی خوارەوە کە لە سمینارێکی رۆژنامەوانی زانکۆی هاروارد لە مۆسکۆ باسی لێکراوە، سەرنجراکێشە:

راوێژکارێکی پایەبەرزی سەرکۆماری روسیا داوا لە هەواڵنێرێک دەکات بۆ وتووێژێکی تایبەت و گرنگ، بەڵام بەمەرجێک ئاماژە بە سەرچاوەکەی نەکات. تەوەری وتووێژەکە ئاشکراکردنی پرۆژەیەکی سەرەکی و گرنگی ئابووری وڵات دەبێت. هەواڵنێر بەپەلە دەگەڕێتەوە ناوەندی رۆژنامە و خەرێکی رێکوپێک کردنی هەواڵە گرنگ و بەنرخەکەی دەبێت و لەسەر زمانی "سەرچاوەیەکی بەرز و نزیک لە سەرکۆمار" بڵاویدەکاتەوە.

بەڵام سەرکۆمار بە هۆی ئاشکرابوونی کتوپڕ و نەگونجاو، خۆ لە راگەیاندنی پرۆژەکە دەپارێزێت. دیارە راوێژکارەکە سووربوو کە هەواڵەکە چاپ و بڵاو دەبێتەوە، لێرەدا ئەنجوومەنی وەزیران هەڵەکە دەقۆزێتەوە و بە بیانووی ئاشکرابوونی پرۆژەکە، پرۆژەیەکی جیاواز ئامادە و پێشکێشی پەرلەمان دەکات. لەو نێوەدا تەنیا هەواڵنێرە کە گەمەی پێکراوە. لەو نموونەیەدا چەند وانە وەردەگرین:

یەکەم، پێویستە هەواڵنێر تەوەری وتووێژ و بابەتەکە لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی دیکە تاوتوێ بکات. دووهەم، هەواڵنێر دەبێت ئاگادار بێت کە سیاسەتوانەکان بۆ دەربازبوون لە قەیرانەکان بە شێوەیەکی ئاسایی کەڵک لە هەواڵنێران وەردەگرن.

سێهەم، پێداگرتن لەسەر نهێنی مانەوەی ناوی سەرچاوە و تەنیا ئاماژەکردن بە "سەرچاوەیەکی ئاگادار کە ناوی خۆی ئاشکرا نەکرد"، رێگایەکە بۆ ئاشکراکردنی هێندێک پرس و کێشە، بە بێ لەئەستۆگرتنی بەرپرسایەتی بڵاوکردنەوەی.

چوارەم، رۆژنامەوانی بەئەزموون هەرگیز ناکەوێتە گەمەی سیاسی کەسانیتر، بەڵام سیاسەتوانەکان بە مافی خۆیان دەزانن لە هەر چەشنە کەرەسەیەک بۆ بەرژەوەندی خۆیان سوود وەربگرن.

بۆ هەواڵنێر زۆرگرنگە کە کاتێک ئاماژە بە لێدوانەکانی سیاسەتوانێک دژ بە کەس یان حیزبی بەرامبەری دەکات، هەرگیز نابێت شک و گومانی هەبێت

لە ئاشکراکردنی ناونیشانی سەرچاوەکەی، چونکە هەواڵ یان گوزارش سەبارەت بە هێرشکردن بۆ سەر لایەن یان ناوەندێک، بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەی ئاشکرا و روون، گوزارش و هەواڵێکی ناتەواوە.

● **وتوویژ لەگەڵ ئەو کەسانەی بەویست وەڵام نادەنەوە و دژبەرایەتی دەکەن**

زۆرکەس بە چاوێکی ترس و دوورەپەرێزیەوە دەڕواننە رۆژنامەوانان. ئەوەش بە هۆی ترسناکی هەواڵنێر نییە (ئەگەرچی هێندێکجار ترسناکیشە!) بەڵکو پتر بە هۆی باوەنەبوونی پێوەندییە لەگەڵ میدیاکاندا. ئەگەریش ئاشنایی هەبێت لەگەڵ میدیاکان، رەنگە لەترسی لەدەستدانی پلەوپایە و بەرپرسایەتییەکەی، لەدانی زانیاری خۆ بپارێزێت. هێندێک کەسیش کە ئەزموونی تێکەڵاوی لەگەڵ روژنامەوانان و پرسیار و وەڵامدانەوەیان هەیە، بە ئەزموونێکی پڕ لە گێرەوکێشە و تۆزاوی هەڵیدەسەنگێنن. ترس و سکاڵاکان پتر لە راگواستن و هەڵسەنگاندنی لێدوانەکانە. هاندان و رێگا خۆشکردن بۆ ئاخافتن، ئەرکی سەرەکی روژنامەوانە لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە لەگەڵ میدیاکان ئاسوودە و دڵکراوە نین. لە کاتی وادا، پەیڤی لەسەرەخۆ و ئارام، تێکەڵاوی دۆستانە، دابینکردنی ئارامی و روونکردنەوەی مافی خەڵک بۆ زانین و ئاگاداربوونەوە، وەک شێوازێکی ئاسایی یارمەتی هەواڵنێر دەدات تا بە مەبەستی بگات. بەڵام پێویستە هەواڵنێر خۆ بپارێزێت لە بەڵێنیدان و لە ئەستۆگرتنی داواکانی وێژەر، وەک لەچاپدانی بابەتەکەی، لە کاتێکدا هەواڵنێر دەزانێت کە ئەو بڕیاردەر نییە.

زۆرجار هەوالنیر کات و مەودای نابێت لەپێشدا بۆ وتوویژ یان وەرگرتنی زانیاری لەگەڵ وێژەر و سەرچاوەکان رێککەوێت و کاتیان لێوەربگرێت و تەنانەت ئاشناش بێت، بەڵکو کت و پڕ و خێرا، پێویستی بە وتوویژ یان وەرگرتنی زانیاری دێتە ئاراوە، لە کاتی وادا رازیکردنی وێژەر و سەرچاوەکان، کۆسپی سەرەکی پێکدێنێت. هەواڵنێر بەپەلە دەگاتە شوێنی رووداوێک و شاهید و بینەرانی رووداوەکە بە شێوازی جیاواز خۆدەپارێزن لە وەڵامدانەوە و ئاشکراکردنی کێشەکە، لێرەدا پێویستە هەواڵنێریش بۆ وەرگرتنی زانیاری لە شێوازی جۆراجۆر کەڵک وەربگرێت. یەکێک لە رێگا هەرە ساکارەکان، مانەوەی پترە لە شوێنی رووداکەدا.



لە بەشێک لە کتێبی "پیاوەکانی سەرکۆمار" نووسراوەی "باب وودوارد" و "کارل بێرنشتاین"، ئەو کێشەیە باس دەکرێت. سەبارەت بە چۆنیەتی ناونووسینی "ریچارد نیکسون" لە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماری ئەمریکا، تەنیا خاتوونێکی سکرتێر ئاگاداری هەبوو و تەواوی رێگاکان بۆ پێوەندیگرتن لەگەڵیدا، داخرابوون. "بێرنشتاین" دەیزانی کە تەنیا ئەو خاتوونە دەتوانێت گرێی لێکۆڵینەوەکە بکاتەوە، چونکە ئەو ئاگاداری هەڵسوکەوتی تەواوی فەرمانبەرانی بوو. کەوابوو، "بێرنشتاین"ی هەواڵنێر، لەجێگای تەلەفۆنکردن و وەرگرتنی کات، راستەوخۆ سەردانی ماڵەوەی دەکات:

"ژنێک دەرگای کردەوە و "بێرنشتاین"ی بۆ ناو ماڵ رێنموونی کرد. لەپێشدا وای دەزانی کە ژنێکی بەساڵاچوو و قژ سپی بێت، بەڵام زۆر گەنجتر بوو، گوتی: "کەوابوو، ئێوە هەواڵنێری "واشنتۆن پۆست"ن. من هیچ لێدوانێکم بۆ ئێوە نییە. تکایە بڕۆن."

"بێرنشتاین" بۆ مانەوە لە بیانوویەک دەگەڕا. خوشکی سکرتێر کە جگەرەی دەکێشا، سەرنجی ڕاکێشا و داوای جگەرەیەکی لێکرد. بەڵام پێش ئەوەی سکرتێر بچێت بۆ لای بەستە جگەرەکە، "بێرنشتاین" چەند هەنگاوێکی هەڵیناوە بۆ لای بەستەکە و هەر لەو ماوەیە کەڵکی وەرگرت و بە سکرتێری گوت: "دیارە دەترسی، لەو فەرمانگەیە وەک ئێوە کەسانێکی زۆر هەن کە حەز دەکەن باسی راستییەکان بکەن، بەڵام زۆربەیان گوێگریان نەدۆزیوەتەوە. "بێرنشتاین" ئاگادار بوو کە چەند کەس لەو فەرمانگەیە بۆ F.B.I. لێدوانیان دابوو. درکاندنی ئەو راستییە ریسکێک بوو کە دەیتوانی یان رێگاخۆشکەر بێت، یان ئیتر تەواوی هیواکان پۆچەڵکاتەوە..."

...ئێوە، هەواڵنێران لەکوێ ئەو زانیاریانە وەدەستدێنن؟... ئەوە پرسێکە، هاوکارانی ئێمە دەخوازن تێی بگەن؟"

"بێرنشتاین" هەلێکی تازەی وەدەستهێنا. خوشکی سکرتێر پاش ئەوەی قاوەیەکی بۆخۆی تێکرد، لە ناکاو پرسیاری لە "بێرنشتاین" کرد، ئایا قاوەیەک دەخواتەوە؟ ئەو پرسیارە بیانوویەکی تازەی بە "بێرنشتاین" دا بۆ پتر مانەوە. سکرتێر سەری لەقاندەوە بە نیشانەی نەرێنی، بەڵام کار لە کار ترازا و

"بێرنشتاین" دانیشت و بەئاسپایی خەریکی خواردنەوەی قاوەکەی بوو و دڵنیا بوو کە دەرفەت بۆ گفتوگۆ دەڕەخسێت.

سەرئەنجام خاتوونی سکرتێر زمانی کرایەوە و زانیاری زۆر گرنگ و سەرەکی درکاند. تەنانەت پاشان، لەگەڵ هەر دوو هەواڵنێر، وتووێژی کرد و زۆرلە گرێ کوێرەکانی بۆ کردنەوە. تەواوی ئەو دەستکەوتانە رەنگە بە هۆی هەڵسوکەوتی گونجاوی "بێرنشتاین" وەدەستهاتبن. چونکە "بێرنشتاین" خێرا پاش هاتنەژوورەوە بە سیمایەکی ورووژاو و پڕ لە هەست بۆ وەدەستهێنانی زانیاری، پێنووس و کاغەز یان رێکوردێری بەدەستەوە نەگرت تا ئامادەیی خۆی بۆ نووسین و تۆمارکردنی لێدوانەکانی خاتوونی سکرتێر پێشانبدات.

بەهەرحاڵ، کاتێک کەسێک ئامادەی گفتوگۆ دەبێت، هەنگاوی دواتر هەڵسوکەوتی هەواڵنێرە کە فەزایەکی ئارام و هێدی بۆ وتووێژێکی گونجاو و ئازاد پێکدێنێت.

- **شێوە و شوێنی وتووێژ**

لەسەرەتادا پێویستە روون بێتەوە کە ئایا وتووێژ بەشێوەی رووبەڕوو یان بە تەلەفۆن ئەنجامدەدرێت. بۆ وێژەر هەمیشە شێوەی رووبەڕوو پەسەندترە. بەڵام لە کوێ؟ لە چێشتخانە؟ لە کاتی خواردن؟ لە ماڵی وێژەر؟ بەهەرحاڵ، وتووێژ لە هەر کوێ بێت، پێویستە وێژەر هەست بە ئارامی بکات و دڵەڕاوکێ و ترسی نەبێت تاکو چاوەڕوانی یارمەتی پتری لێبکەین.

- **خۆڕێککردن و هاوتایی**

پێویستە هەواڵنێر بەردەوام بیر لەوە بکاتەوە کە چۆن زانیاری زۆرتر و بەکەڵکتر لە وێژەر وەربگرێت. ئەوە بە مانای ئازاردان، یان ریاکاری نییە لەبەرامبەر وێژەردا، بەڵکو بەو مانایەیە کە هەواڵنێر هەڵسوکەوت و رەفتاری خۆی لەگەڵ وێژەر هەماهەنگ بکات. پەسند و گونجاویش نییە، ئەگەر چاوەڕوان بین هەواڵنێر بەردەوام رەفتار و هەڵسوکەوتی خۆی بە گوێرەی وێژەرەکان بگۆڕێت. بەڵام پەسەند و گونجاوە، ئەگەر هەواڵنێر هەمیشە ئامانجی خۆی لەپلەی یەکەم دانێت. بۆ نموونە، هەواڵنێرێک کە بۆ ئامادەکردنی گوزارش سەبارەت بە بێخانومانی سەردانی ناوچە نەدار و



بێخانومانەکان دەکات، پێویست ناکات پۆشاکی رازاوە و نوێ لەبەربکات، دیارە لایەنەکانی گفتوگۆ هەست بە ئاسودەیی ناکەن و وتووێژەکانیش خۆمانە نابن. دیارە بۆ وتووێژ لەگەڵ وەزیر و کەسانی پایەبەرز ناکرێت بە توێی کراس و پانتوڵێکی جین ئامادە بین، رەنگە مەبەستی خۆپێشاندان، یان پەیامێکی تایبەتی لێبکەوێتەوە و رەنگە ئەو هەستە کاردانەوەی هەبێت لەسەر وەرگرتنی زانیاری و بەڕێوەچوونی گونجاوی وتووێژەکە. پێویستە لە دیدار لەگەڵ کەسایەتییە فەرمییەکان بە شێوەیەکی فەرمی و لەگەڵ کەسانی ئاسایی بە شێوەیەکی خۆمانەتر، هەڵسوکەوت بکەین.

- **لە پێشدا هەڵسەنگاندن**

تو بڵێی هەواڵنێر چاوەڕوانی چ رەفتارێک دەکات لە وێژەر یان سەرچاوەی زانیارییەکەی؟ خەمساردی؟ خۆمانە؟ شۆخ و شەنگ؟ فەرمی و وشک؟ هەرچی بێت، بەتایبەت ئەگەر وێژەر پلەوپایەی بەرزی هەبێت، باشترە خۆ ئامادە بکەین. دەبێ بزانین یان ببینین کە چ لایەنێک بۆ وێژەر گرنگی هەیە، ئەو لایەنە بەرجەستە بکەینەوە. کارکردن بەو شێوەیە، ئەرکی هەواڵنێر ساکارتر دەکاتەوە. بەتایبەت ئەگەر وتووێژ لە شوێنی کار و ماڵی وێژەر ئەنجامدەدرێت، سەرنجدان بە وێنە و تابلۆ و دیمەنەکانی دەوروبەر، گوڵ و گیا و هەرچی نیشانەی زەوق و سەلیقەی وێژەرە، یارمەتیدەری هەواڵنێر دەبێت بۆ پرسیارکردن و بەرجەستەکردنیان و لە لایەکیترەوە وێژەر بۆ گفتوگۆ دەبزوێنێت. پێویستە هەواڵنێر بە شێوەیەک رەفتار بکات کە وێژەر هەست بە یارمەتی دان بۆ روونکردنەوەی پتری تەوەرەکە بکات و هەواڵنێریش بەسەرنجەوە گوێگری بێت.

- **پێکهێنانی ناوەندێکی دۆستانە**

ئەگەر هەواڵنێر کاتی هەبێت، گفتوگۆ لەگەڵ وێژەر (لەدەرەوەی تەوەرەکە) سەبارەت بە ژیان و ئەزموونەکانی وێژەر بکات، یارمەتی دەدات بۆ پێکهێنانی ناوەندێکی دۆستانە و خۆمانە. بەتایبەت ئەگەر وێژەر هێندێک شەرمن بێت یان متمانەی بە هەواڵنێر نەبێت و دیارە ئەگەر بۆ دەردەدڵ کردنیش کاتی هەبێت.

بۆ دەستپێکردن بە لێدوانی خۆمانە، شێوازی جۆراجۆر هەیە. بۆ نموونە پرسیار کردن سەبارەت بە شوێنی لەدایکبوون، شوێنی گەورەبوون، یەکەم ئەزموونی کاری، فێرگە و زانکۆ، دەستکەوتەکان، شکستەکان، گەشتەکان و هتد. ئەگەر وێژەر بەزەوقەوە لە وتوویژەکە بەردەوام بێت، دەکرێ ئەو لێدوانە بەپێچەوانەوە بەڕێوەبچێت. واتە، هەواڵنێر باسی ئەو لایەنانەی ژیانی خۆی بکات. بە شێوەیەکی ئاسایی، زۆر کەس هەن، لەبەرامبەر کەسانێک کە سەرنجدەدەنە لایەنەکانی ژیانیان، هەست بە نزیکی و دۆستایەتی دەکەن. بەڵام نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە هێندێک کەس زۆر هەستیارن سەبارەت بە سەرنجدانی کەسانیتر بە ژیانیان هەروەها باسکردنی ژیانی تایبەتی کەسانیتر، پێویستی بە هەلومەرجی گونجاو هەیە و بە یارمەتی ئەزموونی رۆژنامەوان، ئەو هەلومەرجە وەدەستدێت.

• **متمانە**

هەواڵنێر پێش دەسبەکاربوونی جیددی، باشترە فەزا و هەلومەرج بۆ کارەکەی پێکبێنێت. یەکێک لەو رەفتار و هەڵسوکەوتانەی هەواڵنێر کە وێژەر و سەرچاوە بێزار دەکات و گیروگرفت پێکدێنێت، دەرهێنانی خێرای پێنووس و کاغەز یان ریکۆردێرە، واتە پەلەکردن و خۆ بە کارا پێشاندانی هەواڵنێرە. یانی من ئامادەم وشەبەوشەی لێدوان و رەفتارەکانت یاداشت بکەم.

لەسەرەتادا پێویستە لەگەڵ وێژەر ئاشنا بین، وێژەر هەست بە ئارامی بکات، فەزایەکی متمانە و هەڵسەنگاندن پێکبێت و پاشان تەنانەت بە وەرگرتنی ئیزن لە وێژەر، هێدی و ئارام پێنووس و دەفتەر ئامادە بکەین بە شێوەیەک کە گوایە ئەوە کاری رۆژانە و ئاسایی هەر هەواڵنێرێکە، جا ئەوکات دەست بە نووسین بکەین. زۆرجار بەکار هێنانی هێندێک لەو لێدوانانە پێش دەست بەنووسینکردن پێویستە:

"ببوورن، پرسە گرنگەکان لەیادم نامێنن". "پێتان چۆنە بۆ پێشگرتن لە هەڵە، وتەکانتان یادداشت بکەم؟"، "چونکە پێویستیم بە وتوویژیتر هەیە، باشترە یاداشتی بکەم."



• **رکوڕاست بوون**

هەواڵنێر پێویستە هەمیشە پێناسەی خۆی ئاشکرا بکات(مەگەر لە کاتی زۆر دەگمەندا نەبێت). هەروەها هەمیشە مەبەستی راستەقینەی خۆی لە وتوویژ و وەدەستهێنانی زانیاری، بەڕاشکاوی رابگەیێنیت. لەهەمان کاتدا، پێویست ناکات سەبارەت بە تەواوی وردەکاری و لایەنە گرنگەکانی کاری خۆی، وێژەر ئاگادار بکاتەوە. ئەگەر هەواڵنێر مەبەستی لێکۆڵینەوە لە تەوەر و بابەتێکی گرنگ و سەرنجڕاکێشە، باشترە لە کاتی ئامادەکردن و کۆکردنەوەی زانیاری، وێژەر و لایەنە پەیوەندیدارەکان بە تەوەرەکە، ئاگادار نەکات و تەنیا بڵێ: "من سەرقاڵی ئامادەکردنی هێندیک زانیاریم سەبارەت بەو کێشەیە." ئەو روونکردنەوەیە، هەواڵ یان زانیارییەکە لە تایبەتبوون تەنیا بەو کەسەوە دووردەکاتەوە.

• **راگرتنی پرسیاری سەرەکی**

پێویستە هەواڵنێر فێربێت کە تەوەر یان پرسیاری سەرەکی وتوویژ، لە دەستپێکی وتوویژەکەدا نەگونجێنێت. باشترە بە پرسیاری گشتی و سەرەتایی، واتە بەو پرسیارانە کە هەواڵنیر دڵنیایە لە وەڵامدانەوەی وێژەر، وتوویژەکە دەسپێبکات. ئەگەرچی ئەو پرسیارانە کاردانەوەیەکی ئەوتۆیان لە رەوتی هەواڵ یان گوزارشدا نابێت، بەڵام یەک تایبەتمەندی گشتییان هەیە:

هەواڵنێر، سنووری راستگۆیی و راشکاوی وێژەر هەڵدەسەنگێنێت. تەنیا پاش ئاراستەکردنی ئەو پرسیارە سەرەتایانە، هەواڵنێر دەتوانیت سەبارەت بە مەبەستی سەرەکی وتوویژەکە، پرسیار ئاراستەی وێژەر بکات. تەنانەت لەو کاتەشدا نابێت هەواڵنێر خۆی خافڵگیر پێشانبدات. مات و سەرسوڕمان لەبەرامبەر وتەکانی وێژەر و یان گوتنی: "بەڕاستی؟"، دوورە لە کردەوەی پسپۆڕانەی رۆژنامەوانی. هێندیکجار، ئامادەکردنی گوزارش و هەواڵ بەڕاستی پەیوەندی هەیە بە ئاراستەکردنی پرسیاری سەرەکی لە شوێنی پێویست و زاڵبوونی هەواڵنێر بەسەر هەست و هەڵسوکەوتی خۆیدا.

• **شێوازی دواخستن**

ئەگەر وێژەر لە تەواو وەڵامدانەوەی پرسیارەکان خۆی بدزێتەوە، پێویستە لە شێوازی دواخستن کەڵک وەربگرین. ئەو شێوازە، پێوەندی بە چاوەڕوانی و پشوو هەیە. لەوانەیە وێژەر لە وەڵامی پرسیارەکاندا زانیاری بێکەڵک و زیاد باسبکات. دیارە سنووربوونی کات بۆ درێژەدان بە وتوویژ، گرنگە، بەڵام هێندێک لەسەرەخۆبوون، تووڕەنەبوون و چاوەڕوانی کردن کاتی پێویست بۆ ئاڕاستەکردنی پرسیاری سەرەکی، یارمەتی هەواڵنێر دەدەن بۆ ئامادەکردنی هەواڵ یان گوزارشێکی شایستە.

• **بزواندنی هەستی هاودەردی**

بزواندنی هەستی هاودەردی وێژەر، کردەوەیەکی ناپسپۆڕانەی ڕۆژنامەوانییە. ئەو کردەوەیە، روخسار و شوێنگەی ڕۆژنامەوانی دەروشێنێت و کەسایەتی ڕۆژنامەوان خەوشدار دەکات. بەڵام لە کاتێکدا هەواڵنێر لە هەموو ڕێوشوێنەکان کەڵکی وەرگرت و سەرنەکەوت و تەنانەت، بابەت و تەوەرەکەش زۆر گرنگ بێت، دەتوانێت ناوەندێکی هەستیاری و هاودەردی لەگەڵ وێژەر پێکبێنێت و بڵێ: "ئەگەر ئەو زانیاریانە ئامادە نەکەم، لەسەر کار، دوچاری تەنگژە دەبم."

هەواڵنێر دەتوانێت داوای یارمەتی لە وێژەر بکات و گرنگی زانیاری بۆ میدیاکان روون بکاتەوە. زۆرجار ئەو شێوازە کاردانەوەی باشی دەبێت.

• **پێداگرتن لەسەر پرسیارەکان و دووپاتکردنەوەیان**

پرسیارەکان پێویستیان بە پێداگرتن هەیە. رووبەڕووبوونەوەی هەواڵنێر لەگەڵ وتەی: "بۆچوونێکم نییە"، نابێ ببێتە هۆی دەسهەڵگرتنی هەواڵنێر لە پرسیارەکەی. دیارە ئەو وەڵامە پێوەندی بە گیروگرفتەکانی وێژەر لە شوێنی کاریدا، یان هۆی تایبەتی هەیە کە بۆ چارەسەرکردنی هەواڵنێر ناتوانی هیچ کارێک بکات. کەوابوو لەبری کۆشش بۆ دڵنیاییدان بە وێژەر، هەواڵنێر باشترە درێژە بە گفتوگۆ بدات و پرسیاریتر ئاراستەی وێژەر بکات و هاوکات بیر لە شێوازیتر بکاتەوە بۆ وەرگرتنی وەڵامی ئەو پرسیارە و وا پێشانبدات کە وەڵام نەدانەوەی وێژەر، زۆر گرنگ نییە، چونکە کەسانێک هەن



کە وەڵامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە یان دەیدەنەوە. دواتر دەکرێ بە گوتنی: "پرسێک کە مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە... (ناوەڕۆکی پرسیارەکە بە شێوەی گوماناوی باسدەکەین)"، یان: "دەکرێ بپرسم کە ئایا راستە کە ..."، شێوازی دروستی کێشاندنی وێژەر بۆ وەڵامدانەوە بدۆزینەوە.

• **وێژەری تورە و توند**

بۆ وتوویژ لەگەڵ وێژەری تورە و توند، دەکرێ شێوەکانی وتوویژ لەگەڵ ئەو کەسانەی بەویست وەڵام نادەنەوە و دژبەرایەتی دەکەن، بەکار بێنین. بەڵام دەکرێ بۆ ئەو دەستە وێژەرانە لەم شێوانەی خوارەوە کەڵک وەربگرین:

- پێداگرتن:

هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسانی تورە و توند زۆر دژوارە، بەڵام نابێت لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا خۆبەدەستەوە بدەین. پێویستە بەردەوام بە تەلەفۆن پەیوەندییان پێوە بکەین یان سەردانی شوێنی کاریان بکەین تا دڵنیایان بکەین کە تەنیا چارەیان ئامادەبوونە بۆ وتوویژ و وەڵامدانەوەی پرسیارەکان.

• بەڵێنی نادیار

ئەگەر لەگەڵ ئەو کەسانەی تەنیا لە ڕێگای تەلەفۆنەوە پەیوەندیمان هەیە، دڵنیا بن کە بەڵێنی: "پێوەندیتان پێوە دەکەم" بێهودە و بێمانایە. نابێت دڵمان بەو بەڵێنییە نادیارانە خۆش بێت. شێوەی دروست ئەوەیە کە بڵێین: "من لەپشت تەلەفۆن هەر چاوەڕوان دەبم"، یان "کەوابوو، خۆم دووبارە تەلەفۆن دەکەمەوە"، یان کاتێک بۆ تەلەفۆن کردنی وێژەر دیاریدەکەین و دەڵێین: " ئەگەر تا کاتژمێر... تەلەفۆنتان نەکرد، خۆم پێوەندیتان لەگەڵ دەگرم." بەهەرحاڵ، بۆ هەواڵنێر دووبارە تەلەفۆن کردنەوە، زۆر شیاوترە لە چاوەڕوانی کردن.

## کەرەسەکانی وتووێژ

دیارە پێوەندی و پێوەندیگرتن چەمکێکی هەمەلایەنە و بەربڵاوە. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی چەمکی هەمەلایەنەش، بریتییە لە کاردانەوەی پێکهاتەکانی لەسەر یەکتر. کەوابوو، کەرەسەکانی تۆمارکردن (ریکۆردێر)، یاداشت هەڵگرتن (پێنووس و کاغەز)، وێنەگرتن (کامێرا)و... (کەرەسەکانی کاری هەواڵنێر بۆ وتووێژ)، پێکهاتەکانی چەمکی هەمەلایەنەی پێوەندی و پێوەندیگرتن پێکدێنن و ئەو کەرەسانە هەم کاردانەوەیان هەیە لەسەر پێکهاتەکانیتری ئەو چەمکە و هەم خۆیان دەکەونە ژێر کاردانەوەی ئەو پێکهاتانە. دیارە ئەو پێکهاتانە تەنیا ئامراز و کەرەسەن، بەڵام هەڵگرتنی ئەو تایبەتمەندییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەکرێت لە هەموو کاتێکدا بەراشکاوی بڕیار بدەین بۆ پێویست بوون یان پێویست نەبوونی ئەو کەرەسانە.

بۆ روونکردنەوەی ئەو کێشەیە، پێویست دەکات ئاماژە بە هێندێک تێبینی بکەین کە تایبەتن بە وتووێژکردن بۆ میدیا نووسیارییەکان:

١- رەنگە وێژەر بەگوێرەی بیرکردنەوەی تایبەتی خۆی، تەنیا کەسێک بە هەواڵنێر هەڵسەنگێنێت کە لە کاتی وتووێژدا: دەنگ تۆمار بکات و هێندێکجار یادداشت هەڵبگرێت و لە کاتی پێویستدا، خۆی یان وێنەگرێک، وێنە بگرێت.

٢- لێرەدا ئەگەر هەواڵنێرێک بە هەر هۆیەکەوە، بۆ نموونە کەڵک لە ریکۆردێر وەرنەگرێت و وێژەر لەبەرامبەر خۆیدا کەرەسەی تۆمارکردنی دەنگ نەبینێت، لەوانەیە هەواڵنێر بەبێئەزموون هەڵسەنگێنێت و هاوکاری پێویستی لەگەڵ نەکات.



٣- وەکو لەپێشدا ئاماژەمان پێکرد، لەوانەشە بەکارهێنانی ریکۆردێر ببێتە هۆی گۆڕانی فەزای وتووێژەکە و پێکهاتنی ناوەندێکی وشک و فەرمی لە نێوان وێژەر و هەواڵنێردا و تەنانەت ببێتە هۆی خۆسانسۆرکردنی وێژەر.

٤- رەنگە هەواڵنێر لە هەلومەرجی نالەباردا ناچار بێت کەرەسەکانی کاری خۆی بشارێتەوە و تەنانەت لە نووسینیش خۆی بپارێزێت.

٥- رەنگە هەواڵنێر لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا لەگەڵ وێژەر دیدار بکات و تەنانەت مەودا و رێگا نەدرێت بۆ هەڵگرتنی کەرەسەکانی وتووێژ.

٦- پشتبەستنی تەنیا بە رێکوردێر، رەنگە بڵاوکردنەوەی وتووێژێکی خێرا، وەدوابخات. پشتبەستنی تەواو بە ریکۆردێر، پێویستی بە کات هەیە بۆ پیادەکردن و دووبارە گوێ لێگرتن و رێکوپێک کردن. کەوابوو، کاردانەوەی نەرێنی هەیە لەسەر خێرایی کار.

٧- زۆرجار دیتراوە کە پاش ئەنجامدانی وتووێژ، وێژەر بە هۆیەک لە هۆیەکان لەبەشێک لە وتەکانی خۆی پاشگەز دەبێتەوە. ریکۆردێر، تەنیا ئامرازێکە کە بە فریای هەواڵنێر دەگات و لە گێرەوکێشەکانی دواتر رزگاری دەکات.

٨- بەکارهێنانی ریکۆردێر دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی سەرنجی هەواڵنێر لەسەر پێنووس و کاغەز و یاداشت هەڵگر، کەوابوو پێوەندی رووخساری لە نێوان دوو لایەنی وتووێژدا زیاتر دەکات.

٩- لەهێندێک لە وڵاتاندا، جیاوازی هەیە لە نێوان هەواڵنێری وێنەگر و هەواڵنێردا و بەکارهێنانی کامێرا بۆ وێنەگرتن لە لایەن وتووێژکار یان راپۆرتکارەوە، وەک چەواشەکاری سەیردەکرێت.

بەهەرحاڵ وەک ئاماژەمان پێکرد، لەهێندێک کاتدا بۆ ئامادەکردنی وتووێژ، سوود لە کەرەسەیەک وەردەگرین کە لە هێندێک کاتیتردا لەوانەیە پێویست نەبێت و کاردانەوەی نەرێنی هەبێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەکرێ بڵێین:

- بۆ هەر وتووێژێک، پێویستە پێنووس و کاغەز لەگەڵ خۆمان هەڵگرین، بەڵام بەکارهێنانی هەمیشە پێویست ناکات.

- هەڵگرتنی ریکۆردێر، بەتایبەت لەچەشنی بچووک(ئێستا ریکۆردیری دیجیتاڵ پەیدا بووە کە هەم بچووکە و هەم ماوەی تۆمارکردنی یەکجار زۆرە و پێویست بە کاسێت ناکات) دەتوانێت لە کاتی پێویستدا یارمەتی هەواڵنێر بدات، بەڵام نە هەمیشە و نە بۆ هەر وتووێژێک.

• **تێبینی:** ئەگەر بەهەر هۆیەک ناچاربین کەڵک لە ریکۆردەر وەربگرین، پێویستە ئەو تێبینییانە لەپێشچاو بگرین:

١- پێش بەکارهێنانی ریکۆردێر، بە شێوەیەکی پەسەند و لەسەرەخۆ، هۆی بەکارهێنانی ریکۆردێر بۆ وێژەر روون دەکەینەوە. بۆ نموونە دەڵێن: " چونکە پێم خۆشە بەتەواوی سەرنج بدەمە وتەکانی ئێوە، رێگام بدەن، لە ریکوردێر کەڵک وەربگرم، "یان " بەکارهێنانی ریکوردێر دەبێتە هۆی بەشداری زۆرتری من لە گفتوگۆ لەگەڵ ئێوەدا و وتووێژەکە زیندووتر دەکات." و یان ....

٢- لە کاتی بەکار هێنانی ریکۆردێر، لەپێشدا دڵنیا بن لە هێزی باتری ئامرازەکە و لە کاتی وتووێژدا، پێش تەواوبوونی کاسێت(لە ریکۆردێری دیجیتالی تووشی ئەو کێشەیە نابین) و لە کاتێکی گونجاودا، کاسێتەکە بگۆرن.

٣- کامێرای وێنەگرتن یەکێک لە کەرەسەکانی وتووێژە و پێویستە هەواڵنێر هەمیشە هەڵیگرێت. هەواڵنێر پێویستە بۆ ئەو کەرسانە جانتایەکی هەبێت تا هەمیشە لەکاتی پێویستدا بتوانێت کەڵکیان لێوەربگرێت.

دیارە هێندێکجاریش پێویست ناکات ئەو جانتایەی بکاتەوە و کەڵک لە کەرەسەکانی وەربگرێت.



## رێکوپێک کردنی وتووێژ

هەر وەک هەواڵ، رێکوپێک کردنی بابەتەکان لە وتووێژیشدا، یەکێک لە قۆناغە گرنگەکانی کاری رۆژنامەوانییە. نووسین و رێکوپێک کردنی ئەو زانیاریانەی کە بەشێوەی پرسیار و وەڵام لە وتووێژدا رەنگدەدەنەوە، هونەری تایبەتی پیشەی روژنامەوانی پێکدێنێت. ئەو زانیاریانەی کە لە وتووێژدا دەیبیسین، لە قۆناغی نووسیندا پێویستە دووبارەی کەینەوە و بەشە گرنگ و بەنرخەکانی بەرجەستە کەینەوە.

نووسین و رێکوپێک کردنی وتووێژەکان بە گوێرەی چەشنیان، جیاوازیان هەیە کە لێرەدا ئاماژەیان پێدەکەین:

أ- وتووێژی خێرا سەبارەت بە رووداوی رۆژانە کە لەگەڵ خەڵکی ناو کۆڵان و بازارەکاندا ئەنجامدەدرێت و ئامانجی بەرجەستەکردنی را و بۆچوونی خەڵکە، پێویستی بەو پێکهاتانە هەیە:

١- پێویستە سەرەتایەک سەبارەت بە تەوەری وتوویژ کە رووداوەکانی رۆژانەیە، ئامادە بکەین، هەروەها ئاماژەیەکیش بدەین بە هۆی هەڵبژاردنی تەوەرەکە وەک بابەتی رۆژانە.

ئەو پێشەکییە نابێت لە حەوت یان هەشت دێر زیاتر بێت.

٢- پاش پێشەکی، وتوویژ وەک کورتە هەواڵ بە هۆی ئەستێرە یان خاڵی رەش جیادەکرێتەوە.

٣- پاش ئەستێرە یان خاڵی رەش، ئاماژە بە ناو، پاشناو، پیشە و ئەدرێسی وێژەر دەکەین.

٤- لەو شێوە وتووێژەدا، تەنیا یەک پرسیار ئاراستە دەکرێت.

٥- ژمارەی وتووێژی خێرا، نابێت زۆر بێت و لە یەک هەواڵدا بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەگەر وتووێژەکان لە دە زۆرتر بێت، خوێنەر بێزار دەکات.

٦- پێویستە پەیڤی ویژەرەکان بەتەواوی و بێ‌لێکدانەوە، بنووسرێت.

٧- ویژەرەکان بە شێوەیەک هەڵبژێرین کە لە باری پێگەی کۆمەڵایەتی، تەمەن و رەگەز، جیاوازیان هەبێت تا وەک نوێنەری دەستە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی، ئاماژەیان پێبکەین.

٨- وەڵامی ویژەر کورت بکرێتەوە. ناوەرۆک و کاکڵی بیر و بۆچوونەکان بنووسرێت و وتە پەراوێزەکان چاوپۆشی لێبکرێت.

٩- ناساندنی ویژەرەکان و نووسینی وەڵامەکانیان لە هەموو وتووێژە پێویستەکان بۆ یەک هەواڵ، دەبێت بە یەک شێوە بنووسرێت.

ب- بۆ وتووێژە ئاساییەکان کە لە رۆژنامەکاندا لەچاپ دەدرێن، پێویستە پێش هەرشتێک، پێشەکی و تەوەر و هۆی وتووێژ، روون بکرێتەوە. پاش ئەو پێشەکییە، پرسیار و وەڵامەکان دەنوسرێن.

**● رێکوپێک کردنی وتووێژ بە شێوەی هەرەمی بەرئاوەژوو:**

رێکوپێکی پرسیار و وەڵامەکان و پلەبەندی کردنیان بەگوێرەی تەوەر و ناوەرۆکەوە، سەرنجی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی وتووێژ پتر دەکات. هێندێک لە پرسیارەکان لەوانەیە لە توێی وتووێژدا و لە سەرەتادا هاتبێت، بەڵام لە کاتی رێکوپێک کردن بە هۆی کەم گرنگبوونیان دەکرێت لە کۆتاییدا بنووسرێن. وەک شێوەیەکی گشتی بە گوێرەی شێوازی هەرەمی بەرئاوەژوو، پرسیار و وەڵامەکانی هەڵگری تەوەری گرنگ و سەرنجراکێش، لە سەرەتا و پرسیار و وەڵامەکانی پلەنزمتر لە ژێرەوەی دەقی وتووێژەدا ئاماژەی پێدەکرێت. پرسی جێبەجێکردنی شوێنی پرسیار و وەڵامەکان، لە سەر خوێنەران کاردانەوەی گرنگییان هەیە. ئەگەر هەواڵنێر بەهەمان شێوە کە وتووێژەکەی ئەنجامداوە بیخاتە بەر دەستی خوێنەر، بەدەگمەن دەتوانێت سەرنجی خوێنەران بۆ لای خۆی رابکێشێت. لە فێرگەکانی رۆژنامەوانی باوە: "ئەگەر ریکۆردێر وتووێژکارێکی باش بووایە، ئیتر پێوستی بە رۆژنامەوان نەدەما."



**● رێکوپێک کردنی وتووێژ بە شێوەی راپۆرت:**

رەنگە هێندێکجار پرسیار و وەڵامەکانی وتووێژێک بە شێوەیەکی تێکەڵاو و بە شێوازی نووسینی راپۆرتەکانی لێکۆڵینەوە، رێکوپێک بکەین و لەنێوان یان هاوشانی پرسیار و وەڵامەکان، ئاماژە بە دیمەنەکانی وتووێژ و رەنگدانەوەی پرسیارەکان، یان هەڵسوکەوتی ویژەر بکەین. رێکوپێک کردنی وتووێژ بەو شێوەیە، سەرنجراکێش دەبێت و هاوکات بابەتە زانستییە گرنگەکان بە شێوازێکی حەکایەت بۆ خوێنەر پوختە دەکرێن.

**● رێکوپێک کردنی وتووێژ بە شێوەی مێژوویی:**

شێوەی مێژوویی بۆ رێکوپێک کردنی وتووێژ، یەکێکە لە شێوە هەرە ساکارەکان کە تا ئێستاش لە زۆربەی چاپەمەنییەکاندا، پەیرەو دەکرێت. کەڵکوەرگرتن لەو شێوەیە تەنیا لەکاتێکدا شایستەیە کە وتووێژەکە کورت و گشتی و سەرنجراکێش بێت، ئەگینا کەموکورییەکانی شێوەی مێژوویی خۆ نیشاندەدەن.

بەگشتی، نووسین و رێکوپێک کردنی وتووێژ، تا رادەیەکی زۆر پێوەندی بە تەوەری وتووێژ و زەوقی داهێنەرانەی رۆژنامەوانەوە هەیە. ئەوە رۆژنامەوانە کە بەگوێرەی سروشتی خوێنەرانی میدیاکەی، بابەتەکانی خۆی رێکوپێک دەکات. ئەگەر خوێنەرانی بڵاوکراوەکە بریتین لە چینە ئاساییەکانی خەڵک، ئەوسا رێکوپێک کردنی وتووێژ باشترە بە شێوەی هەرەمی بەرئاوژوو بێت. بەڵام ئەگەر خوێنەران، چینی روونـاکبیر و خوێندەواری کۆمەڵگابن، تەنانەت شێوەی مێژووییش دەتوانێت سەرنجراکێش بێت و بەهەرحاڵ، ئامادەکردنی وتووێژ بە شێوەی راپۆرت، دەتوانێت جێگای رەزامەندی هەمووکەس بێت.

**دەسپێکی سەرنجراکێش و کۆتایی زێرین!**

**● دەسپێکی سەرنجراکێش:**

پرسیاری یەکەم لە زۆربەی وتووێژەکاندا، بۆ خوێنەر وەک پرسیاری کۆتاییە. هێندێکجار دەسپێکی وتووێژ ئەوەندە وشک، بێمانا و لاساییکەرەوەیە

کە خوێنەر واز لە خوێندنەوەی دێنێت. ئاگادار بن کە وتوویژیش وەک لایەنەکانیتری میدیایی(هەواڵ، راپۆرت، وتار) پێویستی بە دەسپێکی سەرنجڕاکێش و سەرکەوتوو هەیە.

پرسیاری وەک:

- تکایە لەسەرەتادا خۆتان بە خوێنەران بناسێنن؟

پرسیارێکی لاسەکەرەوانەیە و سەرنجڕاکێش نییە و تەنیا کەسانی ساکار وەک دەسپێکی وتوویژ کەڵکی لێوەردەگرن. ئەو چەشنە پرسیارانە وێرانکردنی وتوویژە. هەواڵنێر لە ڕێگای یەکەم پرسیارەوە، بەشێوەیەک لە شێوەکان خوێنەر تێکەڵاوی تەوەرەی وتوویژ دەکات.

بۆ نموونە، لە وتوویژ لەگەڵ کەسایەتییەکی زانستی کە ئیتر لە ناوەندێکی خۆمانە و بێلایەنانەدا ئەنجام دەدرێت، دەیان پرسیار بۆ دەسپێک دێتە ئاراوە، وەک:

- تکایە لەسەرەتادا خۆتان بە خوێنەران بناسێنن؟
- تکایە باسی تەمەن و ڕادەی خوێندەواری و ... خۆتان بکەن؟
- تکایە لە بەرهەمە زانستییەکانی خۆتانەوە دەسپێبکەن؟

ئەوانە هەمان پرسیاری لاسایی کەرەوە و کلێشەیی و دوور لە کردەوەی ڕۆژنامەوانین، دەسپێکێکی لاواز و ئازاردەر. هەر لەم بارەوە سەرنج بدەنە یەکەم پرسیاری گۆڤاری "ئێرانی جەوان" لە پرۆفیسۆرێکی یونانی(پاش پێشەکییەکی کورت بۆ ناساندنی وێژەر):

هەواڵنێر: لە کوێوە دەسپێبکەین؟

یان:

یەکەم پرسیار لە محەمەد خاتەمی لە گەرمەی هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماری ئێران لە ساڵی ٢٠٠٦دا:

هەواڵنێر: ئێوە لەناو ڕووناکبیراندا زۆرتر ناسراون تاکو لای خەڵکی ئاسایی، ئەوە جێگای شانازییە یان کەموکۆڕییە؟

یەکەم پرسیار لە "تەهمینە میلانی"(دەرهێنەری فیلمی "ئیتر چ خەبەر؟)



هەواڵنێر: خاتوو میلانی، ئیتر چ خەبەر؟

ئایا ئێوە دەخوازن وەک خوێنەر، وەڵامی ئەو پرسیارانە لە زمانی وێژەرەوە ببیسن؟ بەڕاشکاوی وەڵام نەرێنیە!

- **کۆتایی زێڕین:**

چەندە دەسپێکی وتوویژ پێویستە سەرنجڕاکێش و هێندێکجاریش چاوەڕوان نەکراو بێت، ئەوەندەش پێویستە کۆتایی وتوویژ لە بیر و زەینی خوێنەردا جێگا بگرێت و ڕەنگبداتەوە.

بەو مەبەستە، پێویستە لە سەرەتادا، هەواڵنێر پێش ئەنجامدانی وتوویژ، وەک دەرهێنەرێکی سینەما بۆ تەواوی بەشەکانی وتوویژ، بەرنامەیەکی ورد دابڕێژێت. بۆ هێندێک لە پرسیارەکانی خۆی، وەڵامی گریمانی وێژەر هەڵسەنگێنێت و خۆی بۆ پاش پرسیارە پێویستەکان ئامادە بکات. بەڵام لە هەمان کاتدا بۆ کۆتایی زێڕین و لەیاد مانەوەی وتوویژ، پرسیارگەڵێک لە هەنبانەکەیدا ئامادە بکات تا ئەگەر وتوویژەکە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بەڕێوە چوو، بێیەکودوو، پرسیاری کۆتایی ئاراستەی وێژەر بکات. سەرنج بدەنە پرسیاری کۆتایی وتوویژێک لەگەڵ "توتو" هونەرمەند و کۆمێدیەنی بەناوبانگی ئیتالیایی:

هەواڵنێر: پرسیاری کۆتایی، ئێوە خۆتان، ((توتو))تان پێخۆشە؟

## خاڵەگرنگەکان لە وتووێژدا

**● ١٢ خاڵی گرنگ و سەرەکی**

ئەو ١٢ خاڵەی لێرەدا باسی دەکەین، بەرواڵەت کۆمەڵە پرسێکن کە زۆر گرنگ نین، بەڵام گرنگی خۆیان هەیە. رەنگە ئێمە وتووێژکارێکی باش و کارزان بین و بە تەکنیکەکانی وتووێژ ئاشنا، بەڵام لەڕووی کەمتەرخەمی و زۆر بەئاسایی، بە هۆی سەرنجنەدان بەو پرسە لاوەکییانە، تووشی زیان ببین. ئەو خاڵانە بۆ کەسانی تازەکار، وانەیە و بۆ کەسانێک کە سەرقاڵی وتووێژن، وەبیرهێنانەوەیە.

١- پێش دەسپێکردن بە وتووێژ، پێویستە لە کارکردنی ریکۆردێر دڵنیا بن.

٢- بۆ هەر وتووێژێک لە پاتری نوێ کەڵک وەربگرن، پاترییە کۆنەکانیش بۆ گوێگرتن و پیادەکردن تەرخانبکەن.

٣- پێش دەسپێکردن بە وتووێژ، چۆنیەتی دەنگ تاووتوێ بکەن و کاسێتی ستاندارد بەکار بێنن. بۆ وتووێژی گرنگ و مێژوویی، کاسێتی نوێ بەکار بێنن.

٤- مەودای نێوان وێژەر و شوێنی ریکۆردێر، پێوەندی هەیە بە رادەی هەستیاری ئامرازی تۆمارکردن، ئەگەر ئەو مەودایە زۆر بێت، دەنگ لاواز تۆمار دەکات و کاتی پیادەکردن تووشی کێشە دەبن.

٥- هەمیشە پێنووسی زیادە لەگەڵ خۆتان هەڵگرن، هەروەها کاغەز لەبیر مەکەن. داواکردنی پێنووس و کاغەز لە وێژەر، رەنگدانەوەیەکی جوانی نابێت.



٦- کۆشش بکەن ئێوە دیمەنی وتووێژ دیاریبکەن. هێندێک وێژەر، بەتایبەت بەرپرسان، لە پشت مێزی کارەوە وتووێژ دەکەن. کەوابوو، هەواڵنێر شوێنی داواکار دەگرێت، کە دیمەنێکی پەسەند نییە. پێویستە بەرێزەوە داوا لە وێژەر بکەن تا لە شوێنێکی خۆمانەتر، بۆ نموونە لە بەرامبەرتان دانیشێت. هەوڵبدەن لە شوێنێک دانیشن کە بەسەر وێژەردا باڵادەست بن.

٧- خێرا و لە یەکەم دەرفەتدا کاسێتی تۆمارکراو پیادە بکەن، سوودی ئەو کارە بریتییە لە:

- ئەگەر دەنگ لاواز تۆمارکرابێت، زۆر پرسی گرنگ هەن لەبیرتان دەمێننەوە. بەڵام ئەگەر چەند رۆژی بەسەردا بچێت، رەنگە لەبیر بچنەوە.
- ئەگەر ئاڵۆزی لە وەڵامەکاندا هەبێت، یان کەموکووڕی لە پرسیارەکاندا دەرکەوێت کە لەکاتی وتووێژ لەبیرکراون، دەکرێ خێرا لەرێگای تەلەفۆن، یان چاوپێکەوتنێکی کورتەوە، کەموکوورییەکان راست بکرێنەوە.
- ئەگەر ئامادەکردن و رێکوپێک کردنی وتووێژەکە بەشێوەی راپۆرت و ئاماژەکردن بە وردەکارییەکانی شوێنی وتووێژ بێت، ئەوسا باشتر دەتوانن بۆ زیندەکردنەوە و نووسینیان، یارمەتی لە بیرتان وەربگرن.

٨- لەکاتی گفتوگۆ و وتووێژدا، تەنانەت لەگەڵ کەسایەتییە پایەبەرزەکانیشدا، پێویستە هەواڵنێر لە پێگەی داوەر و داواکاری گشتی هەڵسوکەوت بکات. کەوابوو، پێویستە بەخۆڕاگری و بەلەسەرەخۆیی، بەڵام بەتواناوە، وتووێژ ئەنجام بدات.

٩- لەپێشچاوگرتنی ئەدەب و نەزاکەت، تایبەتمەندی وتووێژکاری لێهاتووە، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ دوژمنیش وتووێژ بکەیت.

١٠- وتووێژکار دەبێت رووخۆش بێت، واتە بتوانێت ناوەند و فەزایەکی پەسەند و دڵکەش بۆ وتووێژ و گفتوگۆ ئامادە بکات، دیارە بە ریاییکردن و زمانلووسی نا.

١١- پێویستە وتووێژکار رووخسارێکی ئاراستە و رێکوپێکی هەبێت. دڵنیا بن بەو شێوەیە، لەسەر وێژەر کاردانەوەی پەسەندترتان دەبێت.

١٢- رۆژنامەوان و وتووێژکاری لێهاتوو، پێویستە نووسەرێکی بەتوانا و خاوەن زەین و خەیاڵێکی بەهێز بێت. کەوابوو، خوێندنەوە و نووسین، ئەرکی بەردەوامی هەواڵنێرە. بەو شێوەیە هەواڵنێر هەوڵدەدات بۆ بەهێزکردنی نووسراوەکانی و لەهەمان کاتدا توانای وەسف و خەیاڵی بۆ وتووێژە وەسفی و وێنەییەکان، کاراتر دەکات.